# چاکسازی ئیسلامی هاوچەرخ

## خوێندنەوەیەکی پرۆگرامییانەی کۆمەڵایەتی


پ.د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان

وەرگێڕانی: د. فوئاد عەلی جەلال





لە بڵاوکراوەکانی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥١)


چاکسازی ئیسلامی هاوچەرخ   پ.د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان



**ئەم کتێبە:**

باسی هەندێک لەو دۆزە گرنگانە دەکات کە دەبنە بناغەی چاکسازی ئیسلامیی مرۆیی، کە ئوممەت لەو ڕێگەیەوە دەتوانێت پێگەی ژیری و بیرکردنەوەی پرۆگرامیانەی خۆی بدۆزێتەوە و بەکاریان بێنێ لە هێنانەدی مەبەستەکانی شەریعەت و دووبارە بونیادنانەوەی پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن، بۆ هێنانەدی ڕەسەنایەتی ئیسلامییانەی هاوچەرخ، هەروەها دووبارە خوێندنەوەیەکی نموونەیی پێشکەش دەکات بۆ سیستمە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی پرۆگرامییانە، ئەو شێواوی و شێواندنە لادەبات کە تووشی هاتووە، بەمەش نمونەیەکی باشی ڕەسەنایەتی هاوچەرخ بەرجەستە دەکات، هەروەها یاساکانی گفتوگۆ و دایەلۆگ و پەیوەندییەکان دەخاتەڕوو، کە مەبەستە مرۆییە کامڵەکانی پێ دێتەدی بۆ جیهانێک کە گیانی برایەتی و دادپەروەری و ئاشتی باڵی بەسەردا بکێشێت.

هەروەها ئەم پەرتووکە ئەزموونی زانکۆی ئیسلامی جیهانی لە مالیزیا دەخاتە بەردەست خوێنەری بەڕێز، لەگەڵ ئەو چاکسازییە پرۆگرامییانەی پێشکەشی کردووە، کە پێشتر بوونی نەبووە لە بیری پەروەردەیی و فێرکاری و توێژینەوەی زانستی و پێگەیاندن و شیاندنی کادری هزری و پیشەیی، ئەمەش وای کردووە ئەم زانکۆ جیهانییە بەها و شکۆیەکی دیارو بەرزی هەبێت و هاوکات چاکسازی و پەرەپێدان زیاتر بکات بۆ خوێندن بە گشتی و خوێندنی زانکۆیی بە شێوەیەکی تایبەت.






### سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا.

### ئامانجەکانی سەنتەر:

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.



### عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان

- لە ساڵی ١٩٣٦ز لە شاری مەککە لە دایکبووە.
- بەکالۆریۆسی بازرگانی لەزانکۆی قاهیرە تەواوکردووە، لە هەمان زانکۆ ماستەری لە زانستە سیاسییەکاندا بەدەستهێناوە. لە ساڵی ١٩٧٣ بڕوانامەی دکتۆرای لە پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا لە ئەمریکا بەدەستهێناوە.
- لە ساڵی ١٩٨٨- ١٩٩٨ سەرۆکی زانکۆی جیهانی ئیسلامی بووە لە مالیزیا.
- ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە ڕێکخستنی چەندین کۆنفرانسی ئەکادیمی و سیمیناری نێودەوڵەتی.
- نووسەری چەندین کتێب و وتارە لەسەر چاکسازی لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا.
- سەرۆکی پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامییە.



### د.فوئاد عەلی جەلال

- ساڵی ١٩٧٥ لەدایکبووە.
- بڕوانامەی بکالۆریۆسی بەدەستهێناوە لە زمان و ئەدەبی عەرەبیدا لە زانکۆی سلێمانی ساڵی ٢٠٠٠.
- بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرای لە زانستی فۆنەتیک و فۆنۆلۆجیای زمانی عەرەبی بەدەستهێناوە لە زانکۆی موسڵ.
- خاوەنی حەوت توێژینەوەی زانستییە کە لە گۆڤارە ناوخۆیی و دەرەکیەکاندا بڵاوکراونەتەوە.
- بەشداری لە دەیان کۆنگرە و کۆنفرانسی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا کردووە.
- مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.

# چاكسازی ئیسلامی هاوچەرخ

....................................................

لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی
ژمارە (٥٢)


- نووسینی: پ.د.عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان
- وەرگێڕانی: د. فوئاد عەلی جەلال
- بابەت: هزری
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپ: یەكەم ـ ٢٠١٧. ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە (١٦٨٤)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# چاكسازی ئیسلامی هاوچەرخ

## خوێندنەوەیەكی پرۆگرامییانەی كۆمەڵایەتی

نووسینی:

پ.د.عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان

وەرگێڕانی:

د. فوئاد عەلی جەلال

# ناوەڕۆك

# پێشکەشکردن

بۆ (الذين تواصوا بالحق وتواصوا بالصبر)

کە شایەستەی بەڵێنی ڕاستی خوداوەندن، کە فەرموویەتی:

(من عمل صالحاً من ذكر أو أنثى وهو مؤمن)

ليحيينهم (حياةً طيبة) وليجزينهم

(بأحسن ماكانوا يعملون)

(وبشر الصابرين)

# پێشەکی پەڕتووك

چـــاپی ســـێیەمی ئـــەم پەڕتووکـــە خوێندنەوەیـــەکی پرۆگرامییانـــەی کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرێت **بۆ پێنج بابەتی گرنگ لـە بابەتـەکانی گوتـاری ئیسلامی هاوچەرخ.**

**بابەتی یەکەم: کە ئەم چاپە باسی لێوە دەکات، بابەتی باوەڕی تەواوە بە ڕاستی و دروستی پەیامی موحەممەد(دروودی خوای لەسەر) وەك پەیامێکی خوداوەندی، باوەڕێکی بنیاتنراو لەسەر بەڵگەی سەلمێنەری پشتبەستوو بە ژیری و ماك نەك مەزەنەی دەراساکان(الخوارق)**، ئەمەش بابەتێکی زۆر گرنگە بەتایبەت لە کاتێکدا کە ئوممەتی ئیسلامی پاشەکشەی کردووە و تێڕوانینە گەردوونییەکەی بەجۆرێك شێواوە لەبری ئەوەی پشت بەو هۆکار و بەڵگە یاسایی و زانستییانە ببەستێت کە پەیامی موحەممەد هێناونی، نوقمی لیتەی جادوو و ئەفسانەی پڕوپووچ بووە.

**بابەتی دووەم: بابەتی یاسای سزادانی ئیسلامییە بەوپێیەی لە نەگۆڕەکانی شەریعەتە،** سەرجەم ئەو گوتارە باوانەی سەبارەت بە شەریعەت دەوترێن جەخت لە توندوتیژی و هەڕەشە دەکەنەوە و بەڵێنی توندترین سزا دەدەن بە هەرکەسێك کە بکەوێتە داویەوە، ئەمەش دەرگا بۆ کەسانی خاوەن مەرام دەکاتەوە کە لەبۆسەدان بۆ ئەوەی تانە لە شەریعەت و نەگۆڕەکانی ئیسلام بدەن.

وە لەم چاپەدا بە فراوانی ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە ئەم سیستمە و نەگۆڕەکانی هیچ بوارێکی تێدا نیە بۆ توندوتیژی و هەڕەشە و تۆڵە، بەڵکو سیستمێکی تەواو و بێ کەموکووڕی و نەرم ونیانە، هەموو کار و بارێك بە تەرازووی داد و بەزەیی دەکێشێت بەمەبەستی بەدیهێنانی ئاسایشی کۆمەڵگە، هەروەها ئەوە خراوەتە ڕوو کە چۆن ئیسلام جیاوازی دەکات لە نێوان تاوانی هەڵەی سروشت و پێکهاتە و زکماکی دەروونیی مرۆڤ و تاوانی خوێن و ماڵ بە جۆرێك ئاسایشی کۆمەلآیەتی بەکەمترین ڕادەی پێویست لە سزا دەستەبەر بکات، وە ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە ئەوەی پێی دەوترێت سنوور و سزا لە ڕاستیدا ئەوە ئەوپەڕی سزایە وە لێبوردن و بەخشین کارێکی پێویست و خوازراوە، هەروەها لە چوارچێوەی یاسای سزادانی ئیسلامیدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە هەر سزایەك کە کۆمەڵگە پێی وابێت بەرهەڵستی تاوان دەکات و بنەبڕی دەکات مادام لە خوار سزای دیاریکراو(حدود)ەوە بێت، ئەوا سزایەکی گونجاوە و هیچ ڕێگرییەك نیە لێی تا ڕادەی لێخۆشبوون.

**بابەتی سێیەم: بابەتی دەوڵەتی شارستانی ئیسلامی و چارەسەری گرێکوێرەی ستەمکاری و گەندەڵی و گەندەڵی لە بیر و مێژووی سیاسی ئیسلامیدا،** واتە بابەتی چاکسازی سیستمی سیاسی ئیسلامی و بونیادنانی دامەزراوەکانی دەوڵەتی ئیسلامی هاوچەرخ، هەر بۆیە ئەم بابەتە پێویستە گرنگییەکی زۆری پێ بدرێت، چونکە ئاشکرایە لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامیدا، سیستمی سیاسی هۆکاری سەرەکی بووە لە تێکچوونی ژیاری ئیسلامیی وە گۆڕینی ڕێچکەکەی لە دادپەروەری و ئاوەدانی و گەشە و

ئاشتییەوە بۆ کەندەلآنی زۆرداری و گەندەڵی و بالآدەستی و سەرکوتکردن لە پێناوی قۆرخکردنی دەسەلآت و سامان لەلایەن کەمینەیەکی سیاسی و دەستوپێوەندەکانیەوە. لێرەوە دەبێ وەلآمی ئەو پرسیارە بدەینەوە: کامەیە سیستمی ئیسلامی جێگرەوە بۆ حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، کە بنەماکانی ئیسلام و بەها و چەمکەکانی جێنشینی لە دامەزراندنی سیستمی دادپەروەری و برایەتی و ئاوەدانی و گەشە و ئاشتی بەدی بهێنێت؟ کامەیە دامەزراوەکانی ئەم سیستمە و چۆن دامەزراوەکانی بنیات دەنێ؟

ئامانجی ئەم توێژینەوەیە پێشکەشکردنی دید و تێڕوانینێکی ئیسلامی چاکسازییە بۆ دامەزراندنی دامەزراوەی دەوڵەتی ئیسلامی شارستانی، بە توانایەکی سەردەمییانە و ڕووبەڕووبوونەوەی سەرجەم بەربەرەکانێکان و وەلآمی زانستی بونیاتنەر بۆ چارەسەری گرێکوێرەی (گرفتی ستەمکاری و گەندەڵی لە بیر و مێژووی سیاسی ئیسلامی) و گێڕانەوەی دید و شوناسی مرۆڤایەتی و ژیاری و ڕابەرایەتی بۆ ئوممەتی ئیسلام.

**بابەتی چوارەم: بابەتی چاکسازییە لە خوێندنی بالآ لە سیستمی فێرکردن لەناو جیهانی ئیسلامیدا،** بەشێوەیەك زانیاری وەك ئامانج و مەبەست و دەستپێکە ژیارییەکان و ناسینی نەژاد (فطرة) و سروشت و ڕووداو و وزە و توانا و هەموو ئەو بەبەرەکانێیانەی ئوممەتی ئیسلام ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بگەڕێتەوە بۆ فێرکردن.

له ڕاستیدا ئوممەتی ئیسلام بۆ ماوەی چەندین سەدە کوێرەوەری زۆری چەشت بەدەستلێکترازانی دیدی گەردوونی و نموونەی ئیسلامی لەگەڵ واقع و سیستم و کردەوە کۆمەڵایەتییەکان، تا کار گەیشتە زاڵکردنی مێژووگەرایی لەلایەن نەریتگەراکانەوە لەو ساتەوەی دەرگای ڕادۆزی (اجتهاد) داخرا، وە زاڵکردنی ژیاری یۆنانی لە ڕابردوودا لە لایەنی شارستانی و فەلسەفی وکۆمەڵایەتییەوە، وە زاڵکردنی بیر و ژیاری ڕۆژئاوایی لەم سەردەمەدا، تا کار گەیشتە تێکچوونی دیدی گەردوونییانەی ئوممەتی ئیسلامی و تێکچوونی بیر و ڕۆشنبیری و دارمانی ئاوەدانی و خامۆشبوونی پشکۆی بەخشش و ژیارەکەی.

لەم بوارەدا زانکۆی ئیسلامی جیهانی لە مالیزیا ئەزموونێکی پێشەنگمان نیشان دەدات، ئامانجی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی کادێرەکانە، بەشێوەیەك بەهای کۆمەڵایەتی بۆ بگێڕدرێتەوە، وە بەها و بنەما و ئامانجەکان بخاتەگەڕ بۆ پاڵنەرە خۆماکییەکان و واقعی کۆمەڵگە و توانا زانیارییەکان و بەربەرەکانێکانی سەردەم لە لایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە گرنگیدان بە لایەنی زانیاری و فێرکردن و لایەنی پەروەردەیی و خێزانی، لە پێناو چارەسەرکردنی ئەو گرفتی لێکترازانەی تووشی نەتەوەی ئیسلام بۆتەوە، وە هەموو دەرهاویشتەکانی لە: کردەوەی ستەمکاری و گەندەڵی و تێکشکانی ویستی نەتەوەی ئیسلام و دروستکردنی گیانی بەندایەتی کە ئوممەتی ئیسلامی گەیاند بەم ڕۆژە، کە ئوممەتێکی لاوازی پەراوێزخراوە و لە گۆڕەپانی هێز و داهێناندا هیچ پشکێکی نیە.

**بابەتی پێنجەم: کە ئەم پەڕتووکە باسی لێوە دەکات بابەتێك لە بابەتەکانی ڕۆژگارە، ئەویش بریتییە لە پێویستی هەبوونی وتووێژێکی ژیاری بونیاتنەر لە نێوان دوو مەزنترین ئاینی جیهانی کە ئەوانیش ئیسلام و مەسیحییەتن،** بەتایبەت لە سەردەمێکدا کە هێزە هەژموونگەرییە جیهانییە ئیمپریالیستەکان ـ بە یاسای دارستان کە تیایدا ڕەوایەتی بۆ هێزە ـ سوودیان لەو پاشخانە مێژووییە بینیوە کە لە هزر و بیر و ژیری ڕۆژئاواییدا هەیە کە بریتیە لە ناحەزی و قینی دامەزراوەی کڵێسای ئەوروپی بە دروستکردنی فیشاڵ و درۆ و دەلەسە و بوختان لەسەر ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام.

ئەو وتووێژەی لەم پەڕتوکەدا بەڕێوە دەچێت ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە جیاوازی نییە لە نێوان ئامانجە دروستەکانی بنەمای پەیامی مەسیحییەت و ئیسلام، بەڵام لێڵی و تاریکی لە ئاینی مەسیحیدا لەوەوە هات کە سەرچاوەی بیروباوەڕی ئەو ئاینە تووشی دەسکاری و گۆڕانکاری هات لە بابەتی خاچ و ئاماژەکانی، وە چۆن گفتوگۆی ژیاری و ئامانجدار و بونیاتنەر، ئیسلام و مەسیحییەت پێکەوە کۆدەکاتەوە لەسەر گونجان و پێکەوە ژیان و لێکتێگەیشتن ئەگەر دەمارگیری و درز و بۆشایی بهێڵێت.

ئەوەی کە نووسەر مەبەستیەتی تەنها قایلبوون نیە بەو دەرەنجامانەی کە ئەم لێکۆڵینەوانە پێیان گەشتوون، بەڵکو لەوەش گرنگتر زانین و ناسینی ئەو پرۆگرامەیە کە ئەم لێکۆڵینەوانە پێشکەشیان دەکەن، لە چاکسازی لە

پرۆگرامی بیری ئیسلامی و گەشەپێدانی، بۆ ئەوەی ئەم نەتەوەیە بتوانێ سەرلەنوێ ژێرخانی تێڕوانینە قورئانییە ژیارییەکەی بونیادبنێتەوە، وە بتوانێ شێواوییە ڕۆشنبیرییەکەی چاك بکاتەوە، وە سەرلەنوێ سەرکەوتوو بێت لە دروستکردنەوەی کەسایەتی ئیسلامی و بونیادنانەوەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و زیندووکردنەوەی ژیارە مرۆڤایەتییە ئاکارییە زانستییە جیهانییە ئاوەدانکەرەوەکەی.

داواکارم خوای گەورە سەرکەوتوومان بکات و ڕێگەی ڕاستمان نیشان بدات وە کۆتا داوامان سوپاسی خودای جیهانییانە

**پ.د.عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سولەیمان**

**قاهیرە لە ٢١ ی صەفەر ١٤٣٠ك**

**بەرامبەر بە ١٦ فێبریوەری ٢٠٠٩ز**

## پێشەکی:

گرنگی ئەم وتارە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پێکهاتەیەکی سەرەکی سەبارەت بە تێڕوانینی گەردوونی ژیاری قورئانی دەخاتە ڕوو، کە بە ژێرخانێکی پێشتری دروستکردنی ڕۆشنبیری ئیسلامی و ژیاری ئیسلامی دادەنرێت، چونکە ئەم تێڕوانینە تێڕوانینێکی رۆحیی پەیوەستە بە بوون و ژیانی مرۆڤایەتی و پەیوەندی و کاریگەریەکانی لەم ژیانەدا و لەسەر ئەم زەوییە، چونکە هیچ تێڕوانینێکی گەردوونی گشتگیر و بەڵگەئامێز نیە سەبارەت بە ژیان و ژیانی دواتر مەگەر لە بەدیهێنەری گەردوونەوە بێت، چونکە پەیپێبردنی گشت بوون (وجود) لە سەروو توانای ژیری و لۆژیکی مرۆڤەوەیە.

ئامانج لەم وتارە ڕوونکردنەوەی بنەمای ژیری و تیۆری باوەڕ و گشتگیرییەکانی، کە بنەمای ئەو تێڕوانینە گەردوونییە ئیسلامیەیە کە لەسەری بەندە، ئەو بنەما و ڕۆشناییەی کە ڕێی ڕاستی پیشانی نووسەر داوە، بە ئاگا و بەبێ ئاگایی، هەر لە منداڵیەوە و بەدرێژاییی گەشتی ژیانی، بناغەی دامەزرێنەری باوەڕ و تێڕوانینە گەردوونییە سەراپا ئیسلامییەکەی بووە. وە بنەمای تێگەشتنی بووە بۆ واتای ژیانی لە جیهانی بەرجەستە و جیهانی ڕۆحدا.

ئاواتی نووسەر ئەوەیە کە ئەم وتارە لای خوێنەریش ببێتە یارمەتیدەرێك بۆ چەسپاندنی باوەڕێکی چەسپاو و دڵنیا بەهەمان شێوەی نووسەر، بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی واتای ژیانی و تێڕوانینە گەردوونییەکەی لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و جێنشینی و چاکەخوازی پشت بە خوای گەورە.

ئەوەی کە پاڵنەرم بوو بۆ نووسینی ئەم وتارە وە گێڕانەوەی ئەم بابەتە لە بیرەوەری منداڵی و لاویمدا، کاتێ خوێندکاری دواناوەندی بووم و بابەتی پرۆگرامی زانستی ئیسلامی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەیە کە سەرەڕای زانستیبوونی بیری ئیمام (ئیبن حەزمی ئەندەلوسی)، و بەهێزی و توندوتۆڵی بیرە زانستییەکەی، بەڵام کاتێك ڕووبەڕووی بابەتی باوەڕ و بەڵگەی سرووش بوەوە لە ڕێچکە زانستییە عەقڵانییەکەی لایدا، بۆ ئەوەی بۆ وەرگرتنی بەڵگەی سرووش پەنا بەرێتە بەر دەراسا و پەرجۆ (خوارق و معجزات).

کاتێك ڕووبەڕووی بابەتی باوەڕ و ڕاستی سرووش بوومەوە لە سەردەمی مێردمنداڵیمدا، حاڵم حاڵی هەر مرۆڤێکی تر بوو لەو قۆناغەی تەمەندا، لە بیرکردنەوەدا پابەندی پرۆگرامی ژیری زانستی بووم سەبارەت بە باوەڕ و تێڕوانینی گەردوونی ئیسلامی، وە دەرئاسا هیچ گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو لەلام. بۆیە هەرئەمەش پێش چەند ساڵێك ڕایکێشام بۆ نووسینی ئەم وتارە (تێڕوانین لە ڕواڵەتی بوونی ئیبن حەزم و پەرجۆی پەیامی موحەممەدی)، وەك سەرنج و تێبینی لەسەر پرۆگرامی ئیمام ئیبن حەزم، وە وەك تەواوکارییەك بۆ تێڕوانینە زانستییە پرۆگرامییەکەی.

## بەڵگەی ژیری گونجاوترین بەڵگەیە لەسەر سرووشی موحەممەدی:

ئاشکرایە کە ئیمام ئیبن حەزمی ئەندەلوسی بە یەکێك لە دیارترین کەسایەتییە زانستییەکان ئەژمار دەکرێت کە قوتابیانی بیری ئیسلامی ناتوانن خۆی و مێژووی ژیانی پشتگوێ بخەن، بیری ئەو زانایە بە بیرێکی زانستی پرۆگرامئامێزی توندوتۆڵ جیادەکرێتەوە، کە پابەندە بە ژیری و واقع و ئەزموون و بەرهەستەکان، وە هەموو بابەتێکی پڕوو پووچ و گومان و خەیاڵ ڕەتدەکاتەوە هەرچەندە بەرگ و باری بیر و باوەڕ و ئاینی بەبەردا کرابێ. ڕوون و ئاشکرایە کە خودی بیری زانستی و پرۆگرام ئامێزی ئیبن حەزم لە گرنگترین هۆکارەکان بووە بۆ بەکەم سەیر کردنی پلە و پایەی ئیبن حەزم و نکوڵی کردن لە ڕێبازە زانستییەکەی لە مێژووی بیرسازی نەتەوەی ئیسلام لە سەدەکانی دوایندا، بەهۆی ئەو گرفتەی تووشی بیر و باوەڕی ئوممەتی ئیسلام بوو، وە بەهۆی دابڕانی زۆری بیریارانی لە واقع و ژیان.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە پابەندبوونی ئیبن حەزم (تەنها بە ڕواڵەتی دەقی سروشی ئیسلامی) لە یاسا و ڕێساکانی شەریعەتدا بێ زیاد و کەم بریتیە لە درێژکراوەیەکی سروشتیی ڕێبازە زانستییەکەی کە تیایدا پابەندە بە ژیری و هەست و ئەزموون، بۆیە ئەوەی لە نادیارەوە دەرئەچێ لە لایەن خوداوە دەنێردرێت، مرۆڤ بۆی نیە هیچی بۆ زیاد بکات یان لێی کەم بکاتەوە. بۆیە ژیری لای ئیبن حەزم تەنها توانای ئەوەی هەیە کە پەی پێ دەبات وەك خۆی بێ زیادوکەم، چونکە پێچەوانەی ئەمە یان دەبێتە هۆی بەخوداکردنی ژیری یان ئەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی کاتێك جیهانی بینراو تێکەڵ بە نەبینراو دەکرێت بێ هیچ بەڵگەیەکی ژیری باوەڕپێکراو، ئیبن حەزم ژیری و

زانست و زانیاریەکەی خستە گەڕ بۆ تێگەیشتن لە سرووش و دەقەکانی بێ هیچ زیاد کردن و کەم کردنێك، ئەمەش وای لێکرد کە توانای ئەوەی هەبێت لە یاسا و ڕێسا کانی ئیسلام بەشێوەیەك تێبگات کە نەیارانی ڕێبازەکەی پێش یار و هەوادار و موریدانی ڕێز لە تێڕوانین و بۆچوونەکانی بگرن و وەك بەڵگەی زانستی و شەرعی دای بنێن کە تا ئێستاش قوتابیانی زانست و زانیاری سوودی لێ دەبینن.

## چاخە شوێنکەوتەیی و دواکەوتووەکان هەڵکەوتووانی ئوممەت پەراوێز دەخەن:

چاولێخەفاندن و نادیدەکردنی ژیرییە زانستییە پرۆگرامییەکانی ناو کۆڕی زانایانی ئوممەت لە چاخە پاشینەکاندا، دیاردەیەکی گرنگترە وەك لەو دیاردانەی هزری ئوممەت بەدەستیەوە گیرۆدەبوبوو لە مێژووی دواییندا وە پەرتبوونی مەعریفەی ئیسلامیش ئەوەندەی تر پووکاندیەوە، وێڕای دابڕکردنی زانا و ڕۆشنبیرە موسوڵمانەکان و توندکردنیان لە گۆشەی مزگەوت و خوێندنگەکاندا، ئەم چاو لێخەفاندن و خۆ لێبێئاگاکردن و بەکەمسەیرکردنەی شکۆی ژیرمەندانی زانستە پرۆگرامییەکان و بەسستی پێشوازی لێکردنیان، هەر تەنها ئیبن حەزمی نەگرتەوە، بەڵکو ئەو هەڵوێستە ناهەموارە بەچەشنێ بەدی دەکەین کە درێژەی کێشاوە بۆ زۆرینەی ژیرمەندە زانستخوازە پرۆگرامییەکان و بیرمەندانی داهێنەریش، وەکو پێشەوا ئیبن تەیمیە کە ژمارەیەکی زۆر لە زانا و ڕۆشنبیران بەرەنگاری بوونەوە و بە شلگیر و لەدینلادەر ناوزەدیان دەکرد، هەروەها وەکو ئیبن

خەلدون کە زۆرینەی زانایان و رۆشنبیران خۆیان گێل دەکرد لە هزر و بیری ئەو و دژایەتیشیان دەکرد، هەروا بە فەرامۆشکراوی مایەوە تاکو زانا خۆرئاواییەکان پەردەیان لادا لە ڕووی پرۆگرامگەرایی یە زانستییەکەی خوێندنگەکەی، وە مافی تەواویان پێدا لە ڕێزلێگرتن و چاودێریکردنی نموونەی تری وەك ئەمانە زۆرن کە بیر و هزریان فەرامۆش کراوە و نکوڵیش لە پرۆگرامەکەیان کراوە.

وە هەر کەسێکیش ڕامێنێ لە ژیانی ئەو زانا هەڵکەوتووە دەگمەنانەی مێژووی ئوممەتی ئیسلامی، هەر لەوەتەی دەرگای ڕادۆزی (اجتهاد) داخراوە لەدوای چاخی چوارەمی کۆچییەوە، دەبینێ کە ئەم دەرفەتە هزریانە، بەرەنجامی ژیانێکی زانستیانەیە کە لەڕووی سروشت و پەراوەکردنیەوە، تەواو جیاوازە لە قوتابخانە هزریە باوەکە، کە بە پەرتبوونی مەعریفە و دابڕینی زانایان لە ژیان و واقع دەناسرێتەوە، جا هەرچی ئیبن تەیمیە و ئیبن ڕوشد و ئیبن حەزم و ئیبن خەلدون و هاونموونەکانیانن، هەر تەنها زانا و فەقیهی بازنەوانەکانی مزگەوت و پەنا دیواری حوجرە و قوتابخانەکان نەبوون، بەڵکو ئەوان شارەزا و کارامە و ئەزموونداربوون لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ژیانداریشەوە، سیاسەتێکیشیان لەلا گەلاڵە بووە کە بوەتە مایەی پێکهێنانی مەعریفەیەکی ژیری زانستیانەی سەراسەری و تەسەل بەجۆرێك کارلێك بکات لەگەڵ کار و پەراوە و زرنگیاندا، بەچەشنێك کە ڕەسەنانە ڕەفتار بکەن لەگەڵ واقعی ژیان و گۆڕانکارییە هاوچەرخەکان، لەبەر ئەوە پوختەی ناوەرۆکی ڕادۆزی و بۆچوونەکانیان ــ لەسەرجەم چاخە شوێنی و کاتیەکەیاندا ــ ڕەسەن و پرشنگدارە.

سەرەڕای چەشنە زانستییە ڕێکوپێکەکەی پرۆگرامی ئیبن حەزم لە مامەڵەکردنی لەگەڵ هەردوو جیهانی دیار و نادیاردا، هێشتا هەر کێشەیەکی سەخت هاتوەتە ڕێی لە توێژینەوەکەیدا سەبارەت بە کرۆکی بەڵگە ژیرییەکان لە قبووڵکردنی بنەماکانی سرووش (وحی) وەك سەرچاوەیەك بۆ مەعریفە و دەرخستنی ڕاستیەکەی و ڕاستێتی شەریعەت و قبووڵکردنی و پابەندبوونی، جا کاتێك پرۆگرامی ئیبن حەزم پەیوەستی ژیری و جیهانی (دیار و بینراو)ە و ڕەخنەی گوماناوی لارووێر و دڵدۆنگیانە و تەمومژاوی قەبووڵ ناکات، ئەوا هەر دەبێ بەڵگەی ژیرانە و زانستییانە پرۆگرامییانەی وا بخاتە ڕوو، کە بیکاتە بناغە و بنچینەی ئەوتۆ کە شایستەی پشتپێبەستن بێت لە قەبولڵکردنی سرووش (وحی) کە جیهانی نادیارە و پەیوەستی ژیریش بێت.

قەبولڵکردنی بەڵگەی نادیاریش، ناشێت ژیرییەك بێنێتە ئاراوە بەبێ قەبولڵکردنی ڕاستێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وە ڕاستێتی پەیامەکەی، بۆیە لێرەدا دەبینین کە ئیبن حەزم بۆچوونەکەی دابەش کردووە بەسەر ئەو پرۆگرامگەراییە ژیری و زانستییەی کە پابەندی هیچ شتێك نابێ جگە لە ژیری و بەرهەست (محسوس) و ئەزمون وەك سەرچاوەیەکی ڕاست و ڕەوا بۆ مەعریفە، وە ئەو هەستە دەرونیە باوەڕدارانەیەی کە هەیە، وە مەعریفەی ژیرییانەی لە ئاست گەورەیی پەیامی ئیسلامدا، وە پێویستبوون و گرنگیەکەی لە بەڕێکردنی ژیانی مرۆڤایەتیانە و بەردەوامبوونی کاروبارەکانی، وە گرنگی و بایەخی پێکەوە تەواوبوون و هەماهەنگی هەردوو جیهانی دیار و نادیار لە واتای هەبوونایەتیدا.

لەبەر ئەوە، هەر دەبوو ئیبن حەزم ئەم بەڵگە ژیریە بدۆزێتەوە کە لەگەڵ سروشتی هزر و بیر و پرۆگرامەکەیدا گونجاوە، وە بازنەی پێکەوە بەستنی ژیرییەکی دامەزراوانەیە لە نێوان هەردوو جیهانی دیار و نادیاردا، بەبێ ئەوەی بکەوێتە تەڵەی ئەندێشە و گومان و دڵدۆنگییەوە.

وە بۆ ئەوەش کە بەڵگەکەی بدۆزێتەوە و دەستبەرداری نەبێ ئیبن حەزم دەبێ لا بکاتەوە بەلای ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) چونکە ناشێ کەسانی هاوتای خۆی قەبووڵی و هاوپەیوەستبوونێکی گوماناوییان هەبێ (بێ بەڵگە) بەجیهانی نادیارەوە، بۆ ئەوەی تیایدا بەڵگەکەی و پشتڕاستی ئەو ڕاستگۆییە ژیری و زانستییە پرۆگرامییەی بدۆزێتەوە کە لە هزر و کاریدا پێوەی پابەندە، بێ گومان ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەبێ لە بەڵگەیەکی زیندووی واوە بێت کە ژیری ناچار بکات بە قەبولکردنی و تەسلیمبوونی، لەبەر ئەوە توێژینەوەی ئیبن حەزم سەبارەت بە پەرچوو (معجزە) لە ژیانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) بناغەی ژیرییەکی زانستییانەی پرۆگرامییانەیە، بۆ قەبووڵکردنی پەیامەکە و تەسلیمبوونی لە جیهانی دیاردا، وە بەوەش کارەکە تەواو دەبێ کە قەبووڵی پەیوەستکردنی ژیری بێت لە نێوان جیهانی دیار و جیهانی نادیاردا، وە ئەم ژیربێژییە(لۆژیکە) عەقڵییە پرۆگرامییە، تاکەلۆژیکی ڕاست و دروستە بەلای ئیبن حەزم و پرۆگرامە زانستییە ژیریەکەیەوە، لە بارەی قەبووڵکردن و تەسلیمبوون بە دۆزە (قضية) پەیوەندارەکان بەجیهانی نادیارەوە.

بەڵام ئەی ئەو ڕووە پەرچوودارەی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) کامەیە کە ئیبن حەزم دەتوانێ بیخاتە ڕوو و پێشکەشی بکات، کە عەقڵ ناچار دەکات وابەستەی بێت و هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ گومان و ناکۆکی و لێکڕاچوون (جدل، جدال)؟ سەرەڕای ئەوەی کە پرۆگرامەکەی ئیبن حەزم سەلامەتە و ڕووکاری پرۆگرامگەرایەکەیشی ڕەوان و بەجێیە بەڵام بەداخەوە کە بیری ئیبن حەزم لەگەڕانەکەیدا کەوتۆتە هەڵەوە و سەرکەوتوو نەبووە لە دەرهێنانی دەرەنجامە ڕاستەکان لەو پێشەکییانەیەوە کە دایناون و پابەندیان بووە، بۆ نموونە ئەو پەرچوانەی کە ئیبن حەزم ڕووی تێکردوون و هێناونی بەوە کۆتایی پێ هێناون کە باسی سەراسایەکی (سەرووی ئاسا: خوارق) ماددی دەکەن، لەگەڵ ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە چیرۆکی ئەو پەرچوانەی دراونەتە پاڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، بەڵام ئەم سەراسایانە ئەگەر باوەڕدارانیش هەندێکیانی لێ بەڕاست بزانن و بەئاسانی تەسلیمیان بن، ئەوا دەشێت گەلێك پرسیار و وەڵامی زانستی و ژیرانە و دەبەرێکڕاچوون بورووژێنن لەڕووی سەلامەتی سەنەد و گێڕانەوە و زێدەگۆیی (**المبالغة الكلامية**) گێڕەرەوەکان کە لەوانەیە گفتوگۆیەکی دوورودرێژی لێ بکەوێتەوە و قسە زۆر هەڵبگرێ لە ڕووی دەق و سەنەدەکانیشیانەوە: بەجۆرێك کار بگاتە ئەو ئاستەی، لای زۆربەیان کە بڵێن پێویستە تەنها ئەوانە باوەڕ بەم سەراسایانە بێنن کە خودی خۆیان لەکاتی ڕوودانی سەراساکان لەوێ بوون و دیتوویانە، ئیتر کەسی تر نا، خۆ ئەگەر هەندێ کەسی تر باوەڕیان بەو سەراسایانە هێنا، ئەوەیان دەچێتە بواری تەسلیم بوونەوە بەم لافانە(دعاوى) یان بواری خۆشەویستی و ڕێز و سەرسام بوون

بە خاوەنی ئەم پەیامە، یان بواری ڕێزگرتن و خۆشەویستی بۆ ئەو زانستخوازانەی تەسلیم بوون بە باوەڕهێنان بەم سەراسایانە، یان قەبووڵی دەکەن و باوەڕیان پێ دەهێنن لە تاوی دەستکەوتن و لەدەستدانی دەسکەوتێك، ئەمەش ناگونجێ لەگەڵ پرۆگرامە عەقڵی و زانستییەکەی ئیبن حەزمدا.

پێم وایە من لەسەر هەمان ئەو پرۆگرامەی ئیبن حەزم بووم لە ڕووی پابەندبوونم بە پرۆگرامە ژیریە زانستییە ڕێکوپێکەکەیەوە، هەر لەوکاتەوە کە منداڵ بووم و هێشتا نینۆکەکانم هەر نەرمۆڵە بوون، هەمان پرسیارم کرد، کاتێك گەیشتمە قۆناغی ئامادەیی لە شاری مەککەی پیرۆز و نزیکی کەعبەی پیرۆز، کاتێك هۆش و چاو و گوێی نەوجەوان (یافع) لەو تەمەنەدا دەکرێتەوە سەبارەت بە مانای بوون (وجود) و پەیوەندی جیهانی نادیار بە جیهانی دیارەوە و پاشان ڕووبەڕووبوونەوەی سەرسامبوونی دەروونی نەوجەوان لە بەرانبەر هەڵبژاردنی ئەو ڕێگەیەی کە پێویستە بیگرێتە بەر و ئەو باوەڕەی کە پێویستە بڕوای پێبێنی و پابەندی بێت لەم ڕێگە چارەنوسسازە ترسناکەدا.

کاتێك کە لە کتێبخانەیەکی خێزانی پڕ لە کتێبدا و لە ژینگەیەکی خێزانی پڕ لە نازدا گۆشکرام، ئاراستەی زانستیانەم گەشەی کرد، هەر لەو تەمەنە منداڵیەوە بەشێوەیەکی خۆڕسکانە سەبارەت بەم گۆشەنیگاکێشەلەسەرەی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەگەڕێم بەدوای دۆزینەوەی ئەو بازنە ونبووەی کەپێویستی دەکات لەسەرمان باوەڕ بە ڕاستگۆیی ئەو فەرموودانەی بکەین کە لە جیهانی نادیارەوە دەیگێڕێتەوە، پێویستیش

دەکات لەسەرمان پەیامەکەی وەربگرین و پابەندیشبین پێوەی، وە بەبێ باوەڕکردن بەڵگەیە لەڕووی ژیریەوە هیچ بوارێك بۆ ئەم پێوەپابەندبوونە نامێنێتەوە، گەرچی ئەمەش بەرگر نیە لەسەرسامی و رێزمان بۆ قسەی ئەوکەسانەی لاف ئەوە لێدەدەن کە پەیامی ئاسمانییان هەیە، ئەگەر شتێکی شایانی سەرسامی و رێز هەبێت لە هزری ئەواندا.

## ژیری لە دەراسا (الخوارق)ەکان لە پێشترە:

بەجیاواز لە شێوازەکەی ئیبن حەزم، بەرەو شێوازێکی تر نەچووم بۆ توێژینەوە لە بەڵگە و لەو بازنە ونبووەی پەیوەستە بەو سەراسایانەی دراونەتە پاڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وە نەشچوومەتە ناو مشتومڕی کێشەکانی ریوایەت و دەقەکانبەبێ نکوولّی لە ئەگەری رووданی، بەلاّم من گوژمی بیرم بەلای کەسێتی خودی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) ئاراستە دەکەم، ئەمە لەکاتێکدا من دەزانم پەیبردن بە ڕاستێتی بوون و ئەودیوی بوونیش لەوە گەورەترن کە ژیریم پەییان پێ ببات.

هەر وەکو دەشزانم کە ناتوانم قسە لە بارەی ئەودیوی جیهانی دیارەوە (الله) و پرسی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و پەیامەکەی بکەم، لەبەر ئەوە دەشێ ئەوەی کە من دەتوانم بیکەم ئەوە بێ کە ژیرییەکی ئاراستەکاریانەم بخەمە کار بۆ توێژینەوە لە پەرچوو و بەڵگەو بازنە ونبووەکەی ناو ژیانی پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر)، لەسەر بنەمای خواستەکانی ژیری و ماك (فطرة)، بەبێ ئەوەی کە پێویست بکات لەو دوو بابەتە تێپەڕ بکەم یان لێیان دەربچم یان هەڵیان بوەشێنمەوە، بە پەنابردن بۆ سەراسا مادییەکان، وە تێپەڕاندنی یاسا گەردوونییەکان. پێم وایە کە سەرکەوتوو بووم

—بەپێی گومانی خۆم— لەو سەرەتای تەمەنەدا لە هێنانەوەی بەڵگەی ژیریانەی زانستی سەبارەت بە ڕاستێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و پەیامەکەی، بەبێ ئەوەی پێویست بە قەبوڵکردنی سەراساکان بکات، وەك مەرجێك بۆ تەسلیم بوون بە ڕاستێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و پەیامەکەی، ئەمەش وای لێکردم ئەم وتارە بنووسم بۆ تەواوکردنی تیشك خستنەسەر بابەتی پرۆگرامگەرایی ژیرییە زانستییانەکە، وە بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەرێکی گرنگ لەم سەردەمە زانستیەدا، بۆ دوبارە گێڕانەوەی تێڕوانینە گەردوونییە ڕوحییە مرۆییەکە لە ڕوبەڕووبوونەوەی تێڕوانینە ماددییە ئاژەڵییەکەدا تاکو (هێز بۆ هەق بێ) نەك (هەق بۆ هێز) بێ.

هەر لەساڵانی سەرەتای لاویمدا خولیای پرۆگرامی زانستی لە بیروبۆچوونمدا چەسپی، کە سەلماندنی ڕاستێتی دوا پەیام بە پایان بێنم بەشێوازێکی ژیرانەی زانستییانە، نەوەکان دوابەدوای یەك پابەند بکات بە باوەڕ هێنانیان بە ڕاستێتی ئەم پەیامە، بەچەشنێك کە شوێنەوارێك لای پاشینەکان لە دڵنیایی جێ بهێڵێ کە هیچی کەمتر و جیاوازتر نەبێ لە کرۆکی دڵنیایی ئەو کەسانەی کە هاوسەردەمی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و یار و یاوەری بوون، لەبەر ئەوە بێگومان دەبێ پەرچووەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بە جۆرێك تەواو و بێ لەکە بن کە لەسەر بنەمای ژیری و ئەو یاسایانە بن کە ئامانجی پەیامەکەیەتی بۆ ڕێزلێگرتن و پابەندبوون پێیانەوە، پشتگیری و قەبوڵکردنی پەیامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەسەر بنەمای بەرچاوڕوونی دەبێ پەیوەست بێ بە ڕووداوێك، یان سەراسایەکی هەمەجۆری وا کە هەست و ژیری تێپەڕێنێ وە توێژەرە زانستییەکە نەبەستێتەوە بە ڕێسا و یاساکانەوە.

بێ گومان دەبێ ڕاستێتی پەیامەکە پەیوەست بێ بە خودی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر)، بۆ ئەوەش دەبێ سەرەتا لە تێڕوانین لە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) دەست پێ بکرێ، وە سەرنجی ورد بدرێتە ژیانی: بەشە تاك و تایبەتییەکانی، بەشە گشتییەکانی بەکۆ، وە پێوانەکردنیان لەسەر پێوەری ژیانی ئاسایی مرۆڤ و ماکەکەی(فیترەتەکەی) –وەك مرۆڤی ئاسایی– تا ببینرێ کە چ ژیریەکی گەورە بەم مرۆڤە دراوە کە بتوانێت ئەم پەیامە پەنهان و نادیارە بگوازێتەوە بۆ مرۆڤەکان و واشیان لێ بکات کە باوەڕی پێ بهێنن.

پەیامی ئیسلام –لەبەر ڕۆشنایی مێژوودا، وەك مێژونووسان دەڵێن– بەشێوەیەکی جیاوازتر لە ئاین و پەیامەکانی تری پێشووتر هاتووە، ئەوەتا مێژوو دەقی پەیامی ئیسلام و ژیاننامەی پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر) بۆ پاراستووین، وە مێژوو بۆی ڕوونکردووینەوە، وە دەقی قورئانی پیرۆز، دەری دەخەن کە محمد (دروودی خوای لەسەر) مرۆڤ بووە، وەکو مرۆڤیش ژیاوە، وە پێکهاتە و هەنگاوەکانی مرۆییانەیەکی ڕاست و ڕوون بوون، لەبەر ئەوە ڕاستێتی پەرچوەکانی پەیامەکەی و بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتییەکەی، ئەوە ناسەلمێنێ کە ئەو لەو سروشتە مرۆییەی وەدەرنێ کەخراوەتەبەر باس و گفتوگۆ، ئەوە ئەو کەسەیە کە مرۆڤایەتی دەخاتە سەر ڕاستە شەقامی قۆناغی زانستی و جیهانی، بەڵام ئەی پەرچوو لە کوێی ژیانی ئەم (مرۆڤ)ـەدایە؟ ئەی بەڵگەی یەکلاکەرەوەی ژیرانە لە کوێ یە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتییەکەی کە پەیامێکی جیهانی نادیارە و پڕ لە فەڕە و ژیری پێویستی دەکات لەسەرمان کە باوەڕمان پێی هەبێت؟

## مەرجەكانی ڕاستێتی پەیامەكە:

بۆ پەیامی محمدی (دروودی خوای لەسەر) (قورئان) دوو مەرجی بنەڕەتی تێدایە كە بەهۆیانەوە دەكرێ ئەم پەیامە بە پەیامی خودایی لەقەڵەم بدرێت. یەكەم مەرجیش مەرجی متمانە دانە، پەیامی محمدی (قورئان) تەنها قورئان و هیچی دیكە نا، متمانەی تەواو و دڵنیای داوە بەشێوەیەك كە لە ئایینەكانی تردا ئەم متمانە و دڵنیاییە نیە، كە قورئانی پیرۆز هەر لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) خۆیدا گێڕدراوەتەوە و نوسراوەتەوە، وە تاوەكو ئێستاش لەلایەن قورئانخوێنانی پسپۆڕەوە بەتەواوەتی و بەشێوەی زارەكی دەخوێنرێتەوە بە سەنەدە موتەواتیرە پێكەوە بەستراوەكانەوە تا دەگاتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، هەروەها دەبێ قورئان ڕۆژانە لە پێنج نوێژەكاندا و لە ژیانی ڕۆژانەی هەموو موسوڵمانێكدا كەم تا زۆر شتێكی لێ بخوێنرێت، هاوكات زۆربەی موسوڵمانان خۆبەخشانە و بە خواستی خۆیان دەیخوێننەوە و لەبەری دەكەن و فێری دەبن خەڵكی فێر دەكەن و وەك پیرۆزی و پەرستش سەراپای ژیانیانی پێ دەڕازێننەوە، ئەمەش وای لێكردووە كە زۆر متمانەدار بێ، بەچەشنێ كە هیچ متمانەیەكی مێژووی تری پێ نەگاتەوە، وە جێی سەرسامیدە كە پەرچووێكی متمانەداری ئاوا دەگمەن لە نەتەوەیەكی نەخوێنەواردا هەبێ لە كاتێكدا كە پێگەیەكی ئەوتۆی لە زانست و مەعریفە و فەلسەفە و ڕۆشنبیریدا نەبێت. هەروەها پەیامی (قورئان) مەرجی دووەمیشی دەستەبەر كردووە، كە مەرجی چاكەكاریە، قورئانی پیرۆز، بە بێ گومان هانی كردەوەی چاك دەدات لەژیانی دنیادا، ئەگەر نا ئەوا مەودای

باوەڕپێکردنیشی –هەر لە بنەڕەتەوە– بۆ نەدەخولّقا کە پەیامێکی پیرۆز لە بەدیهێنەری گەردوون و ژیانەوە هاتبێ.

وە ڕەنگە ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾(النحل: ٩٠)، یەکێك بێت لەو ئایەتە گشتگیرانەی کە سروشتی پەیامی قورئانی ڕوون دەکاتەوە، مەبەستیش لەوە بریتییە لە ژیانی مرۆڤی موسولّمان، وە ئەگەر متمانە پێدان و بەلّگەدارکردن و نیازی چاکەکاری دوو مەرجی پێویست بن بۆ ئەوەی پەیامەکە خودایی بێت، ئەوا ئەمە هەر خۆی بەسە بۆ ڕێگرتن لە مشتومڕ و جەدەلی ناڕەوا لەبارەی دەرکەوتنی پەیامێکی متمانەدار و تۆکمە، کە هانی چاکەکاری دەدات و لەکەسێکەوە دەردەچێ کە دەیەوێ بە خۆسەپاندنی وەك خاوەن پایەیەك کارەکانی مەزن بکات و پیرۆزی پێ ببەخشێ، لەبەر ئەوە دەبێ مەرجی سێهەمیشی تێدابێ، کە لەسەر ڕووێك لە ڕووەکانی پەرچووی زانستی ژیری بەند بێت، بەلّگەیەکی یەکلاکەرەوە لەسەر ئەوەی کە محمد (دروودی خوای لەسەر) پێغەمبەرێکی ڕاستگۆیە، پەیامێك ڕادەگەیەنێ کە لە (الله) ەوە دەرچوە (جیهانی نادیار)، تاکو بەوە ببێتە پەیامێکی خودایی ڕاستگۆیانەی ئەوتۆ کە مرۆڤ پابەند بکات باوەڕی پێ بکات.

لێرەشەوە گرنگی لاکردنەوە لە کەسێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە ڕووی ژیریەوە سەرچاوەی گرتوە، وە وردبونەوە لە ژیانی و هەنگاوەکانی، تاکو لە خودی خۆیەوە بەلّگەی یەکلاکەرەوەمان دەست بکەوێ لەسەر ڕاستێتی خۆی وپەیامەکەی، بە تایبەتیش کە ئێمە ناتوانین ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خوداوە بکەین بۆ وەرگرتنی زانیاری لێی دەربارەی ڕاستێتی

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و پەیامەکەی، وە چۆن جگە لەمە ڕێی تر دەگرینە بەر کە خودی پەیامەکە خۆی ژیرانە و زانستییانەیە و بە (اقرأ) دەستی پێکردووە و پەڕتووکی هەیە کە (قورئانە) وە هانی زانست و بیر و بەڵگەهێنانەوە و سەلماندنی داوە، وە لەسەر بنەمای تێگەیشتن لە یاسا و هۆکارەکان دامەزراوە؟ ئەمە ئەوەیە کە سەر لە نوێ جەخت دەکاتەوە لە سەر بایەخی وردبوونەوە لە ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و کاروانی ژیانی و ئەدگارە کەسێتیدەکانی، بەمەبەستی زانینی شیاوبوونی هەڵگری ئەم پەیامە و بەڵگەی ڕستگۆیی ژیرانەی لە هەڵگرتنی ئەم پەیامەدا.

## موعجیزەی قووچەکی هەڵگەڕاوە (الهرم المقلوب)ی ژیری:

ئەگەر ژیری و زانست بخەینە کار، وە قووڵ و ورد بینەوە لە هەنگاوە جیاجیاکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و یەك بەیەکی توانا و سیفەتەکانی، ئەوا پێویستمان بە بەڵگەهێنانەوە نیە، چونکە بۆمان دەردەکەوێ کە هەریەکە لەو سیفەتانە ـ گەرچی هەریەکەشیان بەجیا لە جێی خۆیانەوە گەورەن ـ ڕێگر نین لە قسە لەسەر کردنیان بەوەی کە کەسێك خاوەنی یەکێك لەم سیفەتانە بێت، واتا هەریەکە لەمانە بۆ خۆی بەجیا سیفەتی تاکە کەسێکە، کەچی هەمووشیان لە یەك کەسدا کۆکراونەتەوە، بەڵام ئێمە پێکەوە بە شێوە گشتییەکەی تێڕوانین لە ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) دەکەین، لە هەموو لایەنە جیاوازەکانیەوە، تا بۆمان دەربکەوێ لە بنەڕتدا پەرچوو هەر لە گەورەیی هەر یەکە لەو ئەدگارە تاکە کەسیەیدا نەشاراوەتەوە و بەس، بەڵکو لە

کۆبوونەوەی وە پێکەوەبوونی سەرجەم ئەم سیفەتانەدا تێیدا لەیەك کاتدا، هاوشان لەگەڵ ئەو شتانەی کە پەیوەستن بەم ئەدگارانەوە لە ڕووی پەیڕەو و دەسکەوتی کردەییەوە، لە کەسێتی تاکە یەك کەسدا، بەشێوەیەکی زۆر تێر و تەسەل، کەواتە ڕووکاری پەرچووەکە هەر ئەوە نیە کە لە مرۆڤبوونی هەر سیفەتێك لە سیفەتەکانی پێغەمبەردایە (دروودی خوای لەسەر) بەڵکو کۆبوونەوەی هەموو ئەم سیفەتانە پێکەوە و سیستمی کارابوونیانە لە تاکە یەك مرۆڤدا، بەتایبەتیش لە دۆخی ژیانە تایبەتەکەیدا، وە دۆخی سیفەتەکانی ئەو کۆمەڵگە شارستانیەی کە لەو سەردەمەدا ئەو تیایدا ژیاوە.

جوانی ئەم پەرچووانە، وە جوانی و ڕازاوەیی ژیری و زانستیەکەی، پێغەمبەریان (دروودی خوای لەسەر) لانەدا لە سروشتە مرۆییەکەی وە قەبوڵکردنیشیان نەبووە مایەی وەلا نانی ژیری و لۆژیکی مرۆیی، وە ئەمە ئەوەی حەڵاڵ و حەرام نەکرد کە پەیام ئاراستەی مرۆڤ بکرێ و بیاندوێنێ لە ڕێی نەژاد و سروشتیانەوە و لەڕێی وەدەرنانی یاساکانی ژیانیانەوە، ئەم پەرچووە ژیریە زانستیە بازنەی پێکبەستکردنی نێوان جیهانی دیار و جیهانی نادیارە، هەر ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی ژیرییانە و زانستییانەیە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و بەڵگەی ڕاستێتی ئەو پەیامە، لەبەر ئەوە هەموو سەراسایەك لە سەراساکان –ئەگەر ڕاست بێت– پشتیوان و پشتگیرییەکە، بەڵام پێویستی و مەرج نیە بۆ باوەڕهێنان و بەڕاستزانینی ئەم پەیامە.

وە بۆ ئەوەی ئەو پەرچووە گشتیە ژیرییە زانستییە مرۆییانەی کە مەبەستمانە لە ژیانی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر) ڕوونی بکەینەوە،

ئەوا بێگومان پێویستە گەشتێکی خێرا بکەین بە ژیاننامەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر)، تا دوای سیفەتە مەزنەکانی و ڕوداوەکانی ژیانی بکەوین، کۆمەڵ بە کۆمەڵ کۆیان بکەینەوە، بەمەش دەتوانین ببینین کە چۆن کۆبوونەوەی ئەم سیفەتانەی ڕووی پەرچووی ژیرییانەی زانستییانەی مرۆیی محمد و پەیامەکەی دەنوێنن، بەبێ ئەوەی پێویست بە باسکردنی ئەو سەراسایانە بکات کە لەوانەیە گێڕانەوەیان زۆر هاو ڕێك نەبێت لەگەڵ دەرچەکانی پەیامەکە و سروشتی ئەو قۆناغە زانستییە جیهانییە شارستانێتی یە مرۆیی یەی کە ئەم پەیامە دەستی پێدەکات و ڕێنمایی دەکات.

محمد (دروودی خوای لەسەر) بەبێ باوکی لەدایك بوو، لە ئامێزی (عبدالمطلب) ی باپیریدا گەشەی کرد، دوای ئەو لە ئامێزی (أبو طالب) ی مامیدا، لە دۆڵی ئیبراهیمدا کە ڕووتەن و دابڕاوە لە هەموو شتێ، وە لە بیابانی وڵاتی عەرەبیدا، بەر لە دایکبوونی باوکی کۆچی دوایی کرد، وە کە گەیشتە تەمەنی شەش ساڵان دایکیشی کۆچی دوایی کرد، گەرچی بەبێ دایك و باوکی گەورە بوو، بەڵام لە سایەی خوداوە بێ ناز نەبوو لە سۆز و خۆشەویستی دایکانە، لەو قۆناغی سەرەتای منداڵییەی دا کە لەوپەڕی قۆناغی پێویستبوونیدابوو بۆ دایکی —وەك پێویستیەکی مرۆڤانە— کە لەم قۆناغەدا جگە لە ماك (فطرة)ی دایکایەتی و هەستی چاودێریکردنی بۆ ڕۆڵەکەی هیچ شتێکی تر هێندە بۆ منداڵ پێویست نیە، وە محمدی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) بەو چەند قۆناغە جیاوازانەدا تێپەڕی کە ئەگەر تیایاندا داواکاری و خواست و هیوا و حەزێکی مرۆییانەی هەبوایە مرۆڤ

نەیدەتوانی کپیان بکات، یان بیانشارێتەوە لە ماوەی چل ساڵ تەمەنیدا بە چەشنێك کە هیچ شتێکی وای تێدانەبوو کە ئاماژەی ئەوەی تێدابێ کە لەداهاتوودا دەبێتە پێغەمبەر، ئەمە بەر لەوەی خونچەی گوڵی ژیانی داهاتووی بکرێتەوە هەر لەو زانست و حیکمەتەوە کە هەیبوو تا توانای سەرکردایەتیکردنەکەی کە خودا لەدواتردا پێی بەخشی و بە سەرکەوتنێکی تەواوەوە هاتە مەیدان، ئەمانەش کاتێك هاتنەدی کە پەیامەکەی ڕاگەیاند، لەو کاتەشدا تەمەنی لە چل ساڵ تێپەڕی بوو.

ژیانی محمد (دروودی خوای لەسەر) لە قۆناغەکانی ساوایی و منداڵی و نەوجەوانی و بوون بە پیاوێکی تەواو، وە لە پێگەیشتن و باوکایەتی و هاوسەرێتیدا تاتەمەنی چل ساڵی، کە لەم تەمەنەدا سروش و پەیامی بۆ دابەزی، بەوە دەناسرا کە کەسێکی ڕاستگۆ و سپاردەپارێز و بەرز و ڕەوشتجوانە، ئەمەش وای لە ژنێکی ژیری شکۆداری هۆزەکەی کرد —کە خەدیجەی کچی خوەیلد بوو خوای لێ رازی بێت— سامانەکەی پێ بسپێرێت وە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، وەك ڕێزگرتن لەو سیفەتە جوانانەی.

وە یەکەمین شتێك کە سەرنجمان ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە ئەم پیاوە کاتێك پێگەیشت و تەمەنی گەیشتە چل ساڵ، کە لەم تەمەنەدا مرۆڤ گەردەلوولی خۆ نواندن و هەڵپەکردنی بۆ ژیان هێمن دەبێتەوە و زوربەی داخوازیەکانیشی دەپووکێنەوە، گەرچی پێشتر سۆز و خواست و هەڵپەکردنەکانی لە بلێسەدا بوون، چونکە لەم ساڵانەی تەمەندا، کۆی حەزی دنیاویستی و خواست و ئاوات و داواکانی مرۆڤ کپ دەبنەوە، بەڵام سەیرە بە پێچەوانەی باوەوە، وەك مرۆڤێك خۆی نمایش دەکات —کەکەسێکی زۆر

ساده و لەدڵاشیرین بوە و خاوەنی ڕەوشتی بەرز بووە– بانگەشە دەکات بۆ ئەوەی کە خاوەنی پەیامێکی خوداییە، کە پەیامێکی پڕ لە خێر و خۆ ویستانەیە، لە خوداوە دەیگەیەنێ بە ئوممەتەکەی، لە جیهانی نادیارەوە بۆ مرۆڤ، تیایدا داوا لە ئومەتەکەی و مرۆڤایەتی بەگشتی دەکات کە شوێنی بکەون و بڕۆن لەگەڵیدا بەرەو یەکتاپەرستی خودا و برایەتی و دادپەروەری و بیرکردنەوە و ڕەوشت بەرزی و گەڕان بەدوای فێربوونی زانست و چاکسازی و ئاشتەوایی و لێبوردەیی و ئازادی بیروباوەڕ و وەلانانی ستەم و گەندەڵی و دەستدرێژی و خۆبەزلزانی و خۆسەپاندن.

بەڵام گەلەکەی و خزمەکانیشی کەوتنە ڕێلێگرتنی و بەربەرەکانێکردنی بەوپەڕی سەرسامی و کەللە ڕەقیەوە –کاتێك خۆیان خزمەتگوزاری کەعبە و بتپەرست بوون– سەبارەت بەو قسە و بانگەوازە مەترسیدارەی کە دەیکات و ئەو ئایندە گەورە و بەرزەی کە باسی دەکات، لەکاتێکدا ئەم قسەو باسانە لەناو بیر و باوەڕی ئەواندا باوی نەبوو، وە پێچەوانەی چەشنی ژیانی ئەوان و خراپ پەراوەکردنی نەریت و پەیوەندیەکانیان بوو، دیسان جێگەی سەرسامیە کە ئەم پیاوە (محمد) هۆز و گەلەکەی خۆی وابەستە دەکرد بەبەڵگەکانەوە کە دەرخەری ڕاستێتی بانگەوازەکەی بوون، بەوەی کە بیری دەهێنانەوە و بۆی دەردەخستن کە ئەو بە درێژایی تەمەنی لەناو ئەواندا ژیاوە و هەرگیز درۆی نەکردووە، ئەمەش کاتێك کە سەرکەوتە سەر گردی (صفا) و بانگی کردن کاتێکیش بەدەم بانگەکەیەوە هاتن، پێی گوتن: "ئەگەر من هەواڵتان پێ ڕابگەیەنم کە سوپایەك لەودیوی ئەم کێوەوە بەرەو ئێرە دێ، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەکەن؟" گوتیان: بەڵێ، خۆ ئێمە درۆمان لەتۆ نەدیوە، ئەمجا فەرمووی:

"من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە" وە قورئانی پیرۆزیش جەخت لەم واتایە دەکاتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ (یونس: ١٦).

ئیتر چۆن دەکرێت –لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، تا ئەم ئاستە، لەوکاتەوە کە لەدایك بووە– کە ڕاستییان لێ بەدرۆ بکات، دوای هەموو ئەمانەو لەو ئەرك و کارە بەرز و پیرۆزەشدا؟ ئایا دەکرێت کە محمد (دروودی خوای لەسەر) یان هەرکەسێکی تر کە خۆی بێدەنگ بکات و حەز و خواست و توانا و ئارەزووەکانی کپ بکات، بە درێژایی ژیانی، وە لەهەموو قۆناغەکانی تەمەنیدا؟ وە ئایا ئەو یان هەرکەسێکی تر دەتوانێت کە سیفەتی ڕاستگۆیی هەبێت، لە لەدایکبوونیەوە تا تەمەنی چلساڵی، کار و باری ڕاپەڕێنێ و حەز و خواست و درۆکانی کپ بکات، تاکو لەم تەمەنەیدا شوێنی بکەون و باوەڕ بە درۆ و قسە هەڵبەستراوەکانی بکەن؟ ناکرێ مرۆڤێك کە بە ڕاستگۆ و سپاردەپارێزی ناسرابێت کە نهێنیەکەی بشارێتەوە بەسەر ئەو شتانەدا کە ڕۆژگاری ژینی دەیهێنێتە پێشەوە بۆی و کەسیش پێیان نەزانێت تاکو تەمەنی چل ساڵی، ئەگەر بەڕاستی وانەبێ و خودا بۆخۆی چاودێری نەکات و بەڕاستی گۆشی نەکات، کە بە درێژایی ئەم هەموو ساڵانەی تەمەنی کەسێك ئەم توانا و حەزانەی تیادا نەبووبێت و هیچ شارەزایی و کارامەیشی نەبێت بۆ خۆ ئامادەکردنی ئەو ڕووداوانەی کە ڕۆژگاری داهاتووی دەیهێنێتە ڕێی و پێویستی پێیان دەبێت –وەکو توانای گەورە و داهێنان و دەسکەوتی سەرنجڕاکێش– ئەوسا کە لەهەموو ئەمانە داڕنا بێت ئەوا ئەم سیفەتانە... سپاردەپارێزی و ڕاستگۆیی و بەردەوامبوون بەتەنها بۆ خۆیان لەو سیفەتە

بنەڕەتییە داواکراوانەن کە مەرجە لەهەموو پێغەمبەرێکی نێردراو لەلایەن خوداوە بۆ گەیاندنی پەیام هەبن.

بەم جۆرە دەبینین کە دەرکەوتنی ئەم بانگەشە و توانایانەی کە لە ژیانیدا دەرکەوتوون لەدوای تەمەنی چل ساڵیەوە –گەرچی پوختەکەیان لە ناوەرۆکدا مرۆییانەیە– بەڵام کۆبوونەوەی هەموو سیفەتەکان لەیەك کاتدا پێکەوە تیایدا بەوشێوە ڕێك و پێکە، وە بەو هەماهەنگیدەی دەریخستوون، وە بەو برەی کە سەلماندوونی، بەتایبەتیش لەو ژینگە ساکارەدا، لە ژیانی تاکە یەك کەسی ساکاردا، ئەو پەرچوەیە کەژیری پابەند دەکات بە باوەڕکردن پێی، وە بەمەش لە سنووری ماك و سروشتی خۆی دەرناچێ.

ئەوەی مایەی سەرسامی و پەرچوویەکی ژیرانەیە، کە ئەم کەسە لەدلا شیرین و ڕاستگۆ و سپاردەپارێزە وەك کۆڵەکەیەکی تۆکمەی قایم ڕاوەستاوە و بانگەشە دەکات بۆ چاکسازی و چاکەخوازی، پیاوێکی نەخوێندەوارە لەوپەڕی گۆی زەوییەوە، سەر بە نەتەوەیەکی نەخوێندەواری دەوارنشین، کە نەفەلسەفەیان هەیە و نەگەشەیان پێوە دیارە، نە قوتابخانە و نە کتێبخانەیان هەیە.

وە بەبێ ئەوی کە پێشینەیەکی ئەزموون و شارەزایی گشتی و سەرکردایەتیکردنی هەبێت تا بەهۆیەوە ئەو قسە پوخت و کورت و ڕەوانانە دابهێنێ و دەریانبڕێ، بە جۆرێکی وا کە لەو زمانپاراوی و ڕەوان بێژیە نەدەچوو کە عەرەبەکان دەیانزانی، وە سوور بوو لەسەر تین و گوڕمی لاوان و گەنجان بۆ بانگەوازەکەی، هەرچەندە خۆی و هاوەڵەکانیشی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆریش دران، بە درێژایی چەندین ساڵ، بەڵکو ئەم ئازار و

ئەشکەنجەدانە و بەرگریکردنی قوڕەیش و پابەندبوونیان بە بەدکاری و بتپەرستییەکەی خۆیانەوە، وای لێکرد کە زیاتر سوور بێ لەسەر بانگەوازەکەی، هەروەها ژمارەی شوێنکەوتوەکانیشی زیاتر و زیاتر بوون، لەکاتێکدا دەروازەیەکی ڕوون بەدی نەدەکرا بۆ یار و شوێنکەوتوانی کە جێگەی ئومێد و وەڵامدانەوەی کەسانی دەور و بەریان بێ بۆیان، وە تەنانەت تروسکاییەکیشیان لێ دیار نەبوو بۆ بە ئاواتگەیشتنیان کە دوای ئەو هەموو ئەشکەنجە و ئازارە دەستیان بکەوێت، سەرسامی زیاتر لەوەدابوو کە دوای سیانزە ساڵ لە بانگخوازی، بەبێ کولبوون، وە بە ئارامگرتن لەسەر ئەشکەنجە خواردن، بەبێ بێزاربوون، کە ساتی دەرچوون هات، خۆری ئاواتەکان هەڵهات، بانگخوازی و وزەی خۆی کۆکردەوە، بۆ ئەوەی هۆزەکانی ئەوس و خەزرەجی دانیشتوانی یەسریب باوەڕ بهێنن، بەشێوەیەکی لەناکاو، بەبێ حسابکردن بۆ ڕابردوو، پەیمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بدەن کە ملکەچی بن و پەیامەکەی سەر بخەن.

جێی سەر سامیە کە محەمەد (دروودی خوای لەسەر) ی پێغەمبەری خودا —کە ئەو کەسەیە ئێمە ژیاننامەکەی دەزانین، وە دەزانین چۆن گەورە بووە و گەشەی کردووە و توانا لەبن نەهاتووەکەی دەناسین، وە سەرکەوتنە بێ هاوتاکەی بە کرداریدانە وە تەنها لەماوەی دە ساڵدا، دەوڵەتی ئوممەتی دادپەروەری و لێبوردەیی و برایەتی و چاکەخوازی و بیر و باوەڕ ئازادی دامەزراند، زۆر بە وردی کاروبارەکان بەدوای یەکدا دەهاتن، وە بە دادپەروەرانەیی حوکمڕانی تێدادەکرد، وە کار و بار بە فرمانی ئەو ڕایی دەکرا، وە سیستمی بونیادنا، وە سەرکردایەتی سوپای دەکرد، سوپایەك کە

سەرکەوتوو بوو، هەموو هۆزەکانی عەرەب تەسلیمی بوون، لە پانتایی بیابانەکانەوە تا لوتکەی شاخەکان و وەستانەوەی بە ڕووی تێکشکاندنی پیلانی هۆزە جوولەکەکان لەودیوی قەڵاکانیانەوە و ڕێگرتن لە گێچەڵەکانیان، هەر لەو کاتەشدا کە سەرقاڵی ئەو ئەرکە گەورانە بوو، هاوکات بەسەر زمانیدا وشەی چاك و پڕ لە فەڕ و ڕەوان و پەرچو ئاسا و حیکمەت و ڕێنمایی و ئاسانکاری و کامڵ دەهات.

ئایا ئەمە سەرسامییەکی پڕ لە سەرسامی نیە، کە بە خەیاڵی مرۆڤدا بێ کە تاکە یەك کەس ئەم هەموو توانا و لێوەشاوەیی و خواستانەی هەبێ، لەو ژینگەیەشدا، بەبێ ئەوەی کەمتەرخەمی و ڕەخنەیەکی لێ دەربکەوێت لە هەموو ماوەی تەمەنیدا، منداڵی، گەنجێتی، پیاوەتی، وە لەهەموو بار و دۆخەکانی ژیانیدا، وەك هاوسەر و باوك تا تەمەنی چل ساڵی؟ بەبێ ئەوەی لە ژیانیدا، لە ژینگەکەیدا، لە کارامەیی ژیانزانیدا کەسێك گۆشی کردبێ وەیان پەروەردە و چاودێری کردبێ، ئایا بەڕاستی ئەمە لە توانای کەسێك دەوەشێتەوە کە نەخشە دابنێ بۆ ئەرکێکی لەم جۆرە، وە بەم ئاستە توند و تۆڵەش لە ماوەی چل ساڵدا، هەر لەوکاتەوە کە لەدایك بووە، هیچ کام لە توانا و خواستەکانی بەدیار نەکەوتوە؟ ئەی باشە ئەوە چیە کەوای لەم درەختە سەوزە کەم ئەزموون و کەم شارەزاییە کرد کەوا بتوانێ ڕووبەڕووی سەرکردە و گەورە و ڕەملێدەر (گەورە پێشبینیکەر) و هۆز و تیرەکان ببێتەوە، تا تێکیان بشکێنێ و لەکاریان بخات لەسەر بنەمای حیکمەت و مشورخۆری و سیاسەت و جەنگە مەیدانیەکاندا، تاکو بانگەوازەکەی و هاوەڵانی بتوانن کۆتایی بهێنن بە ئیمپراتۆریەتەکانی ستەم و نادادی لەو وڵاتەی کە لق و

پەلوپۆکانی بڵاوببونەوە لەچوارچێوەی ژیاری فارس و ژیاری ڕۆمدا، وە ڕۆشنایی پەیامەکەی بڵاو بکاتەوە بە شەشدانگەی زەویدا (ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، باکوور، باشوور، پانی، درێژی) لە ماوەی چەند سەدەیەکدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو گەل و میللەتانە جیاوازیشن لەڕووی نەتەوە و گەل و زمان و ڕەنگەوە؟ ئەو پرۆگرامەی کە تیایدا گەورەیی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و سیفەت و توانا تاك و کۆیەکانی کرانەوە و پشکووتن لە ماوەی سی و شەش ساڵدا پەرچوویەکی ڕاستەقینەیە بۆ دڵنیابوونەوە لە ڕاستێتی پەیامی محمد (دروودی خوای لەسەر) و بەڵگەکانی، ئەو بەڵگانەی کە گەورە پیاوانی هۆزەکەی باوەڕیان پێ هێنا و بوونە سەلمێنەرێکی دەگمەنی و تایبەتمەندێتی ئەو لە لاپەڕەکانی مێژوودا ناساندوویانە و هەواڵیان ڕاگەیاندووە، ئەم کەسانە لە باشترینی ڕۆڵەکانی گەل و هۆزەکەی بوون لە ڕووی تەمەن و ژینگەیشەوە، هەر لە منالّیەوە وە شوێنی کەوتن و باوەڕیان پێ هێنا لە دۆخێکی نەخوازراودا لە ماوەی سیانزە ساڵی پڕ لە ئەشکەنجە و ئازاردان و کوێرەوەری، کە لە پشتیەوە خواست هەبوو، نەك سوود و بەرژەوەندی، ئەبێ حاڵی کەسێك چۆن بێت کە دوای ماوەیەکی زۆر بێتە پێشەوە و ئەو لایەنانەی پەرچووی قورئانیشی بۆ زیاد بکرێ، تا بانگەشەی ئەوە بکات کە توانیویەتی لەو هاوڕێیانەوە بەرچاو ڕوونی وەربگرێ تا بزانێ ئەو کارەی محمد (دروودی خوای لەسەر) چیە کە ئەوان نایزانن؟ وە حوکمڕانی لە کارێکدا بکات کە ئەوان لێی بێ ئاگا بوون..

ژیانی محمد (دروودی خوای لەسەر) و پرۆگرامی گەشەکردنی و کرانەوەی وزە و تواناکانی لەسەر ئەو پرۆگرامە تێر و تەسەلەی کەهەیە، کارێکە

ڕوویەکی پەرچووی تێدایە و هەموو مرۆڤێکی ژیر و زانستمەند و بەویژدان دەیبینێ، گەرچی هیچ کەسێك لە ئێمەی مرۆڤ هیچ نامۆییەك لە قۆناغ و هەنگاوەکانی ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) نابینێ گەرچی لەهەندێ لایەنەوە ژیانی پەرچووی دەگمەن و تایبەتییە، بەڵام پەرچووی مەحاڵ و ئەستەم بریتییە لە ڕێك و پێکی لە بەدوا یەکدا هاتنی ئەم خەسڵەتانە لە تاکە یەك کەسدا لەو بار و دۆخەدا لەماوەی شەست و سێ ساڵدا.

بونیاتنانی ژیانی مرۆڤ لە ڕووی پێکهاتەیەوە لە بونیاتنانی هەرەم (قووچەك) دەچێ، لە بنکە فراوانەکەیەوە پەروەردە و فێرکردن و گۆش کردن و کارامەیی و پەراوە و ئەزموون دەردەچێ تا لە لوتکەکەیدا دەگاتە توانا یان کارامەیی کارێك لە کارەکانی ژیان، وەکو سەرکردەیەکی سەرکەوتوو، پیاوی سیاسەتمەداری بەڕێوەبردنی دەوڵەت یان ئەدیبێکی بەتوانا و شاعیر و زمان ڕەوان و قەڵەم بەکار، یان زانستخوازێکی لێهاتوی توێژەری سەختکار، بەڵام ژیانی محمد (دروودی خوای لەسەر) پێچەوانەی ئەو هەڕەمەیە، نمونەکەی وەکو قوچەکێکی هەڵگەڕاوە وایە، لە بنکەیەکی تەسك و بچووکەوە دەست پێدەکات کە کۆتاییەکەی پان و فراوانە، لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕووکارەکانی ژیانەوە، سەرکردایەتیکردن، حیکمەت، سیاسەتکردن، بە جۆرێ کە سەرکردە و حەکیم و سیاسەتمەداران پێی نەگەنەوە، کە لەوە دەچێ بەرزترین نموونەی بێ هاوتا بێ لە وەسفەکاندا، نەك هەر قوچەکی هەڵگەڕاوە، بەڵکو وەسفکردن و پێچواندنی بە گوڵێکی بەرداری وا کە خۆی نمایش بکات بە جوانی و بۆن و بەرامە و بەرهەمیەوە دارێکی سەوز و گەشەوە، بەمەش دەبێتە ئایەتێك لە جوانترین ئایەتەکانی خودای گەورە.

ئەو پەیامەی —ئەگەر بەباشی وەربگیرێت و لێی تێ بگەین— ئاشتی لە دەروونندا دەچێنێ، بەزەیی و برایەتی لە نێوان مرۆڤەکاندا فەراهەم دێنێ، وە بانگەشە دەکات بۆ دادپەروەری و ڕاستی و چاکەکاری و زانست و ئاشتی، بەڕاستی ئەمە پەیامێکی پڕ لە پەرچووی خێردارانەیە، دەقەکانی لەکەسانێکی متمتنەدارەوە هاتوون لە کەسێکەوە دەرچوون کە کەسێکی ڕاستگۆی زیرەکە لە پێکهاتە و ڕەوشتیدا، پڕ لە پەرچووە لە دروستبوون و توانیدا، وە پڕ لە پەرچووە لەو پەڕاوە پڕ لە سەرسامییەی کە دابەزیوەتە سەری، بێگومان ئەمە پەیامێکی ڕاستگۆیانەی دابەزیوە، ناکرێ مرۆڤی ژیر باوەڕی پێ نەکات، کەواتە ئەم پەیامە هیچی تر هەڵناگرێت، مەگەر جگە لەوەی کە پەیامێکە لە خوداوە هاتووە، ئەو خودایەی بەدیهێنەری بێ هاوتا و تاك و تەنیا و وێنەکێشی هەموو شتەکانە، کە پێغەمبەرە ڕاستگۆ و سپاردە پارێزەکەی گەیاندوویەتی بە مرۆڤ، پەیامەکەش پەیامی ڕێنمایی و ڕێنیشاندانە، تیایدا هەردوو جیهانی دیار و نادیار یەکتری تەواو دەکەن، وە بەهۆی ئەوەوە واتای بوونی مرۆڤ دەردەخا کە جێنشین و ڕێزلێنراوە لەم سەر زەوییەدا، وە ئەم بوونەوەرەش ئامانجێکی ئەخلاقییانەی گەورەی تێدایە کە زەوی ئاوەدان دەکاتەوە، ئەمەش ئەو ئامانجەیە کە تاسە ماکییە مرۆییە ڕاستەقینەکە خوازیارێتی و داوای دەکات.

**بێگومان هەڵەتێگەشتنێك لەئارادایە:**

پەیبردن بەم لایەنەی پەرچووی پەیامی محمد (درودی خوای لەسەر) کە شیاو و گونجاوی ماك (فطرة)ی و سروشتی مرۆڤە، شایانی ئەوەبوو یەکانگیربێتەوە بە پرۆگرامی عەقڵێکی زانستییانەی رۆشنگەری وەك ئیبن حەزم، ئەم پەی پێ بردنە ئەمڕۆ نزیکترین شتە لە ژێری موسوڵمانەوە لە کاروانی چوونیدا بەرەو پرۆگرامی زانستی و دەربازبوون لە گەوێڕی و لادان و گومڕایی و تەڵەکە و جادو و خەیاڵگەری.

هەر لەو کاتەوە کە تازە پێمگرتبوو، باوەڕم بەم وردبوونەوە و تێڕامانە زانستییە کرداریە و ئەم ئاینە هێنا، کە پەیامێکی پیرۆزە، وە وای لێکردم کە بەخواستی خۆم هەڵیبژێرم نەك بەشێوەی بۆ ماوەیی و لە ڕێی ناسنامەی باوانمەوە، یان لەسەر بنەمای شوێنی لەدایکبوونمەوە، هەروەها بیرم لەسەر ڕێی زانست و پرۆگرامی سوننەت و ژێری گۆش بوو، –لە سایەی خوداوە– پاراستی لە هەڵە و گومانداری و خەیاڵگەری و جادووی بێسەرەوبەرە، لەبەر ئەوە –سوپاس بۆ خوا– هیچ کێشە و دوودڵیەك ڕووبەڕووم نەبۆتەوە سەبارەت بە پەیامی ئیسلام مەگەر تەنها خراپ تێگەیشتنێکی خۆم بووە بەرامبەر بەوشتە و پێویستی بە لەسەر ڕاوەستان و وردبوونەوەیەکی زانستییانەی پرۆگرامییانە بووە، بۆ زانینی ڕاستێتی ئیسلام و کایەی کارەکانی، نەك گومانێك کە بەرەو دوودڵی و نادڵنیایی و ساردبوونەوەم بەرێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەشدا پرۆگرامەکەی من بۆ وردبوونەوە لە هەر کار و بارێك کە ڕوبەڕووی بووبێتمەوە لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم: زانینی سروشتی کێشەکە، زانینێکی زانستییانەی پرۆگرامیانە، بەشی دووەم:

وەرگرتنی کەرتە بەشەکانی سرووشی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی یە گشتگیرییەکەی و مەبەستەکانیدا، وە بەبێ ئەم پرۆگرامەش من وادەبینم کە هیچ شتێکی تر نایاتە ئاراوە، جگە لەو لادان و گەوێرییەی کە پێویستە لەناوی بەرین لەپەراوەی هزریانەی ڕۆژانەماندا و وەدەری بنێین لە بونیاتنانی پرۆگرامی زانست و فێربوونماندا، وە لە پێگەیاندنی کادری زانستی و سەرکردایەتیانەماندا، بەوەش پرۆگرامی زانست و فێربوونمان کۆ و یەکانگیر دەبێ لە هەموو ڕووەکانەوە، لەوانە مەعریفەی کرۆکی ئاین و تێڕوانینەکەی و مەبەست و بنەما و بەها و چەمکەکانی، تا دەگات بە لایەنی مەعریفەی زانستی سوننەتە ماکییە گەردوونییەکان، لە بوارە جیاجیاکانی مرۆڤایەتی و فیزیکییەکاندا، بۆ ئەوەی زانست و مەعریفە و پەراوەیەکی ڕاستەقینەی کارای ئاوەدانکاریانەی وا بێتە ئاراوە کە تێڕوانینی ئیسلام و مەبەستەکانی بێنێتە دی، وە بنەما و چەمك و بەهاکانی چالاك بکات لە واقیعی ژیاندا، بەدرێژایی کات و شوێنەکان بەشێوەیەکی بەردەوام.

خودا پاداشتی (ئیبن حەزم) بە چاکە بداتەوە، کە بانگی کردم بۆ واتابینی و قوڵبوونەوە و وردبوونەوە لە قوڵایی واتای پرۆگرامەکەی تا گەیاندمیە ئەوەی هەندێك هەڵەی لێ بگرم بەبێ کەمکردنەوە لە توانا زانستییە بێگەردەکەی، تا بەشدار بم و قسەم هەبێ لە تێڕوانین و ئەزمونێکدا کە ماوەی هەڕەتی تەمەنی منداڵیمی پێدا تێپەڕیوە، کە هەر دەبێ پیایدا تێپەڕێت –بەشێوەیەکی هۆشیارانەبێ یان ـ ناهۆشیارانە ـ کە هەموو نەوجەوانێك پێیدا تێدەپەڕێت لە سەرسامی و توێژینەوە ماکییەکەیەوە سەبارەت بە پەیوەندی باوەڕهێنان بە نادیار و سەرچاوەی ژیانی مرۆڤ

لەسەر ڕووی ئەم زەمینە، وە لەسەر چارەنووسی ژیانی، دوای ئەوەی لە ناخی ئەم زەمینەدا دەنێژرێ، ئەو زەوییەی بۆتە سەرچاوەی نەشونمای جەستەی، پاش مردنیشی تەنها وەك بیرەوەرییەك و خەیاڵ و مشتێ خاك دەمێنێتەوە، ئەم تێڕوانینە پرۆگرامگەرایە بۆ من باشترین یاریدەدەر بوو، بۆ ئەو تەمەنەی ڕابردووم، چونکە لە ژیانمدا بوو بە وێنەیەکی زیندوو لە ڕووی بینین و بیر و ڕا و ئەزموونەوە، هیوادارم سودێکی تێدابێ و بانگەوازێك بێ بۆ بیرکردنەوە و لێوردبوونەوە و گرتنەبەری ڕێگەی ژیان لەپێناوی ئەو راستی و بەهایەی تێیدایە و ئەو کۆششەش کە پێویستە بۆ دەستخستنی بخەینە گەڕ بۆ ئەو کارە گرنگەی کە ژیانی گەنجەکانمان دەوڵەمەند دەکات، گەنجانێك کە گەنجینەی ئوممەتەکەمانن، گەنجینەی مرۆڤایەتین، بۆ ڕێنوێنی کردنی مرۆڤایەتی بەرەو ڕێگای ڕاست و شارستانێتی و دادپەروەری و برایەتی، وە ئاوەدانکردنەوەی ئەو توانایانەی کە مرۆڤ هەیەتی لەڕووی مرۆییەوە، تا دەگات بە تێگەشتنی چەمك و ڕەفتارە ڕەواکان، کە واتای ژیان و خود وەدی دەهێنن، بەهەموو بەرپرسیارێتی و لایەنە هەموارەکان و بۆن و بەرامە و تامە خۆشەکەیەوە بەبێ زێدەڕەوی و کەمڕەوی تێداکردن.

من تکام وایە کە گەنجان و خوێنەران لە خوێندنەوەی ژیانی ئەم پیاوە گەورەیەدا توێشوویەك بەدەست بێنن و بیر و هزریان بخاتە سەر شاڕێگەی پرۆگرامی ژیری و زانستی باوەڕدارانەی هەڵسەنگێنراو و دامەزراو، تاکو مەبەستەکانی جێنشینی و تەواوکاری سرووش و ماك بەدەست بێنن، تا ئەوە ببێتە بەڵگە و هاندانێك بۆ ژیانیان وە ڕێنمایی بۆ ئاوەدانکاریەکانیان بۆ بەرەو چاکە بردن و کۆشش و بەخشینیان لە کاروانی ژیانیاندا بە پشتیوانی خودا.

# دۆزی دووەم:

# نوێکردنەوەی گوتاری ئیسلامییانەی هاوچەرخ

# نەگۆڕ و گۆڕاو: سیستمی سزادانی ئیسلامی

# خوێندنەوەیەکی پرۆگرامییانەی کۆمەڵایەتییانە

## پێشەکی:

گرنگی توێژینەوە لە دۆزی ڕژێمی سزادانی ئیسلامی لەوەدایە کە دەچێتە ناو باسی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ سەبارەت بەو نەگۆڕە ئیسلامییەکان، وەناشیێ کە شارستانێتی ئیسلامی و ئوممەتی ئیسلامی –بەپێی سروشتی پێکهاتە عەقیدەیی و ژیارییەکەی– ڕاچەنیێ و گەشە بکات و پێش بکەوێ، ئەگەر بنچینەیەکی ڕاستەقینەی کردارییانە بۆ ژیانی و بۆ بزاوتە کۆمەڵایەتییە ژیارییەکەی نوێنەرایەتی نەکات و پابەندی نەبێت.

خۆ ئەگەر ئەم کارەشی مەرجی بنەڕەتی بێ بۆ ڕاچەنین و هەڵسانەوەی ئومەتی ئیسلامی و بوژاندنەوەی شارستانێتی ئیسلامی و دوبارە بنیاتنانەوەی لە جیهانی ئەمڕۆدا بە گۆڕاو و ئاستەنگەکانیەوە، ئەوا بێگومان پێویستە بیرمەند و زانا و ڕۆشنبیرانی موسوڵمان، کە ئەوان ئەو ژیر و دەست و دەسەڵاتەن کە کلیلی خستنەکاری جووڵەی زیندووکردنەوە و گۆڕانکارین، هەرگیز پێڵوی چاویان لێك نەنێن و نەخەون تا ئەو هۆکارە دەدۆزنەوە کە بووەتە هۆی دروستبوونی ئەو قەیرانەی ئومەت تووشی هاتوە لە نەگۆڕەکانیدا و هۆشیار بن بەرامبەریان لەڕووی دەق و لایەنی ڕۆحی و دەرچە کردارییە کاریگەرەکانی، کە دەکرێت قەناعەتیان پێ بهێنرێ و پابەندیان بن لە ژیانیاندا و لە جووڵەی کۆمەڵگەکانیاندا.

هەر وەکو لە واقیعشدا دیارە کە بێگومان ئەبێ کەمایەتی و کێشەیەك بوونی هەبێت لە گوتاری ئیسلامی هاوچەرخدا سەبارەت بەم نەگۆڕانە و لە ژیانی خەڵك و ئوممەتدا ڕەنگ بداتەوە، کە ئوممەتی گەیاندۆتە ئەو بارەی کە ئێستا دەیبینین لە واق وڕمان و سەرسامی و ناهەمواری لە نواندنیان لە

زوربەی ئەم نەگۆڕانەدا، جا ئەگەر هەستمان کرد بەوەی شێواندن دووچاری تێڕوانینی ئەم ئوممەتە گەردونییە هاتووە، وە چ گرفت و کۆسپێك دووچاری پرۆگرامە مەعریفی و هزری و ڕۆشنبیریەکەی هاتووە لە پیس بوون، وە کاریگەری پەروەردەیەکی خۆسەپێنانە و پەراوەی ستەمکاری لەسەر دەروون و ویژدانی، ئەوا ئەوسا دەتوانین بزانین کە گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ توشی چی هاتووە لەو شێواوییانەی، تا ڕادەیەکی زۆر ڕاڤەی دۆخی ئوممەت و دەرکەوتە نەخۆشەکانی پێدەکرێت لە هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ و پیادەکردنی سیستمەکانی و پەیڕەوکردنی کردارییانەیەوە.

ئەم توێژینەوەیە پرۆگرامی بە ئیسلامیکردنی مەعریفە تەوزیف دەکات بەدیدگایەکی ئیسلامی گەردوونییانەی جێگرەوەی ژیارییانە بەتەواوکاریەکی پرۆگرامییانەی ڕێکوپێکی جێبەجێکردنی دامەزراوانە و سستمیانە (SYSTMATIC) بۆ چاوخشاندنەوە بە یەکێك لە گرنگترین نەگۆڕەکانی شەریعەت، کە بریتیە لە یاسا (سستمی) سزا ئیسلامییەکان ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە نموونەیەك بۆ هەوڵی بنیاتنانەوەی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی شەریعەت و ڕۆشنایی تێگەیشتنی زانستیانەی سوننەتەکان لە سروشتی مرۆڤەکاندا، وە لەبەر ڕۆشنایی گشتینەکانی یاسادانانی ئیسلامی و مەبەستەکانی، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ پێداویستییەکانی واقعی ژیان و بەگوڕخستنەوەیەك لە کات و شوێندا بۆ بونیادی کۆمەڵگەی مرۆیی خێردار و هاوچەرخ.

مەبەست لەم توێژینەوەیە، بریتی لە پەیبردن بە گرنگی چاکسازی هزر و بیری ئوممەت و بانگکردنی بیرمەندان و زانایان بۆ چاوپیاخشاندنەوە بە گوتارەکانی ئوممەت سەبارەت بە نەگۆڕەکانی و بە پرۆگرام و شێوازە زانستییە ئیسلامییە کاراکەی، کە ژیرییەکان قەناعەت پێدێنێ و دەروونەکان باوەشێن دەکات و وەڵامی داخوازییەکانی نەژادی مرۆڤ و تاسە خێردارەکانی دەداتەوە.

بەبێ بوونی چاکسازی دیدگە و چاکسازی هزر و پرۆگرام و چاکسازی گوتار و سەلامەتی پێشنیازەکان لەسەر بنەما ئیسلامییە زانستییە کردارییە ڕاستەقینەکە ڕاچەنین و هەڵسانەوە و ڕاچەناندن نایەتە ئاراوە و بەرپا نابێت، بگرە دارمان و پەراوێز خستن بەردەوام دەبێ، تا ڕەفتاری بیرمەندان و چاکسازان نەگاتە ئاستی هزری و ویژدانییەکی پێویست بۆ ڕاچەناندنی ئوممەت و سەرڕێکەوتنی کاروانی ژیاریە پڕ لە خێروبێرەکەی.

## گرنگییە تایبەتەکەی یاسای سزادانی ئیسلامی:

هیچ کەسێ نیە تێبینی ئەو هەستە نەکات کە بیری زۆربەی خەڵکی گرتوەتەوە لە ئەنجامی ئەوەی کە دەکەونە ناو باس و خواسی دەستەواژەی (یاسای سزادانی ئیسلامی) بە تایبەتیش وشەی سنور (حد)، کە بەلای زۆرینەی کەسەکانەوە ئەمە سزایەکی توند و پڕ لە ترس و تۆقینە، لە کاتێکدا کە دەزانین ناخی شەریعەتی ئیسلامی نایەوێ ئەو جۆرە هەستانە بوروژێنێ لەناو کۆی خەڵکیدا، بەتایبەتیش موسوڵمانەکان، وە هەر شتێکیش

له بنەما و بەها و ڕۆحی ئیسلامییەوە سەرچاوەی گرتبێ، دەبێت بەرژەوەندی و ئاسایش و دڵنیایی بۆ مرۆڤەکان تێدابێ.

وەك ئەم کورتە باسانە، کە دەبێ بە بیری زۆربەی کەسەکاندا بێت، کاتێك دەکەونە ئەو بەربەرکانێ و گفتوگۆیانەوە کە دەبنە مایەی وروژاندنی هەستەکانی ترس و تۆقین بەهۆی توندی تۆڵەسەندنەوەکان و تەمێ کردنەکان لە یاساکانی سزادانی ئیسلامیدا، کاتێك هەندێ کەس دەکەونە هەڵەی بەئەنقەستەوە و کەتن (تاوانی گەورە) ئەنجام دەدەن، کە پەیوەستن بە سروشتی مرۆڤەکانەوە و ئەو کرۆکە بەدکاریەی لەگەڵ سۆز و تاسە و ئارەزوەکانیاندا تێکەڵ بووە، بەتایبەتیش لاوان، کە لەم ڕۆژگارەدا چەندین دۆخی نالەبار یەخەیان دەگرێت لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، وە بەهۆی چەندین وروژێنەری وەکو دەزگا بینراوەکانی ڕاگەیاندنەکانەوە، کە دەبنە هۆی تاوان و کەتنکردن، بۆ نموونە: وەکو تاوانی داوێن پیسی و پەیوەندییە سێکسیە ناڕەواکان، وە ئەو سزایانەی کە ئیسلام بە توندی بۆی داناون، ـ لەسەر بەزەییدارترین فەتوا و ئاسانترین شێوەی ـ بە پیاکێشانێکی ئازاربەخش بە لەشیدا و تەمێ کردنێکی کۆمەڵایەتییانە و شکاندنەوەیەك. لەبەر ئەوە نامۆ نیە کە توێژەران ناوبەناو ڕووی نیگایان لەم بابەتە هەڵگێڕنەوە و زەین و بیریان لە دۆزی ئەم یاسایەدا بخەنە کار، سا بەڵکو بگەنە چارەسەر و بکەونە ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنێکی وەها کە لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە پەسەند بێت، لەگەڵ گونجانی لەگەڵ یاسای سزادانی ئیسلامی.

وە یەکێك لەو دۆز و بابەتانەی کە پێویستە توێژەران هەڵوێستە بکەن لە ئاستیدا و لێی ورد ببنەوە و چاوی تەماشای بۆ تەرخان بکەن و هەوڵ بدەن

گوتارێکی ڕونتریان هەبێت لە ڕووی تێگەیشتن و قەناعەتەوە بابەتی چوار گەواهیدەرە بۆ سەلماندنی تاوانی زینا و حیکمەت لە هەبوونی چوار گەواهی دەر کە گەواهیەکی ڕاشکاوانەی یەکلاکەرەوەیە، کەچی ئەوەش نابێتە بنەمای بڕیاری کۆتایی و دیاریکراو، لەهەمان کاتدا گەواهی تەنها دوو کەس بۆ تاوانی کوشتن و تۆڵە لێسەندنەوەی بەسە.

بابەتی لەم جۆرە پرسیاری زۆر دەوروژێنێ، لەو پرسیارانەش بۆ نموونە: بۆچی دەبێت چوار گەواهی دەر هەبن؟ ئەی بۆچی سێ یان پێنج یان شەش نەبن؟ ئایا چوار ژمارەیەکە هەر خۆی بەڵگەدارانەیە؟ یان هەر ژمارەیەکی هەڕەمەکییانەیە؟ یان شتی تر؟ کەواتە لەم بارەدا بەس نیە کە پێیان بوترێ کۆمەڵ، چونکە سێ کەس بە کۆمەڵ لە قەڵەم دەدرێ، هەروەها پێنج و شەش و تاکۆتایی هەر پێیان دەگوترێ کۆمەڵ.. ئەی کەواتە بۆچی ژمارە چوار، کت و مت کەمترین سنووری گەواهیدانێکی پەسەندکراو و وەرگیراوە لە دانەپاڵی ئەم تاوانەدا؟

### دۆزەکە دۆزی پرۆگرامە:

ئەم پرسیارانە و جگە لەمانەش، لە نموونەی ئەو داڵغانەن کە بە بیری توێژەراندا دێن، سەبارەت بە یاسای سزادانە ئیسلامییەکان و ئەو باسوخواسانەی بەوەوە پەیوەستن، کە ڕەنگە سەرقاڵی بار و دۆخیان و سروشتی پسپۆڕییەکەیان ــ وەکو من ــ دەرفەتیان نەداتێ کە توێژەرییانە لەم بابەتە بکۆڵنەوە و تیایدا قووڵ ببنەوە و بەو دوور و درێژیە هەڵوێستەی لەسەر بکەن. هەر جارێك ئەم داڵغە و بیرانە بەمێشکمدا دەهاتن، لەلام ڕوون

بوو كە وەلأمدانەوەی دۆز و پرسیاری لەم جۆرە، بەبیٚ بوونی پرۆگرامگەراییەكی هــزری سەرانســەری ڕێك و پێك (COMPREHENCSIVE AND SYSTIEMATIC) نایەتەدی، ئەمە لەپالٚ تێگەیشتن لەو لایەنە نەژادیەی كە پەیوەستە بە دۆزە مرۆییەكانەوە، وە ئەمەش بەجۆرێك پرۆگرامدارە كە تەواوكاری ڕۆحی و ژیری و سروشتی تێدایە واتە: (پەڕتووكی سرووش و پەڕتووكی ژیری و پەڕتوكی گەردوون)، هەر پەیوەست بەم بابەتە پێشتریش لە سەر دۆزی پرۆگرامی ئیسلامی و كاملٚی سەرچاوەكانی مەعریفەكەی لە سرووش و ژیری و گەردوون و واقیع شتم نوسیوە، وە ئەزموونی زانكۆی ئیسلامی لە مالیزیا هەولێكی سەركەوتوانەیە بۆ لێك جیاكردنەوەی مانای نێوان سرووش و دەقەكانی، كە ئەمانە لە ڕاستیدا بۆ ئێستا هیچ ئەنجامێكی وایان لیٚ ناكەوێتەوە كە بەم كات و شوێنەی ئەم سەردەمە بخۆن، مەگەر هەر وانە و پەندێكیان لیٚ وەربگیرێت.

لەبەر ئەوە مەبەست لە ئەزموونەكەی زانكۆی مالیزی بریتییە لە داڕشتنی پرۆگرامگەراییەكی ئیسلامییانەی گشتی هاوچەرخ، كە تیایدا (سرووش) و (گەردوون) یەكتری تەواو ئەكەن، لەسەر بنەمایەكی شیكاریانەی ورد و ڕێكوپێكی وا كە بارودۆخی كات و شوێنی ڕەچاو كردبیٚ، بەمەش دەبێتە داڕشتەیەكی زانستی و ئەكادیمییانە و تێگەیشتن لە سروشتی وتاری ویسلامی و مەودای گونجانی هەریەكە لەو وتارانە سەبارەت بەو كەسانەی كە گوێگری ئەو وتارەن لە ڕووی تەمەن و بار و دۆخ و لایەنی دەروونی و ڕۆشنبیرییەوە و دانانی سنورێكی هزری و ئەكادیمی –بەشێوەیەكی كرداری– بۆ دیاردەی جیابوونەوەی مەعریفە و پرۆگرامگەرایی، كە ماوەیەكی یەكجار زۆرە مێشكی موسولٚمانانی داگیر كردووە و بەمەش دوچاری ئەوەبوو كە تێڕوانینی

گەردوونیانەی مرۆڤی موسوڵمان بشێوێنێ و تاڵە هەودا مەعریفی و کۆمەڵایەتییەکانی بپچڕێنێ و دواجار ڕووبەڕووبوونەوەی لێ بکەوێتەوە لە نێوان زانایان و دەسەڵاتداراندا و بەوەش کۆتایی بێت کە زانایان دابڕێن و دەسەڵاتدارانیش بیریان لێڵ و لیخن ببێت، سەرەنجام هەریەکە لەو دوانە — زانایان و دەسەڵاتداران— توشی شکستی هاتن لە پەیبردنیان لە پێشهاتەکان و خستنە ڕووی جێگرەوە و چارەسەرەکان.

ئەم دەستەپاچەبوونە مەعریفییە وایکرد کە هەریەکە لەو دوو گرۆیە پەنا ببەنە بەر چەکی ترساندن و تۆقاندن، لە ڕووە هزریەکەیەوە لەلایەن زانایانەوە و لە ڕووە مادی و جەستەییەکەیشیەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، تا وای لێهات ترساندن و تۆقاندن و توند و تیژی کرانە هۆکارێکی سەرەکی سەرکردە سیاسییە هزرییە لاوازەکان بۆ جڵەو گرتنە دەست و فەرمانڕەوایی کردنەکەیان و ڕێگرتن لە بەیەکجارەکی داڕمانی کۆمەڵگە و لافاوی ئاژاوەگێڕی و سەرتاسەریانە، هاوکات ترساندن و تۆقاندن و ستەمکردن و گەندەڵیی بوون بە هۆکاری سەرەکی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە تایبەتە دەستەوتاقمگەراییەکان، ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە وای لە موسوڵمانان کرد کەسێکی نەرێنی و کەسایەتییەکی کۆیلانەی هەبێ و دواتریش بتوانرێ کە کۆتایی بە لایەنە هەموارە ماکیەکەی موسوڵمان بێت، بەدوای ئەویشدا بتوانرێ کۆتایی بهێنرێ بە ڕۆحی جێنشینبوونی موسوڵمان و سەرەڕای پووکانەوەی ئارەزووی فێربوون و چەماندن(تسخیر)ی سرووشتدا، داهێنان لە ناخیداو لە هەڵسوکەوتی ژیانی رۆژانە و هزریدا. تاکو واقعی ڕاستەقینەی ژیانی مرۆڤی موسولمان بەوجۆرە نەرێنی و دواکەوتویی و لاواز و لێك هەڵوەشاو و پەروێز خراو بێت، کە ئەمڕۆ تیایەتی.

نموونەگـەلێکی پیـاوانی وەکـو (ئـیبن حـەزم) و (ئـیبن تەیمیـە) و (ئـیبن خەلدون) نموونەی زیندووی ئەو کەسە بەتوانایانەن کە شـارەزای تـەواوبوون لە زانستی سرووش و دەق و زانسـتی سروشـت و سـوننەتە گەردوونیـەکان و رووداوەکن(گـەردوون) هاوکـات ئـەوان بـە رەوتێکـی پرۆگرامیانـەی رۆشـن و دامەزراو هەنگاویان ناوە، بۆیە توانیان میرات و شوێنەوارێکی گـرنگ لـەدوای خۆیان بەجێ بهێڵن سەرەرای ئەوەی کە لەلایـەنی هـزری ئوممەتـەوە رومـاڵ نەکراون و پـەراوێز خـراون، ئەمانـە بەڵگەیـەکی زینـدوی ئـەزموونی زانکـۆی ئیسـلامی جیهـانی مـالیزین، بەمەبەسـتی دروسـتکردنی رەوتێکـی پرۆگرامداریانـەی گشـتیانەی هاوچـەرخی وا کـە کاربکـات بـۆ نوێکردنـەوەی عـەقڵی موسـوڵمان و بەدەستخسـتنی مەعریفـەکان و بەدیلـە مرۆییـە رێ نیشاندەرەکان، لەسەر بنەمای بەهاکانی سرووش و مەبەست و ئامانجەکانی، بۆ رووبەڕووبوونـەوەی ئـەم سـەردەمە و نوێکردنـەوەی ژیـار و شارسـتانێتی مرۆڤایەتی و ئیسلامەتی و بوژاندنەوەیان.

بە گرتنەخۆی راستەقینەی زانکۆ و فێرگە هزرییەکان، بیر و بۆچوونی کەسانی وەکو ئەمانە و گیانی پرۆگرامی بیرخوازانەیان دەبێتە فێرگەی نوێ و رۆشن بەخش وە رۆڵیان پێ دەدرێتەوە لە بووژاندنەوەی ژیاری ئیسلامی، ئەم جۆرە هەوڵ و رادۆزییانە تەنها وەك تروسکە و قسەڵۆکی هەرەمەکییانە تەماشا ناکرێن لە ئاسۆی ئاسمانی هزری ئیسلامیدا، بەڵکو تا ئێستاش بەوپەڕی ڕوونییەوە رۆشنایی وتاریان لە ئاسمانی زانست و هزر و مەعریفەدا دەدرەوشێتەوە، بۆیە نە ئاوا دەبن و نە خامۆش دەبن، وە پرۆگرامە گشتی و زیندووەکەی ئەم رادۆز و زانایانە و پەراوەکردنی کردارییانەیان بەو

پرۆگرامە، ئەوەیە کە راڤەی گەورەیی توانا و وزەی مەعریفی و رادۆزیان دەکات، لە چوارچێوەی دۆخە جێگەیی و کاتییەکەی چاخی خۆیاندا.

وانـەی بەسـوود ئەوەیـە کـە توێـژەری موسـوڵمان، کاتێـك لـەم سـەردەمەی خۆماندا رووبەرووی تێگەشتنی نەرێنی و کارێکی گرنگی وەکـو یاسـای سـزادانی ئیسلامی دەبێتەوە لەگەڵ هەڵوێستی زۆرینەی ئوممـەتی ئیسـلامی لەسـەری، وە چارەسـەری ئـەوە و تێروانینـی ئیسـلامیانەش لەمەڕیانـەوە، دەبێـت هـەڵقوڵاوی پرۆگرامێکی هزری سەرتاسەرییانەی تەواو دامەزراوی مەعریفەی ئیسـلامی بێـت، چونکە ئەم هزر و پرۆگرامە، یەکانگیریـەکی تـەواوی ئـەو هـزر و پرۆگرامەیـە کـە شـــیاوە بـــۆ ئـــەوەی لـــە روانگەیـــەوە بروانرێتـــە دۆزە هزرییـــە ئیســـلامییە هاوچەرخەکان و گرفت و کێشەکانی، هەر لەو بابەتانەش دۆزی جـێ بـەجێکردنی مەبەسـتەکانی رژێمـی سـزادانە ئیسـلامیەکانە، لەگـەڵ چـۆنێتی بـەجێهێنان و هێنانـە دی ئامانجـەکانیان بـەبێ سـەرکوتکردنی مرۆڤـ و نەبێتـە هـۆی متمانـە لەدەسـتدانی بەرامبـەر بـەخۆی و ماکەکەی(فیترەتەکـەی)، هـەروەها بـەبێ بڵاوکردنـەوەی هەسـتی تـرس و تـۆقین لـە نـاخی خۆیـدا، وە دواجـاریش بـەوە کۆتایی نەیەت کە مرۆڤ بـە ناچـاری بکاتـە ملکـەچ و کۆیلەیـەکی ترسـاو و نەبنـە ئـەو مرۆڤانـەی کەلەبنەرەتـدا خـودا بـە ئـازاد و شـکۆدار دروسـتی کـردوون بـۆ ئەوەی شوێن ڕێگەی راسـت و رێنمـایی دروسـت و بـەجێ بکـەون و بەباشـی کـار وئەرکی خۆیان راپەرێنن.

## له بیرکردنه‌وه له (کێشه‌کانی نیشته‌جێبوون) ه‌وه بۆ گه‌یشتن به تێڕوانینێکی نوێی یاسای سزادانی ئیسلامی:

په‌ره‌پێدانی بینای زانکۆی ئیسلامی جیهانی له (کوالالامپور) ی پایته‌ختی مالیزیا و ئه‌و پلانه تۆکمه‌یه‌ی که به‌دوایدا هات بۆ دامه‌زراندنی ئه‌و زانکۆ تازه‌یه له که‌ناری شاری (گۆمباك) ئه‌زموونێکی سه‌رکه‌وتوو بوو له رووی بنیاتنانی زانکۆیه‌کی ئیسلامی جیهانیدا، له چوارچێوه‌ی شارێکی زانکۆییدا، به‌مه‌به‌ستی هێنانه‌دی نیاز و مه‌به‌ستێك – له‌وه‌ی که هاته‌دی– که چاندنی به‌ها بالأکانی ئیسلام بوو له ناخی فێرخوازه‌کانیدا له ڕێی خانووی نیشته‌جێکردنیانه‌وه، له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ی که نیشته‌جێبوون له شوێنێکی نزیکی زانکۆکه‌دا له‌م شاره زانکۆییه‌دا پێویستیه‌کی گرنگی فێرخوازه موسوڵمانه‌کانی زانکۆکه‌یه، به ره‌چاوکردنی ئه‌و بارودۆخه‌ی مالیزیا و ئه‌و شوێن و ده‌ستکه‌وتانه‌ی که به‌رده‌ستن و له توانادان بخرێنه گه‌ڕ، بۆ هێنانه‌دی ئه‌و مه‌به‌سته.

یه‌کێك له‌و شتانه‌ی که که‌س لاری نه‌بووه له کردنی، دارشتنی باشتری سستمی شیاو بوو بۆ فێرخوازه‌کان وه‌ك پێویستیه‌کی نیشته‌جێبوون و ئارامی و حه‌وانه‌وه‌یه‌کی هێمنانه‌ی وا که به‌ها ره‌وشتییه ئیسلامییه‌کان به‌رجه‌سته بکات له شێواز و رێگاکانی چاودێری و به‌رێوه‌بردنی نیشته‌جێکردنی فێرخوازه‌کاندا و ئه‌و ژوور و باڵه‌خانانه‌ی بۆیان دروست ده‌کرێت، وه بۆ ئه‌نجامدانی ئه‌م کاره و دروستکردنی زانکۆیه‌کی ئاوا، پێویست بوو که زۆر به‌باشی په‌ی ببرێت به‌به‌ها ئیسلامییه‌کان و تێگه‌یشتن له سروشتی پێویستییه مرۆییه‌کان و دۆخی شوێنی نیشته‌جێ بوون و گه‌لێك

شتی تر تا دەگات بە چارەسەر کردن و شیکردنەوەی بیرۆکەکان، بەو نیازەی کە باشترین خزمەتگوزارییان پێشکەش بکرێت بە کەمترین تێچوون و خەرجی.

جێگەی سەرسامییە کە کاری شیکردنەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتییانەی سروشتی ڕەوشتە مرۆڤایەتیەکان، کە ئەنجام درا وەك پێویستییەکی پێشدەستییانە بۆ تەواو کردنی ئەم پرۆژەیە –بەبێ مەبەست– بەرەو تێروانینێکی نوێی بردن سەبارەت بە مەبەستەکانی یاسا دانانی ئیسلامی دەربارەی سزا ئیسلامییەکان واتە (دەقەکان) و حیکمەتی گەواهی دانی چوار کەس لە تاوانی زینادا و حیکمەتی سزادانی گەواهی دەرەکان ئەگەر لەوە کەمتر بوون و واجب بوونی گۆڕینیان و دواتر جیاوازی کردن لە نێوان تاوانە رەمەکیەکان (جرائم الغرائز) و تاوانەکانی دەستدرێژی کردنە سەر سامانی خەڵکی و خوێنڕێژی.

توێژینەوە و شیکردنەوە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکە بوە هۆی زانین و دۆزینەوەیەکی ئەوتۆ کە وردە باسی تری بەدوای خۆیدا هێنا، تاکو وای لێهات ناچار بین تیشکێکی بخەینەوە سەر دەقە شەرعییەکان و زیاتر رەهەندەکانیان روون بکەینەوە و پێگە و بەڵگەداری و مەبەستەکانیان وردتر بکەینەوە، وە وای لێکردین کە تێروانینێکی مەعریفیانە بخەینە کار، کە جاری جاران ئەم دەقانە تەنها لە بازنەی یاسایی و زمانەوانیدا دەگوتران و دەگوترانەوە، بەمەش گەیشتینە ئەو راستییەی کە ئەم دەقانە رانەگیراون، واتە پێویستە دەقاودەق وشە بە وشە قەبوڵ بکرێن، چونکە نهێنی و حیکمەت شاراوەکانی ناویان نەدەزانرا، بەڵکو هەموو ئەوەی کە لەتوانای

توێژەردا بوو ئەوەبوو کە خەملاَندن و دەلالاتی گشتی لەبەردەمیدا لەسەر یەك کەڵەکە بکات، وێرای چەندین پرسیاری وا کە هیچ وەلاَمێکی دڵنیابەخش و دیاریکراویان نەبوو، بۆیە بواریان بۆ چەمك و هەستەکان وا رەخساندبوو کە ئەم دەقانە، مانایەکی کردارییانەی راستەقینەیان نیە و هیچ شتێکی گرنگ لە ناوەرۆکیاندا بەدی ناکرێ، بۆیە ناکرێ وەك دەقێکی یاسایی و راستەقینە تەماشا بکرێن، بەلاَم دواتر دەرکەوت کە پێچەوانەکەی راستە و ئەمانەش دەقێکی راستەقینەن و یاساکانی ژیانێکی سەرکەوتووانەن، نەك هەرەمەکییانە، وە ئامانجیشان دەستەبەرکردنی دلنیایی و ئارامی و ئاسایش کۆمەلاَیەتییە، بەجۆرێکی دوور لەو هەستی تۆقین و ترساندنەی کە تێڕوانینە تەسکە زمانەوانییەکەی پێشووتری یاسای سزادان دەینواند.

## تەواوکاری سەرچاوەکانی مەعریفەی ئیسلامی لە سرووش ( دەق ) و گەردوون ( ژیری و ماك و یاساکانی ژیان و رووداوەکان ) دا :

ئەو خاڵەی ئەم توێژینەوەیە پێی گەیشتووە، سەبارەت بە تێروانینی دەروونی و کۆمەلاَیەتی بۆ دەقەکان، بریتییە لە بەرهەمی تەواوی و کامڵی مەعریفەکانی سرووش و سروشت کە بەشێوەیکی کردارییانە واتای موسوڵمانێتی مەعریفە روون دەکاتەوە، لەگەڵ واتای تەواوکارییانەی مەعریفەکانی سرووش و گەردوون.

کێشەی یەکەم لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە دەبێت بەپێی پلانی نیشتەجێکردنی فێرخوازەکان و ژمارەیان لە هەر ژوورێکدا چۆن بێت، بەتایبەتیش لە کاتێکدا وا باو بووە لەم جۆرە زانکۆیانەدا کە هەموو

خزمەتگوزارییەکان پێشکەش بکرێت بەشێوەیەکی گشتی، کە لە زانکۆکانی تردا وا نیە، دانانی ژمارەیەك فێرخواز لە یەك ژووردا –ئەو کارە بوو کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك– خوێندکارەکانی بێبەش کرد لەو تایبەتمەندییەی کە هەریەکەیان پێویستیانە لە رووە مرۆییەکەیەوە و وای کرد کە زوربەی جاران هاورێیەتیکردنی ئەو فێرخوازانە لەو ژوورانەدا ببێتە گۆڕەپانی ناکۆکی و ململانێ.

بۆ تێگەیشتنی زیاتری واتای ئەو تەواوکارییەی کە مەبەستمانە قسەی لەبارەوە بکەین، وا باشە باس لەو هەنگاوانە بکەین کە جێبەجێ کران و چۆن ئەوەش بوو بە هۆی بەرپابوونی تەواوکارییەکە و چۆنیش گەیشتنە ئەو چەمك و تێڕوانینە جیاوازانەی لە ئەنجامی چەمك و مەعریفە کۆمەڵایەتییە دەروونییەکانەوە سەریان هەڵدابوو.

هەر لە سەرەتاوە کە دەستم کرد بە شیکردنەوەی بارودۆخە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکەی ژووری فێرخوازەکان، لە ڕووی دۆخی ژمارەی ئەو فێرخوازانەی کە لەیەکتری جیاوازن و لە هەمان ژووریشدا دەژین، بەبەراورد لەگەڵ ئەو تاکە فێرخوازەی کە سەربەخۆ بە تەنها لە ژوورێکی خۆیدایە ئەوەیانم هەر لەسەرەتاوە بەباشتر زانی.

وە بەوردبوونەوەی زیاترم لە شیکردنەوەکەمدا لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونیەوە بۆم ڕوون بوەوە کە ئەوە چارەسەرە نموونەییەکە نیە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی سەرجەم فێرخوازەکان، بۆ نموونە لە ڕووی ئابورییەوە، لە وڵاتێکی وەکو مالیزیادا، دەوڵەت ئەرکی فێربوونی فێرخوازان لە ئەستۆ دەگرێت بۆیە لە رووی ئابووریەوە دانانی ژووری تایبەت بۆ

هەریەکە لە خوێندکاران کارێکی گرانە بە رەچاوکردنی ئەوەی کە ژمارەی فێرخوازەکان زۆرە، ئەوەی بەلامانەوە زۆر گرنگ بوو، ئەوەبوو کە دابینکردنی ژووری سەربەخۆ بۆ هەریەکەیان کارێکی باش نیە لە رووی دەروونی و کۆمەلأیەتییەوە، چونکە فێرخواز –بەتایبەتی– لە قۆناغە بەراییەکانی خوێندنی زانکۆیی، یان قۆناغی یەکەمی (بەکالۆریۆس) دا هێشتا تەمەنی زۆر نیە و وا راهاتوە کە هەموو پێداویستییەکانی لەلایەن خێزانەکەیەوە بۆ دابین بکرێ هەر لە خواردنەوە تا پۆشاك و پێویستییەکانی تریشیەوە تا ئێستاش هەر ئەم قۆناغە بە قۆناغی دابران لە کەسوکاری دەزانێت و لەم قۆناغە تازەیەی ژیانی خوێندنیدا دەکەوێتە بارێکی دەروونی و گوشارەوە، چونکە لەناکاو خۆی لەبارێکی وادا دەبینێتەوە کە ناچارە هەر خۆی مشووری کاروباری خۆی بخوات هەر لە خۆراك و پۆشاکیەوە تا سەرجەم کاروبارە رۆژانەکانی تری ژیانی، دوور لە ژینگەکەی و خێزانەکەی، هاوکات پێ دەنێتە قۆناغێکی تازە و نامۆی خوێندنیەوە، لە رووی زانست و فێربوونەوە، بەجۆرێکی وا کە ئەم قۆناغە زۆر جیاوازترە لەوەی جاری جاران کە تیایدابوو، وە هۆگری بوبوو، لە رووی شێواز و داخوازییەکانیشیەوە.

لەبەر ئەوە ژووری تاکە کەسی و سەربەخۆ و دابڕاو کارێکی باش نیە بۆ خوێندکارێکی ئاوا، کە لەو بارودۆخەدایە، چونکە هۆگربوونی بە هاوڕێکانی و تێکەلأوبوونی و بەشداربوونی پێکەوەییان لە ژووری نیشتەجێبووندا زۆر کارێکی باشترە و چاکتر دەروازە بەروویدا دەکاتەوە بۆ بەگەر خستنی توانای خۆگونجاندنی لەگەلّ ژینگەکەیدا، زۆر بەئاسانی و بەخێراتر و چاوکردنەوەی بۆ سەربەخۆبوونی و پشتبەستن بە خۆی و لەم ژینگە تازە و

نامۆ و پڕ لە داخوازی و ئەرکەدا، کە جیاوازترە لەو ژینگە خێزانییەی پێشتر لەگەڵی ڕاهاتبوو، ئەمە لێرەدا وەکو کەسێك وایە کە خۆشەویستێکی کۆچی دوایی کردبێ، خەڵکەکەش لەدەوری دەمێننەوە و دڵنەوایی دەکەن، بۆ ئەوەی بەتەنها نەمێنێتەوە و دەست نەداتە گریان و خەمخۆری، ئەم پێکەوەبوونەیان لەهەمان ژووردا خەمی دوورە وڵاتییان زۆر کاڵتر دەکاتەوە.

لەوانەیە ئێستا یەکێك لە ئێمە وا بەبیریدابێت کە بوونی دوو فێرخواز لە ژوورێکدا چارەسەرێکی زۆر باش بێت، کەچی دوای لێوردبوونەوە بۆمان دەرکەوت کە بەپێچەوانەوە ئەمەشیان باش نیە، بەتێروانینێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەروونی و ڕەوشتییەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەم چارەسەرەشیان هەر شیاو نیە، لەگەڵێك ڕووەوە، بۆ نموونە لە ڕووی ئابووریەوە ئەو ژوورە هەر هەمان خەرجی تێ دەچێت، لەمەش گرنگتر لەڕووی ڕەوشتییەوە بوونی تاکە دووکەس بەتەنها لە ژوورێکدا هاندەرە بۆ ڕوودانی هەندێ لادانی ڕەوشتی، گەرچی ئەمەیان زۆر دەگمەنە و مەرج نیە ڕووبدات، بەلام کێشە سەرەکیەکە لەم بارەدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دەروونییە، ئەم کێشەیەش لەوەدا خۆی حەشارداوە کە کاتێك ناکۆکیەك بکەوێتە نێوان ئەم دوانەوە، چونکە کەسێکی تر –واتە لایەنی سێیەم– لەوێ نیە، تاکو ناوبژیوانییان بکات و ئەو ناکۆکیە ئاسانتر بکات، کە جارێك لە جاران لە نێوانیاندا هەر ڕوودەدات، چونکە دوو هاوڕێ لەیەك ژووردا هەر دەبێ جۆرە زیزبوونێك بیانگرێتەوە، ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، کەسی سێهەم ئەگەر هەبێت دەتوانێت ئاشتیان بکاتەوە بەبێ ئەوەی هیچ کامیان تاوانباربکات و شەرمەزاریان بکات.

کەواتە ئێستا وا دێ بە بیرماندا کە بوونی سێ کەس لە ژوورێکدا چارەسەرێکی نموونەییە، کەچی لەراستیدا ئەمەش هەر راست نیە، چونکە ئەم چارەسەرەش لەهەندێ ڕووەوە کەم و کورتی تێدایە، چونکە بەشێوەیەکی گشتی سروشتی مرۆڤ وایە کە ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون ئەوا ئەم پێکەوەبوونەیان هاندەرە بۆ ئەوەی کە دوانیان نێوانیان خۆشتر بێ و پەیوەندیان تۆکمەتر بێت لەنێوان خۆیاندا و بەم کارەش کەسی سێهەم جۆرێك لە پەراوێزبوون و دابڕانی پێ دەبڕێت و دەبێتە نێچیری دوانەکەی تر بۆ چرپە و سرپەسرپی نێوانیان، بەمەش بارێکی دەروونی دابڕانی توند دایدەگرێ، هەر بۆیە پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر) نەهی دەکات لەو چرپاندنەی کە دوو کەس لە نێوان خۆیاندا دەیکەن لەبەر چاوی کەسی سێیەمدا.

دیارە ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات کە بیرۆکەی پێکەوەبوونی چوار کەس لە ژورێکدا دابنێین، جێی سەرسامیە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمەیان چارەسەرێکی نموونەییە، کەکەمترین بڕە بۆ ئەوەی کارلێکی کۆمەلأیەتی و دەروونی تەواو لەنێوانیاندا بێتە دی، یان دەکرێت بلێین ئەمە کەمترین سنوورە بۆ کۆمەڵگەیەکی مرۆیی تەواو، بگرە منالّ بوون و منالّ خستنەوەش ڕوونادات —بەبێ دووبارەبوونەوەی یەکێ لە دایك و باوکان— بەبێ بوونی چوار هاوسەر، کەدوانیان نێر و دوانیان مێ بن.

ئەوەش روون و دیارە، کە پێکەوە ژیانی چوار کەس، هاورێیەتیەکە ئەو لایەن خراپ و ناهەموارانە دەشارێتەوە کە پێشتر باسمان کردن و گەلێك سوودی هەموار و بەجێ دێنێتە کایەوە لەرووی کۆمەلایەتی و دەروونیەوە،

دەشزانێت کە ئەگەر دوو کەس لە چوار کەسەکە بۆ کاروبارێك گونجاو و هاوبیر بوون و پەیوەندییان پێکەوە تۆکمە کرد، ئەوا دەبینین کە لەملاوە دوانەکەی تریش وەك لایەنێکی پێشبرکێ و پڕکردنەوەی کەلەبەر و وەڵامدانەوەی بەرامبەریان دەستدەکەن بە تۆکمە کردنی پەیوەندیەکانیان، زۆربەی جاریش بە تێپەڕبوونی کات وردە وردە هەر چواریان دەگەنە بارێکی کارلێکی کۆمەلایەتییانەی هاوسەنگ و گشتی و هاورێیەتییەکی چوار قۆڵی، هاوکات ئەگەر هەر ناکۆکی و نەگونجانێکیش لە هەریەکە لەوانەدا بەرپا بوو ئەوا لایەنەکەی تر هەیە و ئامادەیە بۆ کارئاسانی ئاشتکردنەوە و ناوبژیوانی و کاڵکردنەوەی ململانێ و ناکۆکیەکە و دووبارە دانووپێکەوە کولاَندنیان و ئاوڕابەستنەوەی هاوبەشیان بەهەمان جۆگای نێوان لایەنە ناکۆکەکاندا و ئاساییکردنەوەی دۆخەکە...

### یاسای سزادانی ئیسلامی

### ( دیدگەیەکی ئیسلامی زانستی کۆمەڵایەتییانە ):

لەڕێی ئەم گیرۆدەبوون و قووڵبوونەوە هزریەمانەوە بەمەبەستی گەیشتن بە دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ کێشەی نیشتەجێبوونی فێرخوازان و رەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی و کارلێکی کۆمەلایەتیانەی نێوان تاکەکانی کۆمەلە مرۆڤەکان، لەناکاو هاوگونجاندنی چوار کەسی خۆی سەپاند بۆ پێکهێنانی هەر دەستەیەکی نیشتەجێ لەو ژوورانەدا، کە لە ڕووی دەروونی کۆمەڵایەتیشەوە شیاوترینە، وە واش بەخەیالمدا هات کە ئەم شیکردنەوەیە بخەمە بەر چاوم ــ ئەمەش بەشێوەیەکی خۆرسکانە بەبێ دەستی ئەنقەست

ـ كە بوە هۆكارێك بۆ ئەوەی تیشكێكی نویێ بخەمەوە سەر دۆزی مەرجی هەبوونی چوار گەواهیدەر لەكاتی بریاردان لەسەر جێبەجێكردنی سزا بۆ ئەو كەسانەی زینا دەكەن، ئەمەش لە رووی دەروونی و كۆمڵایەتییەوە وروژا.

ئەوە بوو لە شیكردنەوەی پێشووتردا بینیم كە دانانی ژمارە چوار بۆ ژمارەی گەواهیدەرەكان شتێكی هەرەمەكی نەبووە، وە لەخۆوە ئەو ژمارەیە دانەنراوە، بەڵكو پێكەوەبوونی چوار كەس لە ڕووی دەروونی و كۆمەڵایەتییەوە بوو بە شتێكی ڕاست و بەڵگەنەویست، وە هەر ئەمەش وای لێكردم كە سنوورێك دانێم بۆ ئەو پرس و پرسیارانەی دەكرێن سەبارەت بە مەرجی هەبوونی چوار گەواهیدەر بۆ ئیسپاتبوونی كەتنی زیناكردن وە سزادانان بۆ گەواهیدەرەكان ئەگەر لە چوار كەس كەمتر بوون، یان گەواهی دانەكەیان هەرهەموویان پێكەوە راشكاوانە و یەكلاكەرەوە نەبوو مەبەستیش لەمە ئەوەیە كە سزا لەخۆوە پەیڕەو نەكرێ — بەشێوەیەكی دیاریكراویش مەبەستەكە ڕێگرتنە لە برینداركردنی هەستی خەڵكی و سووكایەتی پێنەكردنیان و تۆمەت پاڵنەدانیان وە رێگرتن لە بڵاوبونەوەی گەندەڵی و بەدكاری و داوێنپیسی لەناو كۆمەڵگەدا، لەبەر ئەوە سزاكە لەبەر خودی كارە درزێوەكە نیە، ئەگەر نا دەبێتە هۆیەك بۆ سووكایەتی پێكردن و ناوزڕاندن و بڵاوبوونەوەی بەدكاری، هەرچی كۆنترۆڵكردنەوەی تاسە و حەز و ئارەزوە خراپەكانی دەروونیشە، بەخۆیان و فریوەكەیانەوە، ئەمەیان لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە و زاڵبوون بەسەر پاڵنەرە ماكییە چاكەكاندا تا بەشێوەیەكی رەوا داخوازییە دەروونییەكان دەستەبەر بكەن و گەشە بە دەروون بدەن.

## واتای کۆمەڵایەتی بۆ گەواهیدانی چوار کەس:

گرنگییەکە لێرەدا لەوەدایە، کاتێك دەڕوانمە ئەم ئەنجامانەی کە لە ئەنجامی کرداری شیکردنەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە بەدەستم هێناون، کاتێك کە دەستم کرد بە توێژینەوە لە شوێنی نیشتەجێبوونی فێرخوازان لە شارێکی زانکۆییدا، ئەم توێژینەوەیەش دەروازەیەکی ڕۆشنی بە ڕوومدا کردەوە بەوەی کە ژمارە چوار دەلالاتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی تایبەت و گرنگی هەیە،ئەویش ئەوەیە کە چوار کەمترین بڕ دەنوێنێ بۆ بەرپابوونی کارلێکی کۆمەلایەتیانەی مرۆیی تەواوکارانە، ئەمە سەرەرای ئەو هەموو خەسڵەتانەی تیایەتی لە هاوسەنگی کۆمەڵایەتی و تێرکردنی پێویستییە مرۆییەکان، واتە ژمارە چوار کەمترین سنوور دەنوێنێ بۆ کۆمەڵگەیەکی تەواوکار و کارلێکە هەموارەکانی، هەر لەبەر ئەوەیشە کە کەمترین سنوریش بۆ سەلماندنی تاوانی زینا و داوێن پیسی هەر چوار کەسەکە، کە دەبنە گەواهیدەر، وە گەواهیەکی روون و راشکاوانە و یەك دەنگ و یەکلاکەرەوە دەردەبڕن، چونکە گەواهیدانی چوار کەس واتە بەچاو بینین لەلایەن ئەو چوار کەسەوە، بەچاو بینینی چوار کەسیش وەك ئەوە وایە هەموو کۆمەڵگە بە گشتی بەچاوی خۆیان بینیبێتیان، چوار کەس بچوککراوەی کۆمەڵگە گەورەکەیە و دەتوانین پێی بڵێین کەمترین سنوورە کە دەکرێت ناوی بنێین کۆمەڵگە، نەك ژمارە سێ، یان ژمارەیەکی تر، وە نەك ژمارە پێنج یان ژمارەیەکی گەورەتر.

لەم شیکردنەوەیەوە و لەو گوزەر کردنەی کە شیکردنەوەکە دەمانبات بەرەو درککردن بە بەڵگەی گەواهیدانی چوار کەس، بۆمان ڕوون دەبێتەوە

که ژمارەکە ژمارەیەکی هەڕەمەکی نیە، بەڵکو ژمارەیەکە، کە دەلالاتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە، وە پێوەریش لەم ژمارەیەدا وا وەردەگیرێت کە کارە دزێوەکە بە ئاشکرا و بەبێ پەردە لەبەرچاوی کۆمەڵگەدا ئەنجام دراوە و ئەمەش بە ئاشکرا بڵاوکردنەوەی بەدکاری و بەدڕەوشتییە و دژایەتیکردنی خواست و ئازادیەکانی کەسانی ترە، وە دەستدرێژیکردنە سەریانە، وە خۆیان و منداڵەکانیان، بەبێ ئەوەی کە بەخواستی خۆیان بوبێت بوونەتە نێچیری لادەر و بەدکاران، خودای گەورەش دەفەرموێ: ﴿لَا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾ (**النساء: ١٤٨**)، هەروەها لە (عیبدەی کوری صامتەوە) (خوای لێ رازی)) کەبەشداری جەنگی بەدر بوو، یەکێك لە پیاوماقووڵە هەڵبژێردراوەکانی (عەقەبە) بوو، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) —کۆمەڵێك هاوەڵیشی لەوکاتەدا لەدەور بوو— فەرمووی: (پەیمانم بدەنێ کە هیچ شتێ نەکەنە هاوەڵی خودا، وە دزی نەکەن، وە زینا نەکەن، وە منالەکانتان نەکوژن، وە هیچ تۆمەتێك بۆ یەکتری هەڵ مەبەستن لە نێوان دەستەکانتان و قاچەکانتاندا، وە کەمتەرخەمی لەچاکەکاریدا مەکەن، هەر کام لە ئێوە ئەوانەی کردوو گوێڕایەڵم بوو، ئەوا پاداشتەکەی لای خودایە، وە هەرکەسێکیش یەکێك لەوانەی کرد —واتا تاوانەکان— ئەوا لە دنیادا سزا دەدرێ، ئەوەش کەفارەتەکەیەتی، وە هەرکەسێکیش یەکێك لەوانەی کرد و خوداش بۆی

پۆشی، ئەوە لای خودایە، ئەگەر خودا ویستی ئەوا لێی دەبورێ، وەئەگەر ویستیشی ئەوا سزای دەدات)، ئێمەش پەیمانمان پێدا لەسەر ئەوانە[1]، بەلاَم سزای ئەو گەواهیدەرانەی کە ژمارەیان لە چوار کەس کەمترە، ئەگەر سیان بن و گەواهیدانەکەشیان راشکاوانە و یەکلاکەرەوەش بێ، هێشتا ئەمە لە خودی خۆیدا بۆ کارە دزێوەکە نیە، بۆیە هەر دەبێ شتەکە بەبەشداری کۆمەڵگە بێت، وە کەمترین سنووریش ئەوەیە کە ژمارەیان چوار کەس بێت، هەر وەکو ڕوونیشە کە چارەنوسی ئەو گەواهیدەرانەی لە چوار کەس کەمترن سزادانە، چونکە سەرەتا ئەوان بوون کە هەواڵەکەیان زڕاند لە جیاتی ئەوەی پەردە پۆشیان بکردایە، هەر ئەوانیش بوون کە ئەم تێوەگلان و فریوەیان یان ئەم هەڵەیەی ئەو کەسانەی خلیسکان لە ئاستی ئارەزوە خراپەکانی دەروونیاندا ئاشکرا کردوو تاوانە شاراوەکەیان کرد بە مایەی بەرپابوونی پەشیمانی و سەرزەنشتی و تەوبەکردن و تەمێ دادان، بۆ ئەوەی کە کارە دزێوەکە ڕابگەیەنن و بیکەنە هۆکاری سووکایەتی کردن بە تایبەتمەندیەکانی مرۆڤەکان و بۆسەدانان بۆ خلیسکانیان و بلاَوکردنەوەی بەدکاری و گەندەڵی لە کۆمەڵگەدا، لەبەر ئەوە ئەو گەواهیدەرانەی لە چوار کەس کەمترن، ئەوانەن کە خۆیان ناوەتەوە لە کەمیندا بۆ ئەو شتانەی کە هەڵە و تاوان و خاڵی لاوازن لە کەسەکاندا و لە بازنەی تایبەتەوە دەیانگوازنەوە بۆ بازنەی سووکایەتی و ناوزڕاندن و بلاَوکردنەوەی بەدکاری، تا بەم جۆرە بیانخەنە ناو بازنەی گشتی کۆمەڵگەوە، ئەمەش ئەو کارەیە دەبێتە هۆی ئەوەی

[1] بوخاری گێراویەتەوە لە (صحیح)ەکەیدا –کتاب الإیمان– فەرموودەی ژمارە (١٨)

گەواهیدەرەکان شایستەی گلەیی و گازندە بن، لەبەر ئەوە نابێ بیرمان دابڕێ لە بەڵگەی گەواهیدانی چوار کەسی، کە گەواهیدانێکی ڕاشکاوانە و یەکلاییکەرەوەیە، نە گومانیانە و نە گریمانیانەیە، بەڵکو گەواهیدانێکی چوار قۆڵییانەیە و بەسە بۆ سەلماندن و دەرخستن و بڵاوکردنەوەی کەتنە گەورەکە کە زینایە، چونکە ئەگەر سزاکە لێدانی دار بێ یان بەردبارن کردنەکە لەبەر خودی کارەکە بوایە و کارەکەش هەر تاسە و حەزێکی دەروونی کەسەکە بوایە، ئەوا گەواهیدانی دوو کەس بەس بوو، وە هاوشێوەکانی ئەو تاوانەش هەر بەهەمان شێوە بە سەلمێنەری کارەکە لەقەڵەم دەدران، هەروەك چۆن لەتاوانەکانی سامان و خوێن ڕشتندا ئەوە پەیڕەو دەکرێ ئامانجەکەش ڕێگرتنە لە ڕوودانی کارەکە و دووبارەنەکردنەوەی.

لەبەر ئەوەش بوو کە (عومەری کوڕی خەتاب –خوای لێ ڕازی–) بۆ سەلماندنی تاوانی زینا بە جۆرێك کە ڕاشکاوانە و یەکلاکەرەوەش بێ، تەنها بە بوونی سێ گەواهیدەر بڕیاری نەدەدا، چونکە گەواهیدانی کەسی چوارەم گەواهییەکی بینەرانە نەبوو بەڵکو لە ڕاستیدا نیشانەکانی زینا بووە گەر لەژێر تیشکی سێ گەواهیدەرەکەی تردا سەیری بکرابا، بۆیە هەر دەبێ چوار گەواهیدەر هەبێ و ڕاشکاوانە و یەکلاکەرەوەش بن و ببنە هۆی دەرخستنی نیازی ناوزڕاندن و دانەپاڵەکە و بڵاوبوونەوەی پروپاگەندەکە بە شێوە ڕاستەکەی، بەوەی کە بە دڵنیاییەوە تاوانی لەو جۆرە لەنێوان موسوڵماناندا ڕوویداوە، ئەگەرنا سزایەکی سەخت هەیە بۆ ئەو کەسانەی حەز دەکەن گەندەڵی و بەدکاری و داوێنپیسی لە ناو باوەڕداراندا بڵاوبێتەوە، خودا

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (النور: ١٩) هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ:﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ. إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور: ٤—٥)، هەروەها دەفەرموێت:﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ **(آل عمران: ١٣٥)**

## چۆن پێویستییە خۆماکەکانی مرۆڤ ئاراستە و ڕێنمایی ڕەفتارییانە دەکرێن؟

پرسیارەکەش ئەوەیە: چی دەربارەی کارە دزێوەکە هەیە؟ وە چۆن ڕووبەڕووی ببینەوە؟ وەچۆن کۆمەڵگەش ئاراستە بکەین بۆ خۆلادان لەم کارە دزێوە؟

بۆ ئەوەی هەست بە مەبەستەکانی سستمی سزای ئیسلامی بکەین بۆ ئەم تاوان و کارانە زۆر گرنگە سەرەتا ئەوە بزانین کە ئەم تاوانە قێزەون و سووکە پەیوەستە بە ئارەزوو و حەزی دەروونی مرۆڤ و ماك و ڕەمەکیەکانیەوە و هاوکات دەبێ مرۆڤەکان ئاراستەیەکی ورد بکرێن لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتیەوە، لە بنەڕەتیشدا کرۆکی کارەکە بەستراوەتەوە بە باش گۆشکردن و پەروەردەیەکی شیاو و کارئاسانیکردن بۆ پاکداوێنی گەنجان و یارمەتیدانیان بۆ دورکەوتنەوەیان لە ڕەوشتە دزێوەکان، لەبەر

ئەوە باشترین ڕێگە بۆ لادانی گەنجان لەو کارانە و تێرکردنی حەزە ناڕەواکان لە ناخی دەروونەوە دەست پێدەکات، کە بریتیە لە باشگۆشکردن و ڕاستپەروەردەکردن و خستنەگەڕی زۆرترین هەوڵ و کۆشش بۆ هۆشیارکردنەوە و ڕێنیشاندانیان و باش بەرێوەبردن و پێشەنگیکردنیان و هاندان بۆ گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوە و پەندوەرگرتن و گێڕانەوەی متمانە بۆ خود و ئاسانکاری ڕێگەکانی ڕاستکردنەوەی ڕەفتارە دزێوەکان و پێشکەشکردنی یارمەتی مادی و مەعنەوی بۆ گەنجان و نەوجەوانان بە تایبەتی.

لەم ڕوانگەیەوە گرنگە سوود وەربگیرێت لە هەڵوێستەکردن و قوڵبوونەوە لە تێگەیشتن لەو پرۆگرامی چارەسازییە دەروونی و پەروەردەییەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) لەم بوارەدا پەیرەوی کردووە، یەکێك لە حیکمەتەکانی هەبوونی پێشەنگی باشە لە کاری چاکدا، بڕوانە کە چۆن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) چارەسەری ئەو گەنجە سەرگەرمەی کرد کە ئارەزوی گڕگرتووی وای لێکردبێت مۆڵەت لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) وەربگرێت تاکو ڕێگەی بدات کە زینا بکات، لێرەدا دەبینین کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) پەنای نەبردە بەر هیچ ڕێگەیەکی هەڕەشە و توندوتیژی، بەڵکو پەنای برد بۆ بەکارهێنانی ڕێگەیەکی چارەسازیانەی پەروەردەیی کاریگەر بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووە گەنجانە گڕگرتووەکەی و خستنەگەڕی توانای ناوەکی ئەو گەنجە بۆ خۆ کۆنترۆڵکردن، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) نەرم نەرم لێی هاتە پێشەوە و سۆزی بۆ نواند، هەراسانی نەکرد، تەریقی نەکردەوە، ئایەتەکانی سزا و تۆڵەی بەسەردا

نەخوێندەوە، بەڵکو دڵی گەنجەکەی دواند، شکۆ و لایەنی چاکەی شاراوەی ناخی وروژاند و بە هێمنی بیری خستەوە کە هەموو ژنانی سەر زەوی دایك و خوشك و پور و خاڵۆژن و ئامۆژنمانن، جا ئەگەر کەسێك ڕازی بێ بەوەی کە ناموس و ئابڕووی لەلایەن خەڵکەوە لەکەدار بکرێ، ئەی چۆن ئەو کەسە ڕێگە بەخۆی دەدات کە ناموسی خەڵکی پیس و لەکەدار بکات؟ یان ئەوە بدات بەوان کە بۆ خۆی نایەوێت؟ بەمەش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وایکرد کە چاودێر و پاسەوانێکی ویژدانی هەر لەخودی گەنجەکە دروست بکات بۆ خودی خۆی، تا بەمەش وای لێکرد بۆ خۆی چاودێری رەوشتی خۆی بێت بەسەر خۆیەوە و قەدر و شکۆی خۆی بزانێت و لەهەموو سنوور بەزاندنێك خۆی بپارێزێت کە مافی ئەو نیە و پێی ڕەوا نیە، خۆ ئەگەر بەوە رازی بێ ئەوا دەبێ بەوەش رازی بێت کە لەبەر چاوی خۆی و لەسەر جێگەخەوەکەی خۆی و خانەوادەکەی تاوانی لەوجۆرە روودات لەلایەن کەسانی نەیار و بێگانەوە، هەرگیز مرۆڤی دەروونبەرزیش ڕازی نابێ بەشتێك بۆ خەڵکی کە بۆ خۆی پێی رازی نەبێ.

لە (ئەبو ئومامە)وە دەگێڕنەوە کە فەرمووی: گەنجێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم پێ دەدەیت زینا بکەم؟ خەڵکەکە دەورەی گەنجەکەیان دا و تووڕەیی دایگرتن و گوتیان: (بەس..بەس)، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی بەگەنجەکە: وەرە پێشەوە، ئەویش هەندێ لێی هاتە پێشەوە، دەڵێت: ئینجا دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: حەز دەکەیت لەگەڵ دایکت ئەوە بکرێ؟ وتی: نا بەخوا، بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا،

فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان خۆش نیە بۆ دایکیان، فەرمووی: ئەی حەز دەکەیت لەگەڵ کچەکەی خۆت؟ وتی: نا بەخوا، بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان خۆش نیە بۆ کچەکانیان، فەرمووی: ئایا حەز دەکەیت بۆ خوشکەکەت؟ وتی: نا بەخوا، بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان خۆش نیە بۆ خوشکەکانیان، فەرمووی: ئەی بۆ ئامۆژنت پێت خۆشە؟ وتی: نا بەخوا، بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان خۆش نیە بۆ ئامۆژنەکانیان، فەرمووی: ئەی بۆ پورت پێت خۆشە؟ وتی: نا بەخوا، بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان خۆش نیە بۆ پووریان، دەڵێت: ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەستی لەسەر گەنجەکە دانا و فەرمووی: خوایە لە تاوانی ببوورە، وە دڵی پاك بکەرەوە، وە ئەندامەکانی لەشی بپارێزە، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو گەنجە بەلای هیچ شتێکدا لای نەکردەوە[١].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) هەر تەنها بەوەش وازی نەهێناوە — بەڵکو لەودیوی ئەمەیشەوە— ڕێنمایی ئاراستەی گەنجان کردووە بەشێوەیەکی کردارییانە بۆ زاڵبوونیان بەسەر ئارەزوە دەروونییە نەشیاوەکاندا، ئەوەش بە هاندانیان بۆ هاوسەرگیری و داوێنپاکی و وەرزشە دەروونییەکان بۆ خۆڕاهێنان لە سەر دوورکەوتنەوە لە تاوان و کارە دزێوەکان و ڕامکردنی دەروون لەسەر خاوێنی و دەرون پاکی و

---

[١] بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا گێڕاویەتەوە، باسی ڕۆژو—فەرمودەی ژمارە (١٨٠٦).

بەرفرمانیکردنی خودا، ئەوەتا لە ئیبراهیمی کوڕی عەلقەمەوە دەگێڕێتەوەوە و دەڵێت: من و عبدالله (خوای لیٚ رازی بێت) پێکەوە دەڕۆیشتین، ئەو گوتی: من لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) بووم کەفەرمووی: (هەرکەس لە توانایدا بوو، با هاوسەرگیری بکات، ئەوە چاوان و داوێنی لە گوناح دەپارێزیٚ، هەرکەسێکیش نەیتوانی با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆی دەبێتە چارەسەر)[1].

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویٚ: [وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا] (**الإسراء: ٣٢**) واتا: توخنی زینا مەکەون، بەڕاستی ئەوە بەدکاریە و خراپترینی ڕێگایە، هەروەها دەفەرموێت: [يأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ] (النور: ٢١)، واتا: ئەی باوەڕداران شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەسیٚ شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەویٚ ئەوا ئەو فەرمان بە بەدکاری و خراپە دەکات، وە دەفەرموێت:

[قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ] (النور: ٣٠)، واتا ئەی پێغەمبەر بڵیٚ بە باوەڕداران چاویان لە ئاستی بێگانەدا دابخەن و لەتاوانی سێکسی خۆیان بپارێزن، وە دەفەرمویٚ: [قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ] (العنكبوت: ٤٥)، ئەوە ڕابگەیەنە کە بۆت

---

[1] بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە ـ كتاب الصوم ـ فەرموودەی ژمارە(١٨٠٦).

نیگا کراوە لە قورئاندا، وە نوێژ بکە، چونکە نوێژ لات دەدات لە کاری بەد و درزێو، وە یادی خودا گەورەترینە، وە خودا دەزانێت کە ئێوە چی دەکەن، وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: [وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ] (آل عمران: ١٣٥)، واتا: ئەو کەسانەش کە بەدکاریان کرد، یان ستەمیان لەخۆیان کرد، یادی خودایان کردەوە و داوای لێبوردنیان کرد لەو کار و تاوانەیان، ئەی جگە لە خودا کێ هەیە لێبوردەی تاوانەکان بێ، وە ئەوان سوور نابن لەسەر ئەنجامدانەوەی ئەو تاوانانەیان کە کردوویانە و خۆشیان بەوە دەزانن.

بەم جۆرە سوود وەردەگرین لە شیکردنەوەی پێشوومان، کە تاوانکردن و بەدکاری بە ئاشکرا و ناوزڕاندن و سووربون لەسەری و بڵاوبونەوەی دەنگۆی خراپ لەناو کۆمەڵگەدا، ئەو تاوانەن کە زیانیان بە گشتی بۆ کۆمەڵگەیە و شایستەی سزای یاساین و هاوکات پەیوەستیشن بە حەز و تاسە و ئارەزوە دەروونی و ڕەمەکیەکانەوە، وەکو: زینا، مەیخواردنەوە، تلیاك کێشان و هاوشێوەی ئەمانە، مەترسی ئەمانە لەوەدایە کە بە ئاشکرا بکرێن وە یا ئاشکرابن، لەبەر ئەوە دەبینین کاتێك عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) بە بێ مۆڵەت سەرکەوتە سەر دیواریماڵێك کە پیاوێك لە ماڵەکەی خۆیدا خەریکی مەیخواردنەوە بوو، ویستی سزای کابرا بدات، بەلام پیاوەکە کەوتە بەربەرەکانێ کردنی عومەر و پێی گوت: ئەمە شتێکی تایبەت بە خۆمە و لە ماڵەکەی خۆمدایە و بە ئاشکرا و لە دەرەوە نیە و، خۆ من بە ئاشکرا بەدکاریەکم نەکردوە، تا ئەو خەڵکانە بمبینن، بۆیە عومەریش هاتەوە

بیری و ڕاستیەکەی لە کابرا وەرگرت و وازی هێنا لە چاودێری کردن و سزادانی.

وە بە پێچەوانەی ئەمەشەوە، دەبینین کە سزای سەر ئەو تاوانانەی کە پەیوەندییان بە خوێن ڕشتن و دزی و داگیرکردنی سامانەوە هەیە، سزاکە پەیوەستە بە خودی کارەکەوە، نەك بە چۆنێتیەکەیەوە، بۆیە بەپێی یاسای ئیسلامی تەنها بوونی دوو گەواهی دەر بۆ سەلماندنی ئەم جۆرە تاوانانە بەسە، وە نابێ بە پێوانەکردن و بەراوردلێکبدرێنەوە و وەك تاوانە ڕەمەکی و زێدەڕەویەکان لە قەڵەم بدرێن بەو بیانووەی کە گوایە ئەمانەش هەر تاوانی تاکە کەسین، بۆیە تەنها بوونی دوو گەواهیدەر بۆ ئەم کەتنانە بەسە و هاوکات داوای هاوشێوەکەیشی دەکرێت بۆ سەلماندنەکەی وەك ڕێگرییەك لەبەردەم بڵاوبوونەوەی دەستدرێژی و دوژمنایەتیدا و پاراستنی مافی سەروسامانی خەڵکی و وەستاندنی خوێنڕێژی.

بەهەر حاڵ، گرنگە پەی بەرین بە بەرگریکردن لە ڕوودانی تاوان، جا تاوانەکە هەر جۆرێك بێت، وە ئەوەش تەنها بە سزادان ناوەستێتەوە، بەڵکو بەرگریکردن و چارەسەرکردنی لە ڕێی پاکردنەوەی زەمینەی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە هۆکارن بۆ ڕێگرتن لە تاوانکاری، وە هۆشیاری یاسایی ڕۆڵی گرنگی هەیە لە بنیاتنانی پەروەردەیەکی تۆکمە لەڕوی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەوە، ئەمەش لە کارە گرنگەکانە، تاکو بەو شێوەیە کۆمەڵگە گیانی کار و کۆشش و لە ئەستۆگرتنی تێدا گەشە بکات و دادپەروەری بێتە ئاراوە، گەندەڵی و بەدکاری ریشەکێش بکرێ، پەروەردەی

هەرزەکاران و نەوجەوانان بکرێ، خۆشەویستی کار و دڵسۆزییان تێدا بچێنرێت، دەرفەتی نایابیان لە بوارە جیاجیاکاندا بۆ دەستەبەر بکرێ.

تێکڕای ئەوانەی کە باسمان کردن، مەرج و داخوازی پێشوەختەن بۆ سەرکەوتنی هەر سیستمێکی چاکسازی و سزادان، جا هەرجۆرێك بن، بەبێ بوونی ئەم مەرج و بنەما و داخوازیانە کاروباری کۆمەڵگە چاك نابێ، ئەگەر چی سیستمی سزادانەکە توند و بەهێزیش بێت، بەپێچەوانەوە توندی سیستمی سزادان ئەگەر پەروەردە و ئامادەکاری و ئاراستەکردنی پێشوەختی لەگەڵدا نەبێ، گیانی کۆمەڵگە وێران و کاول دەکات و توانای گەنجەکانی کپ دەکات، وزەی شارستانی و ژیار و بنیاتنان و داهێنان دەمرێنێ.

**ئامانج و حیکمەت لە یاسای سزادانی ئیسلامی ئاسایس (الامن)ە لە کۆمەڵگەدا:**

لەسەر بنەمای ئەو شیکردنەوانەی پێشتر کردمان بۆ دۆز و بابەتەکان، دەبینین کە (حیکمەت) و (مەبەست) لەو سزایانە، بریتییە لە بڵاوکردنەوەی ئاسایش و ئارامی لە کۆمەڵگەی موسوڵماناندا، وە پاراستنی ئەندامانی ئەم کۆمەڵگەیە لە گێچەڵ و شەڕی دوژمن و نەیارەکانی، جا لەکاروباری ئارەزووە ڕەمەکیەکاندا بێت، یان لەو کاروبارانەی پەیوەستن بە سامان وماڵ و گیانی هاوڵاتیانەوە.

ئەوەتا لە کاتێکدا تاوانەکان ئەو تاوانە ڕەمەکی و ئارەزووە دەروونییانە بن کە بەشێوەیەکی گشتی و یەکجارەکی مرۆڤ لە دەستیان دەرباز نابێ، یان لەماوەی تەمەنیدا بەجۆرێك لەجۆرەکان یەخەی پێدەگرێت، ئەوا دەبینین کە

سزای ئەم جۆرە تاوانانە لە بەرانبەر خودی کارەکەدا نیە، بەڵکو بۆ ڕێگرتنە لە ناوزڕاندن و سووکایەتیکردن بە مرۆڤ، کە دواجار بەهۆی ئەمەوە کەسانی تر گیرۆدەی خەم و ژان دەبنەوە، وە بەدکاریەکەش لەناو کۆمەڵگەدا برەو دەسێنێ، وە خەڵکی بۆ تێرکردنی ئارەزوەکانیان پەنا دەبەنە بەر کارە حەرامەکان، لە کاتێکدا دەروازە حەلاڵەکانی بەڕوودا کراوەتەوە، وە بێگومان تێکەوتن وتێوەگلانی مرۆڤ لە کارە دزێوەکان و تێرکردنی لەڕێی حەرامەوە، پێویستی بەوە نیە کە ڕیکلام و بانگەشە و ناوزڕاندنی بۆ بکرێ، وە ئەو کەسەش کە ئەو کەتنانە ئاشکرا دەکات، نەك هەرکارێکی کردووە، بەڵکو بانگەشەکارێکی برەو پێدەرە و بیانووێکیشی نیە کە ناچاری بکات ئەو کارە بکات، وە شایانی سزاش نیە، لە پێناو پاراستنی ئاسایشی خەڵکی و چاودێریکردنی مافەکانی مرۆڤ، لە ڕووی ئاینی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەوە و ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی بەدکاری و خراپەکاری لەسەر زەویدا، خوای گەورە دەفەرموێت: [ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَالاخِرَة وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ] (النور ١٩)، هەروەها دەفەرموآ: [وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ] (آل عمران ١٣٥)، کە پێشتر راڤەی هەردوو ئایەتەکەمان کرد، لە عەکرمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بینی کەسێك

هەواڵی زیناکردنی کەسێکی بڵاودەکردەوە، دەڵێت: ئەو کەسە بەدکاری بڵاوکردەوە[1].

گرنگەکە ئەوەیە، کە لەشیکردنەوەی پێشوودا گەشتینە ئەو دەرەنجامەی کە تاکی موسوڵمان و کۆمەڵگەی موسوڵمان، بێگومان دەبێ بەو جۆرە بێ، کە مرۆڤ لەگەڵیدا و تیایدا هەست بە ئاسایش و ئارامی و دڵنیایی بکات، نەك هەست بە ترس و چاوەچاو و تۆقین بکات، وە لەوانەش ڕووداوی ئەو ژنەی کە هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بەدەمی خۆی دانی بەوەدانا کە زینای کردووە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) بەبێ بەدواداچوون و سزا بەڕێی کرد، تا ژنەکە خۆی هەر دووبارەی کردەوە و گەڕایەوە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و سوور بو لەسەر ئەوەی کە خۆی گەواهیدانی کارە دزێوەکەی خۆی بگەیەنێ بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وە ژنەکە بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە تاوان و تاوانە شاراوەکە، وە زانیاریە تاکە کەسیە تایبەتیکەی خۆی بکاتە زانیاریەکی گشتی کۆمەڵگە، ژنەکە دەیویست بەوەرگرتنی سزاکەی لەو تاوانە پاك بێتەوە، هەروەها گێڕانەوەی فەرموودەی نکووڵیکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەبەرچاوی ئەو خەڵکەی وازیان لەو پیاوە نەدەهێنا کە دەیویست لە سزا رابکات، لەوانەیە ئەم روداوە پەندێکی باشی تێدابێ لەو بارەیەوە، کە خودای گەورەش بە کورتی باسی ئەو سزایانە دەکات کە بۆ کەتنی زیناکاران دانراوە، چونکە مرۆڤی موسوڵمان، هاوڵاتی، ئەوە دەزانێ

---

[1] کتێبی (الأدب المفرد) بابەتی (ئەو کەسەی هەواڵی زینایەکی بیست و بڵاوی کردەوە)، فەرموودەی ژمارە (٣٢٩) صحیح **الأسناد**.

کە ئەو سزایانەی کە پەیوەستن بەو تاوان و تاوانانەی سەرچاوەکانیان ئارەزووە رەمەکەکانە بریتیە لە رێگرتن لە بڵاوبونەوەی بەدکاری و باس و خواسی بەدکاری لە کۆمەڵگەدا و بەرگرتن لە لافاوی سووکایەتیپێکردن و ناوزراندن و کاسبی پێوەکردنی حەرام و بەربەستکردنی بەدکاریەکان تاکو نەرژێتە ناو ژیان و کەسوکار و خێزانەکانیانەوە و وریاداریکردنی منداڵەکانیان بۆ ئەوەی نەبادا بەبێ خواست و ئارەزووی ئەوان بکەونە ناو داوی بەدکارییەوە، مەبەستەکەش بریتی نیە لە وەی کە بکەوینە کەمینەوە بۆ یەکتری و چاوەڕوان بین هەر کەسێك پێوەبوو، ئێمەش دەهۆڵی بۆ بکوتین و سیخوڕی بەسەر خەڵکەوە بکەین و ئابڕوویان بەرین و سووکایەتی بە ڕەوشتیان بکەین نەخێر، ئەوانە مەبەستەکە نین.

ئەگەر کار بەم چەمکەش بکرێ ئەوا هیچ دەرفەتێ نامێنێتەوە بۆ دروستبوونی ترس و تۆقین لە مرۆڤدا، بەڵکو دەبێ هەمیشە کەسەکان هەست بە ئاشتی و ئارامی و دڵنیایی بکەن، چونکە پەیرەوکردنی سزای گونجاو هەر بۆ بەدکارانە و هیچی تر، ئیتر بەبێ هیچ زیادوکەمی، یان سزا تەنها بۆ کەسانی ستەمکار و مافخۆرە، ئەمەش شتێکی سروشتییە وە هیچ هەستێکی ترس و تۆقین لای خەڵکی بە گشتی ناورووژێنێ و ناشبێتە هۆی تێکچونی ئاسایشی گشتی، بەڵکو یەکێکە لە پێویستیەکانی بڵاوکردنەوەی ئاسایش و دروستکردنی هەستی ئارامبەخش بە تاکەکانی کۆمەڵگە و بەم هۆیەشەوە ڕەوشت و شکۆ و ئابڕوو و مافەکان لە سامان و خوێن و گیان پارێزراو دەبن.

لەلایەکی ترەوە پێویستە بزانین کە سزای ئەو کەسەی تاوانباری زینا ناوزەد دەکات و دەنگۆی بۆ بڵاودەکاتەوە بەڕۆژی ڕووناك و لەبەرچاوی خەڵکیدا ئاشکرای دەکات، ئەم کارە دەچێتە چوارچێوەی ئەنجامدانی بەدکاری و گەندەڵی لەسەر زەویدا، بێگومان هەر کەسیش ئەوە بکات ئەوا شایستەی سزایە، بەرزترین ئاستی سزاکەش لێدانی (حد)، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەم سزادانە ڕێگر بێ لەبەردەمی تەوبەکردن و پەشیمانبوونەوەدا و دواجار خوداش لێی ببورێ، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا دەقی لەو شێوەیە هەیە.

هەروەها ئەوەش گرنگە کە بزانین مەبەست لە سزادان، تەمێکردن و پاراستنی مافە بنەرەتیەکانی مرۆڤە و بەرگریکردنە لە شکۆ و سەروەری مرۆڤ و ئەوانەی کە دژی ئەمانە نین، هەرکەسیش ڕەچاوی ئەم مافانە بکات با بەئارەزووی خۆیشی نەبێ، ئەوا نە زیانی پێدەگات و نە سود هەروەکو سزای (حد) بۆ گەورەترین تاوان کە زیناکردنە بەڵگەیە لەسەر خراپی کاریگەرییە کوشندەکانی لەسەر کۆمەڵگە و بواری خێزان، شتێك نیە کە لە سووکایەتیکردن بە بابەتە حەرامەکان تاوانتر بێ، وە بڵاوکەرەوەی بەدکاری بێ لە کۆمەڵگەدا، وە شکۆ و مافەکان بەرباد بکات، بە تایبەتیش مافی کەسە بێدەسەڵاتەکان وەکو ژن و منداڵ و ئابڕوویان، وە شتێك نیە کە هێندە گەورە بێ هێندەی ئەوەی کە منداڵێك بکەوێتە تەڵە و داوی ئەم جۆرە تاوانکارانەوە، منداڵێك بکەوێتەوە کە نازانرێ باوکی یان دایکی کێیە.. هاوکات بێ بەشیش بێ لە سۆز و چاودێری خێزان و دایك و باوکی، زوربەی ئەم جۆرە قوربانیانە دەبنە زەمینەیەکی لەبار بۆ چاندنی کۆسپە سۆزداری و

ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان و قین و شەڕەنگێزی و تاوانکردنەوە بەرامبەر بە نەوەی نوێ، خودای گەورە دەفەرموێ: [وَلَا تَقْرَبُوا ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا] (الإسراء ٣٢).

جا ئەگەر ئاسایشی کۆمەڵگە ڕێگەنەدا بە سیخوڕی کردنی تایبەتی بەسەر خەڵکەوە و نەچوونە ناو ماڵەکانەوە بەبێ پرس و سووکایەتینەکردن بە نهێنیەکان و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی پەردەپۆش کراون، ئەوا بێگومان پێویستە کۆمەڵگەش ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بخاتە کار بۆ باش پەروەردەکردنی گەنج و نەوجەوانان و لەمەترسی زیناش هۆشیاریان بکاتەوە، هەروەها لەو شتانەی بەهۆی ئەو کارە دزێوەوە بەرپادەبن و دەبنە هۆی ماڵوێرانی و کاولکردنی کۆمەڵگە، هاوکات پێویستە کۆمەڵگە هەموو ئەو ڕێ و شوێنە گرنگانە بگرێتە بەر کە پێویستن بۆ ڕێگری و بنبڕکردنی هەر شتێ کە ئەم بەدکاریە برەو پێ دەدات، وە بەدوای دۆزینەوە و گرتنی ئەو کەسانەدا بچێت کە بانگەشە بۆ ئەو کارە بەدە دەکەن، یان بازرگانی پێوە دەکەن، لەوانەش دەزگاکانی ڕاگەیاندن و شوێنە گشتیەکان کە هەندێ دەزگای ڕاگەیاندن و تۆڕی تایبەت هەن بۆ بلاوکردنەوە و بە ئاسایی زانینی ئەم بەدکارییە دزێوە. هەروەها گرنگە جیاوازی بکەین لە نێوان زاڵبونی ئارەزووەکان بەسەر دەروندا و کەوتنە ناو داوی بەدکارییەوە لە سنووری تایبەتی تاکەکەسدا و برەودان بە بەدکاری و بازرگانی و کاسبی پێوەکردنی.

کاتێك کە پەروەردە مەبەستێکە بۆ چاککردنەوە و هەڵسەنگاندن و جڵەوگرتنەوەی ئارەزوە سەرکەشەکانی دەروون و بەرچاوڕوونی و تۆکمەکردنی هۆیەکانی ڕوونەدانی تاکو مرۆڤ نەبێتە نێچیری ئارەزوەکانی و

خۆی نەدات بەدەستەوە لە پێناوی تێرکردنی پێویستی و ئارەزووەکانی بە هۆکارە حەرام و زیان بەخشەکان، وە زێدەڕەوی نەکرێ لە بەرپرسیارێتی مرۆیی و کۆمەڵایەتیدا، ئەوا ڕێگرتن لەو شتانەش کە هۆکارن بۆ خستنە ناو تەڵەی بەدکارییەوە مەبەست و پێویستە، ئەوەش ئەرکی کۆمەڵگە و دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنە، لەڕێگەی دەرکردنی ئەو جۆرە یاسایانەی کە بەبێ زێدەڕەوی ڕێگر دەبن لەهەر شتێ کەدەبێتە هەڵنان و هاندان و کارئاسانیکردن لە ڕەفتاری لادان و سنوور بەزاندنی ڕەوشتی و بازرگانی پێوەکردنی، وە دەرکردنی یاسای بیانوهێنانەوەی گونجاو بۆ پێویستبوونی دەرکردنی ئەو یاسایانە بەمەبەستی جێبەجێکردنیان، بەبێ ئەوەی ئەو یاسایانە لەلایەن دەسەڵاتەوە بکرێنە دەروازەیەك بۆ سووکایەتیکردن بە ماف و ئازادیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ، یان سیخوڕیکردن بەسەر خەڵکەوە و بڵاوکردنەوەی هەستی نائارامی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی لەناو ناخی ئەو خەڵکەدا.

ئەوانەش کە بازرگانی بەو کارە دزێو و سووکانەوە دەکەن و کاسبی بەو بەدکاریانەوە دەکەن ئەوا بە بەدکار و گەندەڵ دادەنرێن لەسەر زەویدا، وە یاسای سزادانەکەشیان هەر لەو روانگەیەوە تەماشا دەکرێ و بەوە دەقەبڵێنرێن کە سزاکەیان لە بواری سزای بڵاوبونەوەی گەندەڵیدا بۆ دادەنرێ و هەرە توندەکەیشی (کوشتن)ە و سوکەکەیشی (دابران)ـە لە کۆمەڵگە و زیندانی و بەندکردنیانە، بەمەبەستی پاراستنی خەڵکی لە گێچەڵی ئەوانە، وە بەندکراوەکانیش ناخرێنەوە ناو کۆمەڵگەوە تاکو چاکسازییان بۆ ئەکرێ و تەوبە ئەکەن و خەڵکی لە شەڕی ئەوان دڵنیا ئەبن، بەتایبەتی ئەو

بەندکراوانەی کە گیرۆدەی هۆگربوونی ئەو خووە بەدانە بوون، کە بەئاسانی چارەسەر ناکرێن، مەگەر کەسێ کە خودا بەر بەزەیی خۆی بخات.

**بەڵام کەسێك کە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە،** ئەوا خودا لێبوردە و میهرەبانە، هەروەکو خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزانەدا لەوبارەیەوە دەفەرموێ:

[سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ(١)ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ(٢)ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ( ٣ )وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ( ٤ )إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ( ٥ )وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ( ٦ )وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ( ٧ )وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ( ٨ )وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ( ٩ )وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ(١٠)](النور ١-١٠)

**هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ:**

[وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا( ٦٨ )يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا( ٦٩ )إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ

حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا( ٧٠ )وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا( ٧١ )] (الفرقان: ٦٨ – ٧١)

بۆ تێگەیشتن لە واتای ئەم ئایەتانە خوێنەر دەتوانێ سوود لە تەفسیرە کوردییەکان وەربگرێت.

یەکێك لە گرنگترین خەسڵەتەکانی حوکمی شەریعەتی ئیسلامی و سستەمی کۆمەڵگەی ئیسلامی، کە بە هەڵقولاوی سروشتی مرۆیی دادەنرێ و هەر خۆیشی دەیخاتە کار و چالاکی و پێویستیەکانی بۆ دەستەبەر دەکات، ئەوەیە کە واتای سەربەستی و ئازادی مرۆڤ و پەیبردن بە سنوورەکانی دیاری دەکات، ئەمەش وەك ئەو دۆخە نیە کە کۆمەڵگەی ماددی تێیکەوتووەو ناتوانێ بەڵگەی مەعریفەی هاوگونجاندنی ئازادی مرۆڤ بخاتەڕوو لە چوارچێوەی سستەمەکەیدا، هەروەها مانای ناوەرۆکی هاوگونجاندنی بنەماکانی سستمی کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤانە نابەخشێ، ئەوەتا کۆمەڵگەی ئیسلامی دەتوانێ سروشتی سستمی ئازادی کۆمەڵایەتی و بنەماکانی بزانێ لەبەر رۆشنایی گشتینەی تێروانینی ئیسلام و پەیبردنی زانستییانە بە واقعی کۆمەڵگە و پێویستییەکانی و ڕوبەڕووبوونەوەکانی، بەمەرجێك کە (راوێژی کۆمەڵگە) ڕەچاو بکرێ، بەپێی بەهەند وەرگرتنی کۆلکە نەگۆڕەکانی ئەم شەریعەتە و دۆخی کۆمەڵگە لە ڕووی کات و شوێنەوە و ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەی بەرەنگاری کۆمەڵگە دەبێتەوە بەدیاریکردنی سنووری ئازادی و ئەو ئەرك و مافانەی دەکەوێتە ئەستۆی هەریەکە لە خەڵکی بە هەموار و ناهەموارەوە، لە شتە حەرام و زیان بەخشەکان. وە بژارکردن و لابردنی هەر شتێ کە سوود و خێری تێدا نیە

گەرچی ئەمەش هەندێ ئێش و ژان بەدوای خۆیدا دەهێنێ کەمێ زیان دەگەیەنێ لە ڕووکەشدا، وە دەبێ هانی خەڵکی بدرێ بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێکی بەکەڵك و بەسوود، ئاسانکاری بکرێ لەهەر شتێکدا کە حەلاڵ ورەوا و ڕێپێدراوە، چونکە بنەڕەتی هەموو کارێك (ڕەوایی) و ڕێگەپێدانە، ئەگەر شەرع هۆکارێکی ناڕەوابوون و حەرامکردن و زیانی ئەو شتەی ڕوون نەکردبێتەوە، ئەگەر رەچاوی ئەوە نەکرێ، ئەوا ڕووێکی تری دێتە کایەوە کە ستەم و بەدکاری و گەندەڵی کپکردنەوەیەك دەبێت بۆ گیانی کەتن و تاوانکاری لە کۆمەڵگەدا و لاوازی پاراستنی ماف و شکۆی ئوممەت، بەپێچەوانەشەوە دەبێتە هۆی خستنەگەڕی وزەی ئەو ئوممەتە و چالاککردنەوەی تواناکانی و هێنانەدی واتای جێنشینی سەرزەوی و ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنانی فەڕ و چاکە لە زەویدا، کە ئەمەش هەر لە بنەڕەتدا لە نەژادی مرۆڤدا هەیە.

نەزانی و خۆ گێلکردن لە تێگەیشتنی مانای سستم (SYSTEM) ی کۆمەلأیەتیبوونی مرۆیی و سنوورەکانی ئەم سستمە و مەبەستەکانی، لەوانەش سستمی ئازادییەکان و ئەو ئەرك و مافانەی پەیوەستن پێوەی –یەکڕاست– دەبنە هۆی دروستبوونی پشێوی لە پەیوەندیە مرۆییەکاندا، وە بەردەوامبوونی ئەم پشێویەش دەبێتە هۆی داڕمانی سەرلەبەری سستمی کۆمەلأیەتیانەی مرۆیی، هەروەکو ئەمە بەسەر زۆربەی ژیار و شارستانیەتیە دێرین و پێشینەکاندا هاتوە، چونکە سستم (SYSTEM) لەم بونەوەرەدا، جا مادی بێت یان مرۆیی، سنوور و یاسا و بنەمای خۆی هەیە، وە ئەمانە شتێکی داهێنراوی هەڕەمەکی نین، بۆیە پێویستە بە

تێگەیشتنێکی زانستی و ڕاستەقینەوە لە سستمی مرۆیی و سروشتەکەی تێبگەین، وە ڕەچاوی ئەو مەبەست و بنەما و سنوورە گشتیەی بکەین کە سرووش و نیگا (وحی) ڕاست و ڕەوان بۆی باسکردوین و داهێنراو و داتاشراوی مرۆڤ نیە، وە هەڵوێستە لە ئاستیدا بکەین، چونکە نەبوونی توانای تێگەیشتن لە چەمکی واتای مەعریفە و زانستیەکانی و زانستیەکانی یاساکانی سستمی کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤ و سنوورەکانی جێبەجێکردنیان و سەرچاوە ڕاست و ڕوونەکانیان، واتا لابەلابوونەوە و قڵپبوونەوەی ئەو سستمانە و تێکڕووخان و دارمانیان.

ئەم دارمانە کۆمەڵایەتیەی مرۆڤ، ئەوەیە کە لە ئێستادا لە کۆمەڵگە مادییەکاندا سەرەتاکەی دەرکەوتووە و بۆتە هۆی داڕووخانی سستمی خێزانی و ڕەوشتە کۆمەڵایەنیەکان، ئەو کۆمەڵگایانەی کە دوورن لە گیانی ڕێنمایی سرووش و نیگای گشتی گەردوونی ڕاست و دروست و دوور لە لادان و دەستکاریکردنکە خاوەندارێتی مرۆڤی کردووە و هاوکاری بووە بۆ شاڕێی ڕێنمایی ماکیانەی و بەرجەستەکردنی خودی مرۆڤ هەر لە ڕۆژی هێنانەبوونیەوە تا ئێستا، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە ئەم کۆمەڵگانە لەرووی هێزی مادیەوە گەیشتوونەتە هەمان ئاستی ئەو هێزە माددیەی کە گەلان و شارستانییە فەوتاوەکان پێی گەیشتبوون.

بەڵام ئەو تاوانانەی کە پەیوەستن بە خوێن و سەروماڵی خەڵکییەوە، ئەوا دەبینین کە سزاکانیان بەپێچەوانەی سزای تاوانە ڕەمەکی و ئارەزووە دەروونیەکان و حەزە دەروونی و فریودانەکان و پێویستیەکانە، واتا لەم کۆمەڵگایانەدا سزاکە ڕاستەوخۆ لەبەر خودی تاوان و کارەکەیە، نەك لەبەر

ئەو دەنگۆ و بانگەشە و ناوزڕاندنەی کە بۆی دەکرێ، لەبەر ئەوە تەنها گەواهی دانی دوانی بەسە و هاونزیك و هاوتاکانیشی بەهەند وەردەگیرێت، لەبەر ئەوە سزا دادپەروەرانەکە (جگە لە حەد) لەو تاوانانەی پەیوەندی بە خوێن و سەر وماڵەوە هەیە کۆی گشتی خەڵك ناترسێنێ، بەلاّم یاسای ئیسلام فێرمان دەکات کە مرۆڤی ئاسایی و ژیر لەناو کۆی گشتی خەڵکیدا ویژدانی ئەوە بە ڕەوا نابینێ کە خەڵکانی بێتاوان و سڤیل بکوژێ، یان دزی بکات یان دەست بگرێ بەسەر ماڵ و سامانیاندا، بەڵکو ئەوە بەبیریدا دێت کە لەوانەیە خۆی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو تاوانانەی بەرامبەر بکرێ، بۆیە ئەم کەسە خۆی لەناو کاریگەری سزای دوژمنایەتیدا دەدۆزێتەوە، نەك توندی سزاکە، وە ئاراستەی دەکات بۆ خودی کارەکە، بەوەی کە دڵنیا دەبێتەوەکە ئەم یاسایە و ئەم سزایە بۆ پارێزگاری ئەو و پاراستنی ئاسایشی ئەو دانراوە و پەیڕەو دەکرێ.

## ئامانج قەدەغەکردنی تاوانە، نەك سزا

ئەگەر مەبەست و نیاز و ئامانج لە سزادان لە سیستمی یاسای ئیسلامیدا بریتی بێ لە پاراستنی کۆمەڵگە لە بەدکاری و گەندەڵی و لێکهەڵوەشان و پاراستنی سەر و ماڵی خەڵکی و دەستەبەرکردنی پاراستنی کەسانی سڤیل و بێتاوان، ئەوە مانای ئەوەیە کە بوونی سزا و نیازی سزادانی خەڵکی نابێ لە مەبەست و ئامانجی ئەو یاسا و شەریعەتەدا هەبێ، چونکە (سزادان) خودی (ئامانج) نیە لە مەبەستەکانی یاسای ئیسلامیدا، بەڵکو مەبەستەکە چاکسازی و دابینکردنی ئاسایشە، وە ئەو شتەش کە چاکسازی و ئاسایشی

پێ دێتەدی ئەوە جێبەجێ دەکرێ کە کەمترین سنووری سزادانە، هەر بۆیە یاسای ئیسلامی ئەو کەسانەی سەرپشك کردوە کە کەسێکیان لێ کوژراوە لەنێوان وەرگرتنی تۆڵە و لێبوردندا، وە هانی لێبوردنەکەی داوە، چونکە هەمیشە سەرچاوەی دەرچوونی لێبوردن لەلای کەسێکەوەیە کە توانا و دەسەلاتی ئاسایشەکەی لەبەردەستدایە، وە هەستی پێدەکات، وە دەتوانێ پەیڕەوی بکات، وە هیچ وروژێنەرێکی لەبەردەمدا نامێنێ کە هانی بدات بۆ تۆڵە سەندنەوەیەك کە حەز و ئارەزوی هانی دابێ.

لە عائیشەوە (خوای لێرازیبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: (چەند توانیتان سنورەکان لە موسوڵمانان دووربخەنەوە، ئەگەر دەروازەیەکی ڕزگاریتان بۆ موسوڵمانێك دۆزیەوە، ئەوا وازی لێ بێنن، پێشەوا ئەگەر لە لێبوردندا هەڵە بکات باشترە وەك لەوەی لە سزاداندا هەڵە بکات)[1]، هەروەها کوڕی مونزیر دەڵێ: (هەموو ئەوانەی زانیاریمان لێ بیستوون یەك دەنگن لەوەدا کە سنوورەکان(سزادیاریکراوەکانی تاوانەکان) بە شتە گوماناوییەکان لادەبرێن)[2].

پێویستە بەم جۆرە لە یاساکانی ئیسلام بۆ سزادانەکان تێبگەین، واتا لە ڕوانگەی هێنانەدی ئاشتی و ئاسایشەوە بێت، نەك لە ڕوانگەی توندوتیژی و سەپاندن و تۆڵەسێنی و وروژاندنی هەستی ترس و تۆقین لە دڵی خەڵکدا، لەمەوە تێدەگەین کە ئەمەیە ڕوانگەی راست و دروست بۆ سزاکان لە

---

[1] مستدرك الحاكم –كتاب الحدود– فەرمودەی ژمارە (٨١٣٦).

[2] حاشيه الروچ المربع (٣٢٠/٧)

ئیسلامدا و حیکمەتی دەقە قورئانییەکان لەبارەیانەوە، کە لە ئیسلامدا بە یاساکان و سزاکان (حدود) ناسراون و کراونەتە دوایین بواری ڕێگەچارە، لەوانەیە هەر ئەوەش ئەو مەبەستەبێ لە دانانی سنوورەکەدا، دوای ئەوەی دەدرێتە دەست ئەنجومەنی راوێژکاری کۆمەڵگە و قەناعەتکردنی زۆرینەی ئوممەت لەڕێی نوێنەرایەتییانەوە لەو ئەنجوومەنەدا بە جێبەجێکردنی سووکترین سزای ناو سنووری سزادانەکان، کە لەچوارچێوەی یاسادا دانراون لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی قورئان و مەبەستەکانیان و هەروەها لەبەر ڕۆشنایی توێژینەوە زانستیەکانی تایبەت بە ناسینی سروشتی مرۆڤ و ماکەکەی (زانستی کۆمەڵایەتی ئیسلامی)، کە بەمەش ئاسایش دەستەبەر دەکرێت و ڕێگری دەکرێت لە تاوانکاری و دەستدرێژی و سنووربەزاندن لە کۆمەڵگەدا، بەمەرجێك ئەم کارە لادان نەبێت لە سنووری ئەو سزا یاساییە نەگۆڕانەی کە بەدەقی قورئان یەکلاکراونەتەوە و بواری هەموارکردن و ئاسانکاریان تێدا نیە، چونکە ئەم جۆرەیان لە تاوانەکان، لەوپەڕی سنووری سزاداندان و بڕیاری خوداییان لەسەر دراوە و یەکلاکراونەتەوە بەدەقێکی ڕوون و ئاشکرا، لە بنەڕەتیشدا تاوانی لەم جۆرە ناکرێ بدرێتە دەست گومان و دوودڵی و بیانوهێنانەوە و ئەگەری فریوی ئارەزووە مرۆییەکان و ئەو کارەساتانەی بەهۆی تێرکردنی حەزەکانەوە تاوان بە مرۆڤ دەکەن، یان بەهۆی لاوازی لەکەسەکاندا بۆ جڵەوگرتنەوەی ئارەزووەکانیان کەوتبنە ناو

ئەم فریوخواردن و هەڵخلیسکان و کەمتەرخەمییانەوە، جا ئەوە بە ئەنقەست و خۆ ویستانە بووبن یان بەخۆ نەویستانە و نائەنقەست[١].

هەر ئەم تێگەیشتنە کێشەیەکی تریشمان بۆ چارەسەر دەکات، ئەویش کێشەی (سزادانی دز)ە، کە هەر بە ناوهێنانی یەکسەر ئەوە بەبیری خەڵکیدا دێت کە گوایە سزای دز زۆر توند و تۆقێنەر و ئازاردەرە و ناشرینکردن و کەمئەندامکردنی خەڵکیشە.

ئێمە کاتێك دەقە قورئانیەکە دەربارەی سزادانی دز دەخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە دەقەکە دەربڕینێکی گشتییە و هیچ پێناسەیەکی بۆ جۆری دزییەکە نەکردووە بە دیاریکراوی، وە هیچ مەرجێکیشی دانەناوە بۆ ئەوکەسەی کە دزییەکەی کردوە.

خودای گەورە دەفـەرموێ: [ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ( ٣٨ )فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ( ٣٩ )](المائـدة ٣٨-٣٩). دەقەکـە

---

[١] یەکێك لەو هەڵانەی کە لەلای زوربەی خەڵکی باوە، ئەوەیە کە کاتێك جۆرە گومانێك لەبارەی ڕاستی و ناڕاستی فەرمودەیەکەوە دەوروژێت، قسە و باس و گفتوگۆکە زیاتر بە ئاراستەی خودی ئەو هاوەڵەدا دەڕوات کە فەرمودەکەی گێڕاوەتەوە، بەمەش شلۆقییەك بۆ پێگەی هاوەڵەکە دروست دەبێ، کە لەبنەڕتدا شێواوی فەرموودەکە هیچ پەیوەندییەکی نیە بە خودی هاوەڵەکەوە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی یەکێك لەوانەی لە زنجیرەی گێڕانەوەکەدایە، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لەبنەڕەتدا هاوەڵەکە ڕاستگۆ و سپاردە پارێزە، ئەگەر کار هاتە سەر ئەوەی سووکایەتی بە هاوەڵەکە بکرێ، ئەوا با ئەوە نەکرێ و فەرموودەکە ڕابگیرێت و هەڵوێستەی وردتری لەسەر بکرێ و دەقی فەرموودەکە بەپێی هاودەقەکانی لە قورئانی پیرۆزدا و مەبەستەکانی شەریعەت بەراورد بکرێتەوە، بە چاوپۆشیکردن لەهەر بیر و بۆچونێکی تر.

زۆر بەڕوونی ئەوە دەگەیەنێ کە هەر شتێك کە ناوی (دزی) بێت، ئەوا سزاکەی بڕینەوەی دەستی دزەکەیە، ئەمە لایەنی ڕواڵەتیانەی ئایەتەکەیە، بەڵام ئەمە کێشەیەکە سەرسوڕمان دروست دەکات، کاتێك کە واتێدەگەین کە سزای هەموو دزیکردنێك بڕینی دەستی دزەکەیە، چەمکی واتای ئایەتەکە ئەوەیە کە سزای هەموو گەندەڵکار و دزێکی ئەوتۆ کە سوورە لەسەر دووبارەکردنەوەی ئەم کارە ناکۆکەی ناو کۆمەڵگە و ئەم کارە دزێوە، کە بۆتە مایەی تێکدانی ئاسایش و دڵنیایی کۆمەڵگە و بڵاوبوونەوەی ترس و گومان لە دڵی خەڵکیدا، ئەوەیە کە سزاکەی زۆر توندە و لە دوایین سنووری سزاداندایە، کە دەستبڕینی دزەکەیە ئەمەش لەبەرامبەر ئەوەیە کە کارێکی دزێوی دەست داوەتێ و بۆتە هۆی بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و ترس و هاوکات سوورە لەسەر دووبارە کردنەوەیشی و هیچ بیانوێکی نیە بۆ ئەوەی کە پێویستی بەوە بێت ئەوە بکات، بەڵام زۆر زەحمەتە لەوەی کە تێبگەین لەو چەمکەی کە دەبێت دەستی ئەو دزە ببڕدرێت کە دزیەکی کردوە لەو ساتەدا کە زۆر لاواز بووە بەسەر کۆنترۆڵکردنی خۆیدا، هەروەها زەحمەتە ئەوەش عەقڵمان قبوڵی بکات کە سزاکەی یەکسەر بریتی بێ لە ئەوپەڕی سنووری سزادانەکە، کە بڕینی دەستیەتی، ئەمە لەودیوی ئەوەوەیە کە زانایانی پێشین لە فەرموودەناسی و ڕاڤەکارانی قورئان و ڕادۆزان (المجتهدین) و جێبەجێکارانی سزاکان سەبارەت بەو کەسانە کردوویانە، وە گەلێك مەرج و بنەمای وایان داناوە کە سزاکە هەڵدەپەسێرێت و بەدیل و چارەسەری تری بۆ دەدۆزێتەوە و دەستبڕینەکە بەکرداری جێبەجێ ناکرێ.

وە کاتێکیش لەو دوو ئایەتە پیرۆزە ورد دەبینەوە کە باسی تاوانی دزیکردن دەکەن، بۆمان دەردەکەوێ کە پێشەوا و زانا پێشینەکان زۆر زرنگ بوون لە تێگەیشتنی قووڵی ئەم ئایەتانە، وە دەقە قورئانیەکانیش راست و تەواون و پێویست بە خۆبۆماندووکردن ناکات بۆ تێگەیشتنەکەیان، چونکە ئایەتی یەکەمیان پەیوەستە بە ئەوپەڕی سنووری سزاکە، کە دەستبڕینە، وە ئایەتی دووەمیش پەیوەستە بە ئەمپەڕی سنووری سزاکە، کە بریتیە لە لێبوردن لەو کەسانەی سوور نین لەسەر دووبارەکردنەوەی دزی و بڵاوکردنەوەی گەندەڵی لەسەر زەوی و هاندان بۆ گەندەڵی و ترساندنی کەسانی سڤیل و خەڵك و هاوڵاتیان.

وە مانای ئەو ئایەتانەی پێشووتریش کە لە سوورەتی (مائدە) دا هاتوون ئەوەیە کە ئەوپەڕی سنووری سزادانی دز بریتیە لە دەستبڕینی دزەکە ئەگەر بووبێتە مایەی ترساندنی خەڵك و تێکدانی ئاسایشی ئابوری و کۆمەڵگە و سووریش بێت لەسەر دووبارەکردنەوەی، بەبێ ئەوەی لەبەر پێویستی و بەناچاری ئەوەی کردبێ، بەڵام ئەگەر دزێك هەر زوو لەو کارەی پەشیمان بویەوە و تەوبەی کرد و پەنای بردە بەر ڕێگەی چاکسازی، ئەوا دەچێتە ناو بازنەی بەزەیی پێداهاتنەوە و چاودێری کردنەوە، خۆ ئەگەر بەڕاستی تەوبەی کرد و بەیەکجاری وازی لەو کارە هێنا، ئەوا خوداش تەوبەی لێ وەردەگرێت و لێی خۆش دەبێ، وە دزێکی پەشیمان و تەوبەکار —بێگومان— لەپێشترە وەك لە بکوژێك بۆ ئەوەی ببەخشرێت و دەرفەتی تازەشی لەبەردەستدایە بۆ گۆڕانکاری و لێخۆشبوون، یان بۆ سوککردنی سزاکەی، ئەمەش لە پێناوی چاکسازی کۆمەڵگە و راستکردنەوەی هەڵەی مرۆڤەکان و

دورخستنەوەی لەوەی کە بەهۆی دەستبڕینەوەکەی ببێتە کەسێکی کەمئەندام و بێدەست و ئیتر نەتوانێ کار بکات و کاسبی بۆ گوزەرانی خۆی و خێزانی بکات، وە دواجار ببێتەوە بەبار بەسەر کۆمەڵگەدا.

ئێمە بەوەی کە لەم چەمکە تێبگەین کە (دەستبڕین) ئەوپەڕی سنووری سزادانەکەیە، تێشدەگەین لە بڕیارەکەی عومەری کوڕی خەتتاب سەبارەت بە بەخشینی گەنجێك کە دزی کردبوو، بەهۆی گیرۆدەبوونی بە ئارەزووی دەروونیەوە و فریوی خواردبوو، وە بڕیاریدا کە هەرگیز دوبارەی نەکاتەوە، هەروەها تێشدەگەین لە هەڵپەساردنی سزای دەستبڕین لەساڵی (ڕەمادە) دا کە ساڵی گرانیەکی گەورە بوو، وە جگە لەمانەش گەلێك نموونەی تری دادوەرە ڕابردوەکان و جێبەجێکردنە ئیجتیهادیەکان کە سزاکە بەکرداری جێبەجێ نەکراوە، بەبێ ئەوەی کە لادانیش بووبن لە سنووری ئایەتەکان.

بێگومان هەستکردن بەوەی کە گوایە دزیکردن بە تاوانێکی بچووك دابنرێ تا ئێستاش لای زانایان و ڕادۆزان و دادوەران جێگەی مشتومڕە، بەتایبەتیش ئەگەر دزیکردنەکە سادە و بچووك بێت، ئەوا پێویستە سزاکەی بۆ سووك بکرێ، یان ببەخشرێ بەپێی مەرج و بنەماکان، بۆ ئەمەش سوودوەردەگرن لە لایەنە جێبەجێکاریەکانی سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و جێنشینەکانی و ڕا و بۆچوونی رادۆزان و وردبوونەوە لە مەبەست و ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی و پاراستنی بەرژەوەندیەکان و بنەماکانی چاکسازی و تەنگەتاو نەکردنی نابەجێ —ئەوەندەی لە توانادا بێ و پێچەوانەی دەقەکانیش نەبێ، ئەوەش بە لەبەرچاوگرتنی گەلێك لە مەرجەکان وەکو لەبەردەستدابوونی بڕی تەواوی شتە دزراوەکە و جۆرایەتی

و پاکتاوکردن و گێڕانەوەی شتە دزراوەکە وەك خۆی بۆ خاوەنەکەی و سەرەڕای ئەمانەش هاندانی تەواوەتی دزی لێکراوەکە بۆ بەخشین و لێبوردن لە دزەکە، بەر لەوەی دۆسیەی تاوانەکە بگاتە دادگا و ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری و داواکاری گشتی.

ئەگەر ئێمە سەرنجێکی گشتاندن و مەبەستەکان بدەین، هەر لەسەرەتاوە، وە هەست بەوە بکەین کە مەبەستی (حدود) بە تێگەیشتنە قورئانییەکە بریتیە لە خستنە ڕووی ئەوپەڕی سنووری سزادانەکە، وە جێبەجێکردنی سزای دەستبڕینەکەش کەمتەرخەمیکردن نیە لە جێبەجێکردن و دەربڕینی دەقەکەدا، تا پێویستمان بەوەبێ کە بە ناچاری پەنا بەرین بۆ دەقی ڕای زانایان و جێبەجێکردنەکانیان بۆ تەواوکردنی مانای دەقە قورئانی و بەڵگە و بنەماکانی — ئەوا هەستیش بەواتای بەڵگە ڕاستەقینەکانی دەقەکان دەکەین بەپێی کات و شوێن، وە هەستیش بە کرۆکی بەڵگە جێبەجێکاریەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و جێنشینەکانی دەکەین، وە لە حیکمەتەکانیان تێدەگەین، وە دەشزانین کە بۆچی مەودایەکی کراوە هەیە لە نێوان جێبەجێکردنی سزا و هەڵپەساردنی و بەخشینی بەپێی جۆرایەتی دۆخەکان، نموونەی ئەمەش هەر وەکو نموونەی سزای تاوانی کوشتنە، هەروەها تاوانەکانی تری جەنگ و ئاژاوەگێڕی و بڵاوکردنەوەی گەندەڵی لەسەر زەویدا، وە گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنانەی کە پێویستن بۆ ڕاگرتنی تاوان و بەر لێگرتنی بەپێی کات و شوێن، لە پێناو پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگەدا، چونکە نموونەی جێبەجێکردنە کرداریەکانی چاخی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و جێنشینەکانی، کرۆکی

**راستەقینەی دەقە قورئانییەکانە، لەوپەڕی سنووری سزادانەکەدا، وە لێبوردن و بەخشین ئەمپەڕی سنوورەکەیە کە دەکرێ بەپێی دۆخ و کات و شوێن پەیڕەو بکرێ و کاری دادگایی پێ ئەنجام بدرێ، بەپێی تێڕوانینی کۆمەڵگە و ئەنجوومەنی ڕاوێژکردنەکەی بەمەبەستی بەرگرتن لە تاوان و دەستەبەرکردنی ئاسایشی کۆمەڵگە، جگە لەو تاوانانەی کە سزاکەی لە ئاستی ئەوپەڕی سزاداندایە، خودای گەورە دەفەرموێ:[وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ]**(الأعراف: ٥٢)، **هەروەها دەفەرموێ:[ الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ]**(هود: ١)[1]، **لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بزانین کە سنووری سزادانی دز، هاوکات دواین**

[1] واباشە لێرەدا نموونەی جێبەجێکردنی دەست بڕینەوەکە، کە جێبەجێکرا، لەچاخی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) بەسەر ژنێکی مەخزومیدا – ئەگەر ڕوداوەکە راست بێ – ئەوا کارێکە دەبێ لە کات و شوێنی چاخەکە تێبگەین، کە لەو سەردەمەدا نەریتی تیرە و خێڵ زاڵ بوو بەسەر هۆزەکانی دوورگەدا، لەبەر ئەوە نەدەشیا مامەڵەکردن لەگەڵ ژنێکی ئەوان هەمان مامەڵە بێ کە لەگەڵ ژنانی تر دەکرێ، بەپێی نەریتی خێڵ، بۆیە ئەمە وانەیەك بوو بۆ سەلماندنی یەکسانی لە حوکمی دادگەری پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) و ڕەت دانەوەی ڕەگەزپەرستیە:[ يا أَيُّها ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِ وَٱلْأَرْحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ] (النساء: ١)، [يا أَيُّها ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ] (الحجرات: ١٣)، (ئەگەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی بکردایە، دەستیم دەبڕیەوە) بوخاری گێڕاویەتەوە – (با خەڵکی بە کارە خراپ و پشت و تیرەیانەوە نەیەن بۆلام، گەلانی پێشووتان بەوە تێداچوون کاتێ دەسەڵاتدارێ دزی دەکرد وازیان لێدەهێنا و کە بێدەسەڵاتێکیش بیکردایە سزایان بەسەردا جێبەجێ دەکرد) بوخاری گێڕاویەتەوە– کە ئەم جیاوازی کردنەی نێوان کەسەکان

سنووری هەرە باڵای سزادانە و ئەوپەڕیەتی، نموونەی ئەمەش هەر وەکو سزای (تۆڵە سەندنەوە وایە)، کە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری کۆمەڵگە بڕیاری لەسەر دەدات، بەوپێیەی کە لێی دەکۆڵێتەوە و دەیبینێ لە هەر جارێکدا کە گونجاوی دۆخەکەبێ، وە بەرگربێ لە بڵاوبوونەوەی تاوان، بەبێ زێدەڕۆیی و کەمڕەوی، بەچەشنێك کە ئامانجە بنەڕەتیەکە بپێکێ، کە ئەویش سنوورەکانی تاوان و پاراستنی ئابڕووی خەڵك و خوێن و مافەکانیانە، وە دابینکردنی هەستی ئاسایش و دڵنیایی کۆمەڵایەتییە بۆ کۆمەڵگە.

وە بەم تێگەیشتنە لە دەقە قورئانییەکان و دەقەکانی جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و جێنشینەکانی و ڕای ڕادۆزانی ئیسلام، یاسای ئیسلامی و دادوەری موسوڵمانان سەبارەت بە سزای تاوانەکان، بەبێ هیچ تەنگەتاویەك، لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا چوونەدەرەوەنیە لە پەیڕەوکردنی یاساکانی ئیسلام و ئەوپەڕی سنوورەکەشی نیە لە سزادانەکاندا، واتا وەرگرتنی سنووری ناوەندییە لەسزاداندا نەك توندترین سزا.

واباشە لێرەدا ئاماژە بکەین بەو ڕێکارانەی کە هەندێ لە دادوەر و زانایانی شەرعناس گرتوویانەتە بەر و بگرە زۆر تێیشیدا قووڵبوونەتەوە، کە سەبارەت بە چۆنێتی بڕیاردانە لەسەر حوکمێکی شکێنەرانە بۆ بنبڕکردنی دیاردە دزێوەکان، کە ئەگەر سەرنجی بدەین لەسەروی سنوری سزا شەرعیەکانیشەوەیە، جگە لە سزای (کوشتن) (بڕینی دەستی دز)، ئەویش لێدانی سەد دارە لەو کەسەی زینای کردووە، دەبینین کە دادوەرە

---

بەهۆی بەرز و نزمی هۆزەکانەوە گەلێك زیانی کۆمەڵایەتی و یاسایی هەیە، بۆیە دەبێ دادوەر کات و شوێن بەهەند وەربگرێ.

توندگیرەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە هەر سەد شەلاخەکە لەیەك کاتی دیاریکراودابێ کە دەڵێن دەشگاتە زیاتر لە هەزار شەلاخ.

لەوانەیە یەکێك لە پاڵنەرەکانی ئەو حوکمدانە تەمبێکەرە توندەی کە لەسەرووی سنوری بنەڕەتیەوەیە بۆ زیاتر توندی پیشاندانە لەو کارە دزێوەی کە بکەرەکە کردویّتی، یان چەندین جار پەیمانی داوە و دووبارە کارەکەی ئەنجامداوەتەوە، بەبێ ئەوەی پێویستی بەوە بووبێت، وەیان لەڕادە بەدەر کارەکە زیانبەخشە بۆ کۆمەڵگە بە گشتی، بۆ نموونە ئەوکەسانەی کە بازرگانی بە مادە هۆشبەرەکانەوە دەکەن و برەوی پێدەدەن و خەڵکی پێوە گیرۆدەدەکەن، ئەو کەسانە تاوانی دژە مرۆیی دەکەن و دابڕاون لەهەستی مرۆڤانەی ئەوتۆ کە لەناو خەڵکیدا باو نیە و کارەکەشیان زیانبەخش و دژە باوە، کە زۆربەی جار بە فێڵ و بەبێ ئاگاداری کەسەکە، کەسەکە تووش دەکەن و وای لێدەکەن کە ئەو کەسە توشبووە ناچار بکەن پەنا بەرێتە بەر دزی و گەندەڵی و کاری تیرۆرستی و شتی تر، کەچی خودی کارەکە تەنها ئەوەیە کە دەبێتە هۆی تێکدانی مێشك و دەماری کەسەکە و هۆگربوونی بەم خووە بەدەوە.

ئەم شتانەم هەموو لەبەرچاوە، لەگەڵ بەهەندوەرگرتنی پاڵنەرەکانیشدا، بەڵام هێشتا نابنە بیانوو بۆ ئەوەی سزای تەمێکەر بگەیەننە پتر لە ئەوپەڕی سنوور کە سەد شەلاخە لە حاڵەتی زینادا، هەرچەندە هەندێ لە زانایانی شەریعەت و پێشەوایان و دادوەران ڕێگرن لە سزادانی ئەو کەسانەی گەندەڵی و بەدکاری بڵاودەکەنەوە، ئەگەر خودی خۆیان بکەرەکە نەبن، هەر وەکو دەقی قورئانیشی لەسەرە، ئەمانە پێیان وایە وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە

کارانە ئەوەیە کە کۆمەڵگە بپارێزری لە بەدکاری و گەندەڵی، بەبێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر سزادانی جەستەیی و سزاکەیشی بگەیەننە ئەوپەڕی سنووری سزادانەکە.

خوای گەورە دەفەرموێ: [إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَهُمْ فِى الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ(٣٣)إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ( ٣٤ )] (المائدة: ٣٣ – ٣٤).

مەبەستەکە ڕوونە، دەقی ئایەتەکە پاراستنی کۆمەڵگەیە لە بەدکاری و بەدکاران کە جەنگ بەرپا دەکەن دژی ئاسایشی کۆمەڵگە، وە ئایەتەکە دەیەوێ خەڵکی ڕزگار بکات لە گێچەڵ و شەڕی ئەو کەسە بەدکار و ئاژاوەگێڕانە.

وە قورئانیش ئەو ڕێکارانەی باسکردووە کە دەبێ بگیرێنە بەر بۆ ڕزگاربوونی کۆمەڵگە لە شەڕی ئەوانە، جا شەڕەکەیان هەر جۆر و شێوەیەك بێ، گەندەڵی، کوشتن و کوشتار، بە سزای دەستبڕینەوەی ڕاست و چەپ، تاکو ببێتە هۆی تێکدانی هاوسەنگی جەستەیی و شلۆقکردنی جوڵەی تاوانبار بۆ ئەوەی نەتوانێ بەو شێوەیە بجووڵێ کە بەدکاری لێبکەوێتەوە، وە هەر بە چاو ئەوانە بناسرێنەوە کۆمەڵگە بەهەڵەدا نەچێ لە بەچاو تەماشاکردنیاندا، وە خۆیان لەوانە بپارێزن و هۆشیار بن، یان لە کۆمەڵگە داببڕێن بە زیندانی کردنیان یان بە ناسینەوەیان بەوەی کە دەست و قاچیان بڕاوەتەوە، هەرچەندە دوورخستنەوەیان لە کۆمەڵگە سزایەکی جەستەییش

نیه، بەڵام بەو هۆیەوە — کە زیندانی دەکرێن — کۆمەڵگە لە شەڕی ئەوان پارێزراو دەبێ و دەبێتە ڕێگر لەبەردەم بڵاوبوونەوەی بەدکاری و گەندەڵی لە کۆمەڵگەدا.

بەڵام ئەگەر کەسێك لەوانە بەراستی پەشیمان بوەوە و دەستبەرداری شەڕەنگێزی کۆمەڵگە بوەوە و هاتەوە سەر ڕێی ڕاست، بەر لەوەی ئەو سزایە بدرێ، ئەوا خوداش پەشیمان بوونەوەکەی لێ وەردەگرێ، سزادانی کەسێك کە بەڕاستی و ڕاستگۆیانە تەوبەی کردووە نە سوود نە بەرهەمێکی دەبێ.

ئەوەی لێرەدا گرنگە بریتیە لە (شاربەدەرکردنی لەسەر زەوی)، ئەمەش سزای کەسێکی تاوانبارە کە کۆمەڵگە لە گێچەڵ و بەدکارییەکانی دەترسێ، ئیتر ڕێگەی پێنادرێ بێتەوە ناو خەڵکی و کۆمەڵگە، ئەمە دوای ئەوەی کە سزا تەمێکاریانەکەی خۆی وەردەگرێ، ئەگەر وا پێویست بوو، ئەمەش بەرژەوەندی کۆمەڵگەی تێدایە، ئەمەیان بۆ ئەو کەسانە نیە، کە تاوانەکەیان گەیشتۆتە دوا ئاستی سنووری سزادانەکە، کە (لێدانی حەددە) و سزایەکی جەستەیی و دەرونیشە و بریتیە لە لێدانی سەد دار، هاکات مافی کۆمەڵگەش ئەوەیە کە دووربخرێتەوە و دابڕێت بە زیندانی کردنی، ئەگەر هاتو ئازادکردنی ببێتە مایەی ئاشووبی کۆمەڵگە، لەچاخی ئەمڕۆدا لەو کەسانەی کە شایستەی ئەم سزایەن بریتین لە تلیاکییەکان، ئەوانەی دەیکێشن یان بازرگانی پێوەدەکەن یان برەوی پێدەدەن، ئەمانە نابێ لە زیندان ئازاد بکرێن تا ئەو کاتەی بەتەواوەتی چاك دەکرێنەوە و دڵنیا دەبین لەوەی کە

دیسان نابنەوە بە مایەی تێکدانی ئاشتی و ئاسایش و ئارامی کۆمەڵگە و نابنە هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر خەڵکانی سڤیل و هاوڵاتییان بە گشتی.

بەندکردنی ئەو کەسانە لە (لەگەڵ ئیشی گونجاودا) چارەسەرێکە، تاکو بتوانن بەهۆی کار و کاسبیەکەیانەوە لەناو زیندانەکەیاندا بژێوی خۆیان و منداڵیان مسۆگەر بکەن، یان ئەگەر شاربەدەر کرابن بۆ شوێنێکی دابڕاو لە کۆمەڵگە، ئەوە کارێکی بەجێیە، چونکە لەو بارەدا نە خۆیان و نە خێزان و منداڵیان لەڕووی بژێوی ژیانیانەوە نابنە بار بەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگەوە، ئەمەش وەڵامدانەوەیەکی بەجێیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە دۆخە پڕ لە ژان و پەرێشانیە، نەك سزادان و گرتنە بەری جۆرەها سزای توند و سووکایەتیپێکردن و داهێنان و جێبەجێکردنی جۆرەها هونەری ئەشکەنجەدان بەسەریاندا، یان تێپەڕاندنی سنووری سزا شەرعیەکە،چونکە ئەم جۆرە سزادان و ئەشکەنجەدانە دڕندانەیە دەبێتە هۆی زیاتر دڵڕەقبوونی ئەو تاوانبارانە و یاخی بوون و سووربوونیان لەسەر دوبارەکردنەوە، ئەگەر ئازاد کران یان زیندانیان شکاند، بەتایبەتیش ئەگەر لە ماوەی زیندانی کردنەکەیاندا کار لەسەر راتستکردنەوەی رەفتاریان نەکرابێ، چونکە مەبەست و ئامانجی سەرەکی لە یاسای ئیسلامدا بریتی نیە لە زیندانیکردن و سزادانی تاوانباران، بەو نیازەی کە ئەمە ڕێگەیەکی باشە بۆ لادانی کۆمەڵگە لەشەڕی ئەوانە، بەڵکو ئامانجی هەرە گەورە بریتیە لە چاکسازیکردنی دۆخی ئەوانە بۆ پاراستنی کۆمەڵگە لە شەڕ و گێچەڵەکانیان، ئەمەش بەوە نایەتە دی کە بۆ ماوەی درێژخایەن زیندانی بکرێن و ئەشکەنجە بدرێن، بەبێ ئەوەی کە ڕەچاوی دۆخی تاوانبارەکە بکرێ و چاکبوونی رەفتاری بەهەند وەربگیرێ، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئازاد دەکرێن و دووبارە دەخرێنەوە ناو کۆمەڵگەوە.

## سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام:

ئەوەش کە پەیوەندی هەیە بە سزادانی هەڵگەڕاوەکان، واتا ئەو کەسانەی موسوڵمانبوونی خۆیان رادەگەیەنن و پاشان هەڵدەگەڕێنەوە، قورئانی پیرۆز، دەقی سزای دنیایی بۆ دیاریکردون، کە زانایانی ئیسلام بەو سزایانە دەڵێن (سزاکان ـ الحدود)، ئەویش ئەمپەڕ و ئەوپەڕی هەیە، لە سزای تۆڵەسەندنەوەی کوشتن تا دەگات بە سزاکانی دزیکردن و زینا و تاوانەکانی تر، کە بڵاوکردنەوەیان بەدکارین لەسەر زەویدا، سەرەڕای ئەمانەش سزایەکی تری تایبەتی هەیە بۆ ئەو هەڵگەڕاوانە، سزاکەش پەیوەندی بەو عەقیدەیەوە هەیە کە لەبنەڕەتدا کرۆك و ناوجەرگەی ئاینە، بەبێ ئەوەی کە قورئان بە راشکاوی سزایەکی دنیاییان بۆ دیاری بکات، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە هەڵگەڕاوەکان رایانگەیاندبێ کە موسوڵمان بوون و هاتوونەتە ژێر چەتری ئیسلامیشەوە پاشان رایبگەیەنن کە کافر بوونەوە و لە ئیسلام چوونە دەرەوە بەمەبەستی وروژاندنی گێچەڵ و دوودڵی لە نێوان موسوڵماناندا، هەروەکو خودا دەفەرموێ: [وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا ءَاخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ] (آل عمران ٧٢)، سەرەڕای ئەمەش قورئان تەنانەت لەم دۆخی پیلان گێڕییەشیاندا –کە زۆر مەترسیداریشە– تەنها بەیەك وشەش ئاماژە بە سزادانی دنیاییانەی ئەوان و پیلانگێڕیەکەشیان ناکات، یان هەر شتێ کە پەیوەندی بە موسوڵمانبوونیان یان چوونەدەرەوەیان لە موسوڵمانێتیەوەبێ، بەڵکو هەموو ئەو سزایەی کە قورئان سەبارەت بەوان و کارەکەیان باسی کردووە سزایەکی قیامەتیانەیە، بەڵکو لەسەر زمانی

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) جۆرە سزایەك بۆ ئەوانە باس کراوە، ئەویش وەك سەرۆکی دەوڵەت، کە هەندێ کەس تیایدا دەستیان داوەتە یاخیبوون و پیلانگێڕان بۆ شلۆقکردنی کاروباری دەوڵەتەکە، چونکە لەم بارەدا دۆزی هەڵگەڕاوەکە دۆزێکی ترە، دۆزی باوەڕ و کافربوون نیە، بەڵکو کارەکەیان دزێوە کە دەبنە مایەی هەڵگیرساندنی ئاژاوەگێڕی و تێکدانی تەبایی نێوان ڕیزی باوەڕداران[1].

تەنانەت بۆمان دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز سەبارەت بە عەقیدە، بە پێچەوانەی ئەمەوە باسی دەکات، کە باسە سەرەکیەکە لەو ئایەتانەدا و لە گەلێ شوێنی دیکەدا بریتیە لە ئازادی باوەڕ و عەقیدە و ئازادی بڕیاردان لە هەڵبژاردنی عەقیدەدا، وە جەختیش لەوە دەکاتەوە کە ئەو دۆزە توندڕەوی تێدا نەکرێ و نەبێتە مایەی هەراسانکردن بۆ ئازادی مرۆڤەکان، هاوکات جێبەجێکردنە کرداریەکانی دەسەڵاتداری حکوومەتەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) نموونەی زیندووی ئەم پەیڕەوکردنەیە، بۆ نموونە هەرچەندە جولەکەکان لە شاری مەدینەدا زۆر دژایەتی و بەرەنگاری پێغەمبەر و ئیسلام و موسوڵمانانیش دەبوونەوە، کەچی عەقیدە و یاسای ئیسلام گوشاری نەخستنەسەر بۆ ئەوەی بە زۆرە ملێ موسوڵمانیان بکات، ئیسلامیش زۆری لێ نەکردوون، نە ئەوان و نە جوولەکەکانی تری دوورگەی عەرەبی، بەڵکو دەبینین کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بانگی نوێنەرانی مەسیحیەکانی نەجرانی کرد و لە مزگەوتەکەی خۆی لەگەڵیان دانیشت و بە

---

[1] بڕوانە ئەم ئایەتانە و ڕاڤەکردنیان (البقرة ٢١٧-٢٥٦)، (آل عمران ٨٥-٩١-١٠٠-١١٧)، (المائدة ٥٤)، (النساء ١٣٧)، (النحل ١٠٦-١١٠).

زمانێكی شیرین گفتوگۆی لەگەڵدا كردن، وە نە خۆیان و نە عەقیدەكەیانی بە كەم و سوك سەیرنەكرد و ئازار و سزاشی نەدان و هیچ جۆرە ڕق و قینێكی بەرانبەریان نەبوو، بەڵكو پێی ڕاگەیاندن كە ئێوەش وەكو ئێمە لە سایەی ئەم حكوومەت و دەسەلآتەدا مافەكانتان پارێزراو دەبن، وە ئەمەش پەیمانی خودایە و ئێوە لە ئەستۆی ئێمەدان، هاوكات پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بە هاوەڵ و یاوەرانی ڕاگەیاند و ڕایسپاردن كە بەهیچ جۆرێك هەڵگرانی عەقیدەكانی تر هەراسان نەكەن و ئازاریان نەدەن، وە سنووری كەنیسە و قەشەكان مەشكێنن و بە باشیش مامەڵە بكەن لەگەڵ قیبتیە میسرییەكاندا.

نەك هەر ئەمە بەڵكو پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر) موسوڵمانانی راسپارد كە ڕێزی نەوە و ڕۆڵەی شارستانێتی فارس بگرن كە ئاگرپەرست بوون، وە ڕێزی خاوەنپەیامەكانی تر بگرن لە ئاینەكانی دیكە وەكو گاور و جوولەكەكان لەڕوی ئازادی عەقیدەییانەوە، ئەگەر چی بەتەواوەتیش پابەندی (تەورات) و (ئینجیل) و پەڕتووكە ئاسمانیەكانی خۆشیان نین.

كە لەبارەی مەجووسەكانەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێ: (وەك مامەڵەی خاوەن پەیامەئاسمانییەكان مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن، جگە لەوەی ژنیان لێ مەخوازن و گۆشتی سەربڕاوی دەستیان حەلآڵ مەكەن)[1]، چونكە ئەوە ڕوونە كە كاتێ دەگوترێ (خاوەن پەیامەكان) واتا

---

[1] ئەم فەرمودەیە پێشەوا (مالك) لە (موطأ) ەكەیدا و بوخاری و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە سەرجەم زانایانیش لەسەری كۆكن، جگە لە (أبوثور) كە یەكێكە لە هاوڕێیانی شافعی و ئەحمەد، ناوبراو دەفەرموێ: دروستە ئافرەتیان لێ بخوازرێ گۆشتی سەربڕاوی دەستیشیان

ئەوانەی پەیامی خودایان بۆ هاتووە، ئەمەش واتایەکی گشتی هەیە، مەبەست لە شارستانێتیەکەیانە نەك لایەنی پەیڕەوکردنی کتومتی پەیامەکە پیت بە پیت وەکو خۆی، واتا مەبەستەکە (تەورات و ئینجیل)ە، کە هاوکات هەروەکو گاور و جوولەکەکان خاوەنی شارستانیەتێکی مرۆیی خۆیانن و ئازادی عەقیدە دەیانگرێتەوە، لەوانەشە مەبەستەکە ئەوە بێ کە مەجووسەکانیش هەر پاشماوەی پەیام و بەرنامەیەکی ئاسمانی پێشووتریان بن، کە بە تێپەڕبوونی کات دەسکاریان کراوە و لادانیان تێدا کراوە، ئەمەش بۆ هەموو شارستانیەتێکی تر ڕاستە.

خوای گەورە دەربارەی (پەیامەکانی خۆی) و (پێغەمبەرانی) و (پەڕتووکە ئاسمانیەکان) و ئەو شارستانێتی و ئەنجامەی لەوان کەوتوونەتەوە، بە واتا فراوانەکەیان دەفەرموێ:[ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا](النساء ١٤٤)، واتا پێغەمبەر گەلێکمان ناردوە بۆ سەر ئادەمیزادەکان، کە چیرۆکی هەندێکیانمان بۆ باسکردوویت و چیرۆکی هەندێکیانمان بۆ باس نەکردووی.

---

بخورێ، وە لەوانەیە هۆکاری حەرامی گۆشتی سەربڕاوی دەستی ئەوان بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان ئاژەڵ و باڵندەی وەها دەخۆن کە لە ئیسلامدا حەرامن، یان لە پێناوی خودا و بە ناوهێنانی خودا سەر نابڕدرێن، ئەوەش بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (**البقرة** ١٧٣)، وە هۆکاری ئەوەش کە ئافرەتیان لەلایەن موسوڵمانانەوە مارە ناکرێت ئەوەیە کە عەقیدەکانی تر، بە تایبەتی (عەقیدەی مانی) ڕێگەی داوە بە بوونی پەیوەندی زایەندی (سێکسی) لە نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێدا، بە شێوەیەکی ئاشکرا و هەمە جۆر و بێسنور.

لەوانەیە سنووورداری کاریگەرییەکانی بانگەوازی ئیسلامی لە ڕابردوودا، لەسەر هەڵگرانی ئاینەکانی بووزی و هاوشێوەکانی لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا (بووزی و کۆنفۆشیۆسی) –وێڕای ئەوەی کە زۆربەی ئەو وڵاتانە لە ژێر قەڵەمڕەوی حوکمی ئیسلامیشدا بوون (وەك وڵاتی هیند)– بگەڕێتەوە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردنی موسوڵمانانی ئەو سەردەمە لەگەڵ هەڵگرانی ئاینی بووزی لە ڕووی ئاینی و کۆمەڵایەتیەوە، بەو پێیەی کە ئەوان کەسانی سەرەتایی و بتپەرست بوون، هەروەکو چۆنێتی مامەڵەکردن و قاڵبوونی بتپەرستە عەرەبەکان، ئەمەش بەهۆی نەزانینی هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو هەڵوێستە مێژوییە دەگمەنەی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامیەوەبوو کە هەیبوو بەرامبەر بە بتپەرستە عەرەبەکان، کە وا پێویست بوو خۆڕسکانە نەگاتە خاوەن پەیام و شارستانیەتەکانی تر، مەگەر کاتێ کە دژوەستانەوەیەك لە دەقی پەیامە تازەکە و پەیامە کۆنەکاندا هەبوایە، ئەوە سەرەڕای گەلێك هۆکاری تریش، بە تایبەتیش سروشتی حوکمڕانیکردنی مەغۆلییەکان بەسەر هندستاندا، ئەو مەغۆلە کەمشارستانییانەی کە پاش داگیرکردنی ناوچەکانی موسوڵمانان و ناوچەکانی تری هیندستان موسوڵمان بووبوون، هەموو ئەمانە وا ڕاڤە دەکرێن کە هۆکار بن بۆ مانەوەی زۆرترین جەماوەری ئەو گەلانە و ئەو شارستانیەتانە لەسەر ئاینە مێژووییە خورافیەکانیان، بە هۆی دووری و دابڕاوییان لە گەڵ موسوڵمانان و حوکمدارییان و بانگەوازیان بۆ ئیسلام، کە وایکرد زۆرینەی ئەو گەل و ئاینانە بکەونە دۆخێکی وا دابڕاو و دوورەردەستیەوە لەڕووی کۆمەڵایەتی و دەروونیەوە، ئەمانە سەرەڕای ئەو هەموو ستەمەی بەرامبەریان دەکرا لە لایەن مەغۆلەکانەوە.

ئەگەر بە تێڕوانینێکی گشتگیر سەرنج لە بابەتی (هەڵگەڕانەوە) بدەین بە پێی تێڕوانینی قورئانی، بۆمان دەردەکەوێ کە پەیوەندی نیە لە نێوان دۆزی (هەڵگەڕاوە) و (بنەمای ئازادی عەقیدە) و قەناعەتکردنی مرۆڤ بە عەقیدەی ئیسلامی یان هەر عەقیدەیەکی تر، کە قورئان ئاماژەی پێکردووە، هەروەها بەو تاوانی پیلانگێڕان و هەڵگەڕانەوەیەی لە قورئاندا باسکراوە، نەپەیوەندی پێوەی هەیە و نە ڕێزی ئیسلامیش کەم دەکاتەوە بۆ مافی مرۆڤ (بۆ ئازادی بیر و ڕا و عەقیدە و باوەڕ)، وەکو خودای گەورە دەفەرموێ: (لا إكراه في الدين)، واتا زۆر لێکردن و تۆبزیکردن لە ئایندا نیە، هەروەها دەفەرموێ: [وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ](يونس: ٩٩)، واتا: گەر پەروەردگاری تۆ بیویستایە ئەوا هەر کەسێ لە زەویدایە هەموویان باوەڕیان دەهێنا بەگشتی، ئەدی تۆ ڕقت لە خەڵکیە تا باوەڕ دەهێنن، هەروەها خودا دەفەرموێ: [لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ] (البقرة: ٢٧٢)، واتا: باوەڕهێنان و هاتنەسەر ڕیی ڕێنمایی ئەو خەڵکە لەسەر تۆ نیە، بەڵکو خودا ڕێنمایی هەر کەسێك دەکات کە بیەوێ، چونکە دۆزەکە پەیوەندی هەیە بە هەڵگەڕانەوە و مەبەستی سیاسی لەپشتە بە ئامانجی بەرپاکردنی گێچەڵ و دووبەرەکی لەنێوان باوەڕداران و لە کۆمەڵگەی موسوڵمانانندا، هەر پەیوەندیشی نیە بە هەڵگەڕانەوە و گۆڕینی بیر و باوەڕەوە، تاکو وەك بنەمایەك لەقەڵەم بدرێ دژ بە ئازادی بیروباوەڕ، کە گوایە دەبێ سزا بدرێن ئەو کەسانەی لە بیرو باوەڕیاندا هەڵگەڕاونەتەوە،

ئەمە ناكرێت و ڕەوا نیە، ئەگەر مەبەستی ئاژاوەگێڕی و تێكدان و سیاسەت لە پشتیەوە نەبێ.

وە هۆكاری تێكەڵكردن لە بابەتی (هەڵگەڕاوەكاندا) و ئەو شتەش كە زانایانی ئیسلام باسیان كردوە دەربارەی (سزای هەڵگەڕاوە)، پێمان وایە دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە هەڵوێستی قورئان و هەڵوێستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەربارەی هەڵوێستی بتپەرستە عەرەبەكان و ڕاگەیاندنی جەنگ دژیان بەمەبەستی هێنانیان بۆ ناو بازنەی ئیسلام، بەیەكێك لە گرتنەبەری ئەم دوو ڕێگەیە: (موسوڵمانبوونیان) یان (جەنگ كردن لە دژیان)[1]، وا تێگەیشتوون كە دەقە قورئانییەكە ڕەهەندێكی گشتی هەیە سەبارەت بە (هەڵگەڕاوەكان)، هەر وەكو ئەوەی كە شتێكی پێشوەختە ڕێگەی دابێ بە وەلانانی بیر و باوەڕ، لە هەندێ بارودۆخدا بۆ هەندێ كەس (كە هەڵگەڕاوەكانن).

زوربەی زانایان لەو باوەڕەدان كە مامەڵەكردن لەگەڵ (بتپەرستە عەرەبەكان) و هەر شتێ پەیوەندی بەوەوە هەیە لە ئایەتە قورئانییەكان (ئایەتەكانی شمشێر)، نەسخ كراونەتەوە بەو ئایەتە قورئانییانەی كە پەیوەستن بە ئازادی بیر و باوەر و عەقیدە و لێبوردن لە كەسانی نا

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم پەڕتوكە لاپەڕە (٥٩): Towards an Islamic…Abu Sulayman، پەخشی پەڕتوكەكە: پەیمانگای جیهانی فكری ئیسلامی، واشنتۆن، ولآتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا ١٩٦٨، و لەلایەن د.ناصر أحمد المرشد البريك وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، بە ناونیشانی: (بیردۆزی ئیسلامی بۆ پەیوەندیە نێودەوڵەتیەكان–ئاراستە نوێیەكانی هزر و پرۆگرامگەری ئیسلامی).

موسوڵمان و پێکەوە ژیانی هاوبەش، بەم ڕێگەیەش فراوانتر کاریان کردوە و لە بیرۆکەی (نەسخ)ەوە گەیشتونەتە دۆزینەوەی چارەسەرێکی ڕووکەشانە بۆ کێشەکە و هەمان ئەو شتانەشیان لەوەدا جێگە کردۆتەوە کە پێیان وابوە پێچەوانەی دەقەکانن، بەبێ ئەوەی سەرنج لەوە بدەن و وردببنەوە و تێبگەن لەوەی کە هەموو دەقێکی قورئانی پەیوەستە بە دۆخ و بارێکی مرۆییانەی تایبەت و جیاواز لە دۆخ و بارەکانی تر و ئەوەش کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی کردووە بەو شتانەی پەیوەستن بە (نەسخ)ەوە و پەیوەستن بە پەیامی ئیسلام و دەسەڵاتی قورئان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسا و شەریعەتانەی کە گەلانی پێشووتر لێیان لاداوە و دەستکارییان کردوون، لەگەڵ قۆناغە مرۆییە رابردوەکانی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی، کە ئەمانەش قۆناغە رابردوەکانی گەلانی دێرین دەگرێتەوە و بە قۆناغی سنوورداری ئامانجەکان و دەسکاریکردنی دەقەکان ناسراوە و زۆر جیاوازترە لە قۆناغی هاتنی پەیامی ئیسلامی، وەك پەیامێکی سەرتاسەری و کۆتایی و مرۆیی ئەوتۆ کە ڕێنمایی هەموو دۆخ و بارەکانی مرۆڤ و پەرەسەندنەکانی دەکات لە هەموو کات و شوێنە جیاوازەکاندا [وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ](المائدة: ٤٨)، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بزانین کە ئیسلام بە پلەی یەکەم بانگەوازە بۆ ڕێنماییکردنی مرۆڤ، بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی و هەموو مرۆڤەکان، سەبارەت بە گوزەران و ژیانیان لە

ئێستا و  هەموو دۆخەکانی ئایندەشیاندا وە لە هەموو کات و شوێنێکدا، بۆیە وتاری ئیسلامی وتارێکی جیهانی و گەردوونیە، ناو خۆیی و سنووردار نیە، تایبەت نیە بە کات و شوێن و گەل و وڵات و نەتەوە و ناوچەیەکی دیاریکراوەوە، ئاراستەی هەموو مرۆڤێك دەکرێ، هەرگیز ڕەنگێك، زمانێك، چینێك، بەرەیەك، بەتەنها نادوێنێ، بەڵکو لەگەڵ ناخ و ماکی خودی مرۆڤەکاندا دەدوێت، ئەمەش لە هەموو کات و دۆخ و بارەکاندا، وە ئاستی شیاوێتی و بەرپرسیارێتی ژیان و شارستانێتی و ئەرکی مرۆڤایەتیانەی مرۆڤەکان دەدوێنێ، وە دەبێ توێژەرانی ئەم بوارانە دەرك بەو دۆخە بکەن کە عەرەبە بتپەرست و لادێنشین و نەفامەکانی تێدا دەژیان، ئەوان کەسانی سەرەتایی و تیرەگەر و هۆزپەرست بوون پێش هاتنی ئیسلام، ئەمە بۆخۆی تایبەت بەو دۆخەی عەرەبە نیشتەجێکانی ئەو دەڤەرە لەو سەردەم و دۆخە تایبەتیەی خۆیاندا، نابێ گشتاندن (تعمیم) ی بۆ بکرێ، وە ئەمە ئەو دۆخە نیە کە گەل و نەتەوە و کولتوورەکانی تری تێدایە، یان تێدابوە لەو چاخەدا، هەر لە گەلانی خاوەن شارستانێتیەوە تا گەلانی خاوەن پەیام، واتا ئەوانەی پەیامێکی ئاسمانیان بۆ هاتوە، وە دۆزی ئەم هۆزە نەفامە دەوارنشینانە، کە هۆزێکی بەرایی بوون، دۆزی ئازادی بیر و باوەڕ یان ئاین نیە، بەڵکو دۆزی کەمتەرخەمی مرۆییە بەرانبەر شارستانێتیەکەی، وە نەبوونی شیاوێتی شارستانیانەی مرۆیی کۆمەڵایەتیانە، خودا دەفەرموێ: [وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ](الحجرات: ١٤)، واتا: عەرەبە دەشتەکیەکان گوتیان: باشە ئەوا باوەڕمان هێنا، پێیان بڵێ نا تا

**ئێستا ئێوه باوەڕتان نەهێناوه، بەڵکو بڵێن موسوڵمان بووین، ئەگینا لەڕاستیدا تا ئێستا باوەڕ نەچۆتە ناخی دڵتانەوه، هەروەها خودا لەچەند ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم دۆز و دۆخەیان دەدات و دەفەرموێ: [ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ( ٩٧ )وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ( ٩٨ )وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ( ٩٩ )]**(التوبة: ٩٧ — ٩٩)، **هەروەها دەفەرموێ: [ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ]**(آل عمران: ١٥٤)، **هەروەها دەفەرموێ: [أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ]**(المائدة: ٥٠)، **هەروەها دەفەرموێ: [إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ]**(الفتح: ٢٦)، **هەروەها دەفەرموێ: [وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا]**(الأحزاب: ٣٣).

لەبەر ئەوە پێویستە وریا بین و نەکەوینە هەڵەوە، ئەم دوو بارودۆخە جیاوازە تێکەڵ نەکەین، دۆخی عەرەبە سەرەتاییە نەزانەکان و وتارەکانیان، لەگەڵ دۆخی وتاری هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، کە قوتابی قورئان و پەروەردەکراوی، بەردەستی پڕ حیکمەتی پێغەمبەری مامۆستایانن، یان وتاری میللەتە خاوەن شارستانێتی و پەیامەکان، وەکو گاور و جوولەکە و مەجووسیەکان و هاوەڵانی تر کە خاوەن پێگە و ئاین و شارستانێتی سەربەخۆی خۆیان بوون.

جا ئەگەر ئێمە بەم چەشنە لە واتای قورئان قووڵ بووینەوە، وە بەم دیدگەیە و بەم چەمکە فراوانە سەرنجمان دا، ئەوا بەباشی هەڵوێستی قورئانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە سەبارەت بە ڕاڤەی سیاسەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بەرامبەر بەو عەرەبە سەرەتایی و بتپەرستانەی کە لە سوورەتەکانی (الأنفال) و (براءة) دا باسکراون.

ئەم دوو سوورەتە بە وردی کەمتەرخەمی ئەو هۆزە عەرەبانەی وێنا کردووە کە لەسەرەتای ژیانی شارستانی و کۆمەڵایەتیدا بوون، لەو سەردەمەدا، وە چۆن ئەوان نەفام بوون، ئەی نەفامی ئەوان لە چیدا بوو؟ ئەوان (نەزان) و (بێپەیمان) و (ناپابەند) و (ئەستۆ نەگر) بوون، واتا یاساکانی شارستانی و پێکەوە ژیانیان نەبوو، بەو هۆیەوە دابڕاو بوون، بەردەوام لە ئەم لاو ئەولاو باز بازێندا بوون، نە پێکەوە ژیانیان دەزانی و نە ئاسایش و باوەڕداری و دڵنیایی، وەکو کەمتیار و گورگ وابوون، بۆیە ڕاهێنانیان و راکیشانیان بۆ ناو کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتییانەی کۆمەڵایەتییانەی شارستانییانە، کارێکی دەگمەن و گرنگ و پێویست و

سەخت بوو، ئەمەش ئەگەر تەنها دەرهێنانی ئەوان بێ لەو کەمتەرخەمیە کۆمەڵایەتییە مرۆییە شارستانیە و هێنانیان بۆ یەکەم دەروازەی راهێنانیان لەڕووی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیەوە، ئەمەش نایەتە دی مەگەر هەر بەوەی کە بخرێنە ناو سستمی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی وا کە بنەما کۆمەڵایەتی و شارستانێتییە پێویستییە ئیسلامییەکانی تێدابێت.

گرنگترین دوو کۆڵەکەی راگری ئەم مەرجە یەکەمینیانە لەم سیستمە کۆمەڵایەتییەدا، ئەوەیە کە لەهەنگاوی یەکەمدا هەموویان بەبێ جیاوازی کۆمەڵایەتی ڕێکبخرێن لە ڕیزی نوێژی بەکۆمەڵدا، وە لە ڕوە مادیەکەشەوە ئەرکی زەکاتدان پەیڕەو بکەن، بۆیە ئەو کەسەی لەو دەمەدا پرسیاری ئاراستە دەکرا بۆ قەبووڵکردنی ئیسلام بریتی بوو لە سەربازەکان، وەخۆشیان ئەوانە بوون کە دەیانویست بەشداری جەنگەکان بکەن و ئەوەشیان وەك هاتنە ناو ئیسلام لەقەڵەم دەدا و پرسیاریان لەبارەوە دەکرد، هەرگیز پرسیار لە ئیسلامبوونی ژن نەدەکرا لەو قۆناغەدا، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) کەسێکی لە قوڕەیشیەکان ڕەتکردەوە کە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوو موسوڵمان ببێ، ئەمەش دوای رزگارکردنی مەککە و بەرقەراربوونی سستمی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە نێو هۆزە عەرەبە سەرەتاییەکانی دوورگەی عەرەبی، چونکە لەو کاتەدا ڕەتکردنەوەی داوای ئەو جۆرە کەسانە بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە بەو مەرجەی کە هەر بۆ جەنگ و کوشتار دێت، نە دەبووە هەڕەشەیەك بۆ سستمی کۆمەڵگە و بەرقەراربوونی ئاسایشەکەی، بە تایبەتیش لە مەککەدا، کە تا بەجەنگ موسوڵمان نەکرا ملی نەدا بۆ فەرمانڕەوایی ئیسلام، بەڵکو خەڵکەکەی بە توندی دژی ئیسلام

وەستانەوە و هاوپەیمانیان دروست دەکرد لەگەڵ نەیاراندا بۆ بەربەرەکانێی ئیسلام و موسوڵمانان.

بۆیە خاوەن بیری ورد و تێگەیشتووی هۆشیار (ئەبوبەکری سیدیق) (خوای لیّ رازی) بێئاگا نەبوە لە چەمکی واتای راستەقینەی ئەو ئایەتەی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەربارەی هۆزە عەرەبەکان: [قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ] (الحجرات: ١٤)، چونکە بینیبووی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) چۆن لە ناوەرۆکی دەلالەتی کۆمەلأیەتییانە و مرۆییانە و شارستانییانەی ئەو ئایەتە تێگەیشتبوو، وە بەو تێگەیشتنەشەوە هەڵوێستی نواند، کاتێك کە (شۆڕشی دژەشۆڕش) ی هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان بەرپابوو، هەر ئەو هۆزانە خۆیان جەنگەکەیان دروستکرد، چونکە رازی نەبوون مل بدەن بۆ سستمی کۆمەلأیەتیانە و شارستانییانەی ئیسلام.

ئەم جەنگە لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) سەری هەڵدا، بەسەرکردایەتی هەندێ لەو کەسانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان بۆ خۆیان دەکرد –هەر لەو رۆژگارانەشدابوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) کۆچی دوایی کرد و (ئەبو بەکر) بوو بە جێنشینی کاروباری موسوڵمانان و کێشەی ملنەدانی ئەو هۆزانە پەرەی سەند، سەرچاوەکەشی لەوەوە بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لێی تێگەشتبوو، لەبەر رۆشنایی دەلالاتی گشتی ئایەتەکانەوە، لەوەوە بوو کە ئەوان ئامادەنەبوون زەکات بدەن و لە ئەرکە یەکەمینەکانی سستمی

کۆمەڵگەی ئیسلامی و گرتنە ئەستۆی ئەو ئەرکە دەرچوونە دەرەوە و رازی نەبوون مل بدەن بۆ سستمی کۆمەڵگەی ئیسلامی و شارستانێتی، ئەمەش کارێکە پەیوەندی نیە بە ئازادی بیر و باوەڕ و عەقیدەوە، چونکە عەقیدەی ئیسلامی سروشتی وایە کە دەبێت خۆڕسکانە بچێتە ناو دڵەکانەوە و بچەشپێت، ئەوەش بە زۆرەملێ ناکرێ، بەڵکو مرۆڤ دوای ئەوەی بەرگی کۆمەڵایەتیانەی شارستانیانەی ئیسلام دەپۆشێ، ئیتر وردە وردە خۆی دروست دەبێ و لە دلاْندا دەچەسپێ.

عەقیدە و باوەڕی ئیسلامیش وەك شارستانیەتێکی نوێ، بەراورد ناکرێ بە عەقیدەی عەرەبە بتپەرستە بەراییەکان، بەڵکو کارەکە پەیوەستە بە سستمی کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵگە و ئەو کەمتەرخەمی شارستانیەتە و مرۆییانەی ئەوانەوە، کە ئەم لێتێکەڵبوونە لای هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) دروست بووە، لەوانەش (عومەری کوڕی خەتتاب) (خوای لێڕازی بێت) لەکاتی کۆچی دوایی و سەرەمەرگی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر)، کەوتە بارێکی دەروونی توندەوە بەهۆی کاریگەری ڕووداوی وەفاتی پێغەمبەرەوە، هاوکات هەبوونی هەرەشەی زۆری ناموسوڵمانان لەو کاتەدا لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی، بەتایبەتیش هەرەشە و هێرشی هەردوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی جیهان (فارسەکان و ڕۆمەکان) بۆ دەوڵەتێکی تازە پێگەشتووی وەکو دەوڵەتی ئیسلام و سەختی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوانە، دیارە لەو دۆخە ناسکەدا و ئەمجا هەڵگەرانەوە و شەڕی هۆزە عەرەبەکانیشی بێتەسەر کارەکە سەختتر دەکات، ئاژاوەکان لەخاکی دوورگەی عەرەبیدا سەریان هەڵدا، وەك وەلاْمدانەوەی خەڵکە

ناموسولْمانەكان بۆ بەرپەرچدانەوەی زەكات نەدان و دەرچوون لە بازنەی دەسەلاْتی شارستانێتی ئیسلامی و دژوەستانەوەیان و گەڕانەوەیان بۆ دۆخی جارانیان، تا وای كرد جەنگی هۆزە هەلْگەراوەكان شاری مەدینەشی خستە مەترسیەوە، چونكە ئەو هۆزانەش كەم نەبوون كە لەدەوروبەری ئەو شارە بوون، هەمەجۆر و هەمەچەشن و ڕەگەز پەرست و شەڕنگێز و خوێنڕێژ و تالاْنچی بوون، گوێیان نەدەدا بە بەهاكان و ویژدانیان نەدەخستە كار. وەك شاعیرێكیان گوتوویەتی: (من تەنها تاكێكم لە هۆزەكەی خۆمدا، ئەگەر ئەوان بەلاڕێدا چوون منیش بەلاڕێدا دەچم، گەر ئەوانیش ڕێگەی ڕاستیان گرت منیش ڕێگای ڕاست دەگرم).

بەلاْم خۆڕاگری و بیرتیژی (ئەبو بەكر) (خوای لێڕازی بێت) ڕۆشنی تێروانینەكانی و گرنگی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن و نەیارانی ئیسلام، وای لێكرد سوور بێت لەسەر هەلْوێستەكەی و بەردەوام بێ لە لەناوبردنی ئەو دەستە وێرانكەرەی هۆزەكان كە دژی زەكاتدان هەستابوون.

وە دەرنەخستنی هیچ ئاماژەیەك كە بەلْگە بێ لەسەر لاوازی دەسەلاْتی موسولْمانان بەرامبەر دوژمنە سەرسەختەكانیان، كە بۆیان لە كەمیندابوون و چاویان خستبوونە سەر، لە دوورگەی عەرەبی و دەرەوەی دوورگەی عەرەبیشدا، سەرەرای ئەوەی كە هەندێ بێزاری و لێتێكەلْبوون یەخەی بە بیری هەندێ لە هاوەلاْنی پێغەمبەر گرتبوو، چونكە هەندێ لەوانە گومانیان وابوو كە ئەمە دۆزی باوەڕە، نەك دۆزی ئیسلام، وە قورئانیش وا دیاری كردوە كە ئەوانە (لم تؤمنوا) (الحجرات ١٤)، وا دیاربوو كە ئەمانە بە تەواوەتی نەچوبوونە ناو قولاْیی ئیسلامەوە، بۆیە هەر بە مەترسی مابوونەوە

بۆ سەر شاری مەدینە و دەوروبەری وە ئاوێتەبوونێکی مرۆییانە دروست نەبووبوو لە نێوان باوەرداران و ئەم هۆزانەدا و رێگەشیان پێ نەدرابوو بە چوونەدەرەوەی ئازادانە لە داخوازییە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و مرۆیی و شارستانییانە وە گرنگی پێگەی ئەم هەڵگەراوانە لەناو سستمی ئیسلامدا، ئەوەبوو سووربوون و متمانە توند و تۆڵەکەی (ئەبوبەکر) سەر لەنوێ متمانەی لە دڵی موسوڵماناندا دروستکردەوە، بەوەی کە کەسێکی سەرکردە و بە حیکمەتە و ژیرە، بەتایبەتیش کاتێ دەربارەی ئەو هۆز و کەسە هەڵگەراوانە پێیان گوت: (ئاخر ئەوانە دەڵێن: لاإله إلا الله)، ئەویش لە وەڵامیاندا فەرمووی: (سوێند بەخوا ئەوانە لەناو دەبەم کە جیاوازی دەکەن لە نێوان نوێژ و زەکاتدا)، ئەمەش ئەو قسەیە بوو کە (عومەری کوری خەتاب ) (خوای لێ رازی بێت) فەرمووی: (سوێند بەخوا کاتی سوربوونی ئەبوبەکرم بینی، چونکە ئەو و کۆی زانایانیش دەزانن ئەبوبەکر کێیە؟ وە خەسڵەتەکانی چین؟ تا خودا رێنمایی کردم و بەرچاوی ڕۆشن کردمەوە بۆ وەرگرتنی قسەکەی ئەبووبەکر.

هەموویان بەتایبەتی (عومەر خوای لێ رازی بێت) زرنگی و بیرتیژی و ڕووناکبیری تێڕوانینی ئەبوبەکریان بۆ ڕوون بوویەوە، وە کاری ڕووبەڕووبوونەوەی هۆزە عەرەبەکانیش کاری راگەیاندنی عەقیدە و باوەڕ نیە، [قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ](الحجرات: ١٤)، بەڵکو بە پلەی یەکەم کێشەکە ئەوەیە کە ئەم هۆزە نەفامانە ئامادەنەکراون بۆ ژیانێکی شارستانییانەی وا کە شایستەی ئەوەبن بگەنە ژیانێکی کۆمەڵایەتییانەی مرۆییانەی پڕ لە ژیار و ئاشتی و بەرفەرمانی کردنی خودا، کە بەبێ ئەم

شارستانێتیه ئیسلامیه مرۆڤ هیچ بەها و بوونێکی نیه، [قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ](الحجرات: ١٤)، هەروەها بەهۆی نادانی و نەفامییانەوە بوبوونە پەڵەیەکی ناشرین بەسەر دەوڵەتی ئیسلامەوە و مەترسیش بوون بۆ خودی خۆیان و شارستانێتیەکەشیان، ئەمەش بەداخەوە زۆربەی زانایانی وا لێنەکرد کە دواتر گوێ لە دەلالاتەکانی بگرن و دوو شتیان تێکەڵ بەیەکتری کرد لە ڕووی داخوازییانەوە (ئامادەکاری و شیاوێتی کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤانەی شارستانییانە) لەگەڵ (ئازادی بیروباوەڕ و عەقیدە) و کەوتنە ناو تەم و گومانی ئەوەوە کە دەکرێ مافی بنەرەتی مرۆڤ تێپەڕێنرێ لە (ئازادی بیر و باوەر)دا، کە پێگەی بەرپرسیارێتی مرۆڤایەتییە و بنەمایەکی تۆکمەیە و لۆژیکی بنەڕەتی ئیسلام و ئاینە ئاسمانییەکانە، وە ئەوان گومانیان وابرد کە دەکرێ ئەم مافە عەقیدەییە بنەڕەتییە تەوزیف بکرێ، هەروەکو چۆن دەکرێ هەڵیش بوەشێتەوە لەبەر خاتری بەرژەوەندییە سیاسیەکانی دەوڵەت، بۆ ئەم مەبەستەش بیانووی نەسخبوونەوەیان بەکاردەهێنا (واتا هەڵوەشاندنەوە) لە قورئاندا، کە گوایە ئایەتێك ئایەتێکی تری هەڵوەشاندۆتەوە، کە هەرگیز شتی وا لە قورئاندا نیە و ئەوە لەگەڵ گەورەیی قورئاندا شیاو نیە، مەگەر ساتێ کە بەتەواوی لەچەمك و واتاکانی قورئان تێبگەین کەلەسەر هەموو دۆخەکان مرۆڤ دەدوێنێ، هەروەها تێبگەین، لە راڤەکردنی جیاوازی (کات) و (شوێنەکان)، ئەگەر لەو ئاستی تێگەیشتنەدا لەقورئان تێنەگەین ئەوا ناهەقیمان کردوە بەرامبەر بە

گەورەیی قورئان و کەوتووینەتە هەڵەوە و دەبێ چاو بەخۆماندا بخشێنینەوە، ئەوە هەڵەیەکە و موسوڵمانان بە ئەنقەس شتی وا ناڵێن، چونکە هەموو ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان و هەموو چەمکێك و هەموو ئاراستەکردنێکی پەیوەستە بە دۆخێك لە دۆخەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگە مرۆییەکەی، ئەوەش بەپێی گۆڕان و جیاوازی کات و شوێنەکان،یەك بەیەك بێت یان بە گشتی، بۆیە دەبێ مرۆڤ لەکاتی خۆیدا پابەندبوونی بەپێویست بزانێ و یەکسەر پەیڕەوی بکات و لێی لانەدات.

لەبەر ئەوە هەر هەموو ئەوانەی کە قورئان ئاماژەی پێکردووە دەربارەی (نەسخ بوونەوە و بیربردنەوە)، وەك هەندێ زانا باسیان کردووە پەیوەستن بە قورئانەوە لەو روەوە کە قورئان بەپەیامە پێشینەکانەوە بەستراوەتەوە کە بۆ گەل و میللەتانی تر رەوانە کراون لەرابردوودا و دواتر دەستکاریان کراوە و هەندێکی فەوتاوە و لەبیرچۆتەوە و قۆناغەکانی گەشەی مرۆڤیش ئەوانەی تێپەڕاندووە، لەبەر ئەوە پەیامی ئیسلامیش کە قورئانە ئەوانەی تێپەڕاندووە و بە دەسەڵاتێکی توند و بەهێزترەوە زاڵ بووە بەسەریاندا، هەروەکو خودای گەورە لەم ئایەتانەدا باسی فەرمووە: [ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ] (المائدة ٤٨)، [مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ

](البقرة ١٠٦)، [مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ](آل عمران ٧)[١].

---

[١] لێکچوون مانای هەبوونی کێشە نیە لە واتا قورئانیەکاندا، یان لە ناڕوونی باسی دارشتە قورئانیەکان، نەخێر هەرگیز پەرتووکی خودا وانیە هەموو قورئان، بەپێی دەقی خودی قورئان ڕوون و وردە و هیچ خواریەکی تێدا نیە [قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ](الزمر: ٢٨)، بێگومان مانای لێکچوون لێرەدا —هەر وەك هەندێ زانا بۆی چوون— ئاماژەیە بۆ لێکچوونی هەندێ چیرۆك و ئاماژە و ئاراستەی قورئانی، کە قورئان وەك ڕێگرییەك بەرپەرچی گەل و نەتەوە پێشینەکانی پێداوەتەوە لە ڕوداوە مێژوویەکاندا و ئەو پەیام و پەڕتووکە دەسکاری کراوانەشیان کە بە ئارەزوی خۆیان گۆڕانکارییان لە دەقەکانیاندا کردووە و بگرە پەندی پێشینانی خۆیان تێکەڵ کردووە، قورئان باسی ئەم کارە دزێوە لێکچووانەی ئەوان دەکات کە کردوویانن بەمەبەستی ڕێخۆشکردن بۆ دەسکاریکردنی ئەو پەیامانەی کە خودا بە راستی و دروستی بۆی ناردوون، دواتر ئەمە لەناو موسوڵمانانیشدا سەر هەڵبدات بۆ دەستکاریکردنی دەقەکانی قورئان و ناشرینکردنی ئیسلام، بەداخەوە ژمارەیەکی کەم لەم هەوڵە دزێوانە بەجۆرێك لە جۆرەکان سەریان گرت و رژانە ناو سستمی بیر و هزری ئیسلامییەوە و گەلێك بنەماشی لێ وێران کران، هەروەکو چۆن دەنکۆڵە ژەهرێك دەتوانێ تەواوی جەستەیەکی ساغ لەناوبەرێت، نابێ هیچ نەرمیەك بنوێنرێ بەرامبەر بە تەنانەت تەنها یەك دەقیش ئەگەر دژ و پێچەوانەی سیستمە سەرانسەرییەکەی ئیسلام و بنەما و چەمك و نەگۆڕەکانی بێ، ئەمە ئەوەیە کە پەیوەندی بە ڕەخنەگرتنی مەتنەوە هەبێ، بەداخەوە هەندێ توێژەر بە هەڵە لە مانای لێکچوون لەم ئایەتە تێگەیشتوون و وادەزانن مەبەستی نادیاری دەلالەتەکەیەتی، ئەمەش ئەو هەڵەیەیە کە دەروازەی والاَ کردوە بۆ زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان و مێژوو و کلتوورنووسەکان و فەرموودە هەڵبەستراوەکان تاکو لادان بکرێ وەکو دەقی ئاینەکانی پێشوو، وە بێنە ناو ئەدەبیاتی ئیسلامییەوە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی توێژەران لەو بارەیەوە و هەندێکی تریش بە مەبەست وایان کردوە و دواجار زیان گەیشتوە بە هزری ئیسلامی و تا ئێستاش پێوەی گیرۆدەیە و هەندێ لە توێژەران بەردەوامن لە بژارکردنی و کۆششی زیاتریشی دەوێ، تەنانەت هەندێ لە رۆشنبیرانی هزری ئیسلامیشی تێوەگلاندوە لەم سەردەمەشدا،

بەم جۆرە هەڵگەڕانەوەی هۆزە عەرەبەکان هیچ پەیوەندییەکی نیە بە سەپاندنی عەقیدە و باوەڕەوە، یان بەوەی کە عەرەب یان غەیرە عەرەبن، یاخود خزم و کەسی موحەممەدن (دروودی خوای لەسەر) یان هۆزی ئەون، وە ئەمانە نە بنەمای دەوڵەتی ئەون و نە هی دەوڵەتی ئیسلام، هەریەکە لەمانە ناشێ بۆ ئەوەی سروشتی پەیامی ئیسلامی بگۆڕن، یان سروشتی بەرپرسیارێتی مرۆڤ، وە یان سروشتی بانگەوازی ئیسلامی یان وتاری ئیسلامی بۆ خەڵکی، لەبەر ئەوە هەڵوەشاندنەوەی مافی ئازادی بیر و باوەڕ ڕەوا نیە، کە ئەوە بەرپرسیارێتی مرۆڤ خۆیەتی، وەمافێکی تایبەت بە خۆیەتی.

ئیسلام ناترسێ لەوەی کە کەسێك لە بیروباوەڕەکەی هەڵبگەڕێتەوە، دوای ئەوەی کە بەچاکی ئاینەکەی ناسی و باوەڕی پێهێنا، وە باوەری بە خودا و ڕۆژی دوایی هێنا لە قوڵایی ناخیدا (ویژدانیدا) و کاری پێکرد و بنیاتنانی چاکەکاری ژیانی لەسەر دامەزراند و کاری ئاوەدانکردنەوەی زەوی لەسەر بەرپاکرد (ئامانجەکە)، مرۆڤی لەم جۆرە لەوە ناترسێ کە سەرلەنوێ

---

باسکردنی ڕابردووی ئەو گەلانەی پێشوو پێویست بەو هەموو وردکردنەوەیە ناکات کە زیاتر بێ وەك لەوەی لە قورئاندا باسکراوە و ئەوەش ئەو مەبەستە قورئانیە نیە کە قورئان بیەوێت و دواجار دەسکاریکردنی پەڕتووکە ڕابردووەکان سەری خۆیانی خوارد و تێداچوون، مەگەر قورئانی پیرۆز ئەو چیرۆکانە وەك ڕووداوی مێژووی و ئاراستەکردن باس دەکات، بۆ نموونە خودا باسی یارانی ئەشکەوت دەکات: [أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا](الكهف ٩)، هەروەها لە ئایەتی (٩-٢٢) وە ئایەتی (٢٥-٢٧) لە هەمان سورەت.

بگەڕێتەوە بۆ هەڵەکانی پێشووتری و ڕووکردنە خورافیات و ڕەگەزپەرستی و سروشتپەرستی هیچگەرایی(نەهیلیستی یان پووچگەرایی).

ئەمە جیاوازە لە کەمتەرخەمی کۆمەڵگە و دەوڵەت وە کەمتەرخەمیکردن لە دامودەزگا پەروەردەیی و فێرکارییەکان لە گۆشکردن و پێگەیاندنی خەڵکی بە گشتی و نەوجەوانان و تازە پێگەشتوان بە تایبەتی، لە بەرامبەر بەجێهێنانی ئەرکەکانی لە بوارەکانی بانگەواز و پەروەردە و فێرکردندا، کە ئەگەر وا نەبێ ئەوا دواتر هەر ئەمە دەبێتە هۆی زێدەڕەویکردن و سەپاندنی کۆت و بەند و سزا بەهۆی بڕوای هەڵە و لادانی هەندێك کەسی نەزانەوە، تەنانەت لە ئێستادا نزیکە لەوەی باوەڕی گشتی و زۆرینەی خەڵکی بە ڕۆشنبیرانیشەوە لە زۆربەی وڵاتاندا بەهۆی ئەم کەمتەرخەمیکردنەوە دووچاری گومان و لاوازی بۆتەوە، کە قووڵنەبوونەوەیان پێوە دیارە لە تێگەیشتنی چەمکی راستییەکان و لاوازی هێزی قەناعەت پێکردن و وەرگرتنی عەقیدەکە بە شێوەیەکی ورد و ژیرانە.

ئەو کەسەی هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام و عەقیدەکەی و باوەڕهێنان بە خودا و پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر) و بشیەوێت ڕێگەی بنیاتنانی چاکەکاری لەم دنیایەدا بگرێتە بەر ناشێ هەڵبگەڕێتەوە، سا مەگەر هەڵگەڕانەوەکەی بەهۆی (نەخۆشیەکی دەروونی) یان نەزانینی تێگەیشتن لە (ڕۆشنبیری ئاین) یان مەبەستێکی تری وەکو (عەقیدەیی یان سیاسی یان مادی بەرژەوەندیدار)ەوە بێت.

وە هەر جۆر و بارێك لە هەڵگەڕانەوە کە ڕوودەدات، چارەسەرێکی گونجاوی خۆی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر هۆکارەکە نەخۆشی دەروونی بوو، ئەوا

چارەسەری دەروونی هەیە، وە ئەگەر نەفامی و نەزانی بوو، ئەوا پێویستی بە فێربوونی زانست و روونکردنەوەی راستییەکان هەیە لەپاڵ پشوودرێژی و ڕوونکردنەوەی شتە تەماوی و گوماناوییەکاندا، ئەوەش کە هۆکاری سەرەکیە بۆ هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لەم سەردەمەدا بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵ و پێکەڵبوونی گوتاری ئیسلامی و کەمتەرخەمی لە پەیڕەوکردنی بواری هزری ئیسلامی هاوچەرخ و واقعی پەراوەکردنی ئێستای موسوڵمانان لەسەر ئاینەکەیان و ئەمەش لەگەڵ دۆخی نەفامی و نەخۆشیەکەشدا هاوتەریب درێژەی هەیە، بۆ کەسێ کە تاکو ئێستا لە نەخۆشییە دەروونییەکەی چاك نەبۆتەوە یان ئەو کەسەی تا ئێستا ڕێگەی ڕێنمایی وەرنەگرتووە و بەرچاوی ڕۆشن نەبۆتەوە سەبارەت بە ئەو شتانەی پەیوەندی بە (ئازادی) و (هەڵبژاردن)ەوە هەیە، دوای ئەم هەموو ڕێگەچارانە ئەگەر کەسەکە هەر سوربوو لەسەر هەڵگەڕانەوەکەی خۆی لە ئیسلام ئەوا ئیتر ئەوە بڕیاری خۆیەتی و بەرپرسیارێتی و تاوانی خۆی لە ئەستۆی خۆیدا دەبێ لەبەر بارەگای خودادا، بەڵام ئێمە پێشتر ئەوەمان بەباشی ڕوونکردەوە کە ئەگەر ئێمە بەژیرانە و هۆشیارانەوە ئەرکی پەروەردەیی و بانگخوازی و فێرکاریمان بە پاکی پەیڕەوکردبێ هەرگیز مرۆڤی ژیر و هەراش و تەندروست ناکەوێتە ئەو تەڵەیەوە و ئیسلامیش ناترسێ لەوەی کەسێك لێی هەڵبگەڕێتەوە کە بەتەواوەتی لە ناخ و ناوەڕۆکی تیۆری و پراکتیکی ئیسلام تێگەیشتبێت.

بەڵام ئەوەی کە پێویستە هەڵوێستەیەکی درێژخایەن لە ئاستیدا بکەین – بەداخەوە– ئەوەیە کە بوونی هەژاریەکی زۆر و دەست بەتاڵی و بێکاری و

نەفامی لە بەرامبەر تێگەیشتنی راستەقینەی ئەم ئاینە و تاسە و پەلەپەلی هەرزەکاران بۆ گەیشتن بە خواستە پڕ لە کەف و کوڵەکانیان و گوێپێنەدانی کۆمەڵگە بەم هەرزەکارانە و فەرامۆشکردنیان، پێکەوە تێکەڵ و ئاوێتە بوون لە کۆمەڵگەدا و بۆتە هۆی ئەوەی نەیاران لە کەمیندا بن بۆ قۆرخکردنی ئەم دۆخە و قۆستنەوەی بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجە زیانبەخشەکانیان.

بەڵام ئەگەر هەڵگەڕانەوەکە بۆ مەبەستێك بێ، مەبەستەکەش زۆر ترسناك گەورەبێت، ئامانجی ئەشکەنجە و ئازاردانی موسوڵمانان بێ، یان بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و گێچەڵ بێ بۆ تێکشکاندنی ریزەکانی موسوڵمانان و نانەوەی دووبەرەکی و شێواندنی ئاینەکەیان بێت، ئەوا لەم بارەدا تەماشای هەر دۆخێك لەم دۆخانە و هۆکار و پاڵنەرەکانی دەکرێ، هەریەکە و بەپێی خۆی و وروژێنەرەکانی، بێگومان لە بارە زۆر توندەکانیدا دەچێتە بواری سنور بەزاندن و بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و بەدکاری لەسەر زەویدا و پێشێلکردنی ئازادیەکانی بەرامبەر، بێگومان هەرگیز ئەمەیان لە بواری ئازادی عەقیدە و بیروباوەڕدا جێی نابێتەوە و هەر هیچ پەیوەندیەکیشی بەوەوە نیە، دیارە لەم بارودۆخانە بە ورد و درشتیانەوە دەخرێنە بازنەی ناچارییەوە و ئەگەر پێویستیشی کرد بەپێی ئاست و جۆر و رەچاوکردنی دۆخەکە سزای شیاو دیاری دەکرێ.

بەڵام ئەگەر هەڵگەڕانەوەکە لە کەسێکەوە بوو، کە وادانراوە ئەو کەسە ئیسلامی ناسیوە و دواتر هەڵگەڕاوەتەوە بەهۆی کەللەرەقی و سووربوونی خۆیەوە، یان بەهۆی باشوربوونەوەیەوە، یان نەزانی و ڕەگەزپەرستیەکەی خۆیەوە، ئەوە ئەمەیان شتێکی جیاوازە، بریتیە لە خۆ بێبەشکردن و

هەڵبژاردنی گومڕایی بە خواستی خۆی، ئەم حاڵەتەش هیچ حاڵەتێکی تری لەسەر ناپێوڕێت، وە خۆی تاوانبار و هەر خۆشی بەرپرسیاری خۆیەتی لە چارەنوسی خۆی لەبەردەمی بارەگای خواییدا.

لەسەرجەم ئەو جۆرە دۆخانەدا، بۆ ئەو کەسە هەڵگەڕاوانە، دەبێ موسوڵمانان و زانایان و کۆمەڵگە ئارامگرانە ژیانی لەگەڵدا بەرێبکەن و بەردەوامیش بن لە بانگکردنی بۆ هاتنەوە سەر ڕێی ڕاست، بەوپەڕی گفتاری شیرین و ڕەفتاری مرۆڤانەوە، خودا دەفەرموێ: [ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ](النحل ١٢٥)، واتا: بانگەوازی خەڵکی بکە بۆ سەر ڕێگەی پەروەردگارەکەت بە دانایی و ڕێنمایی چاك، وە بەجۆرێ لەگەڵیاندا بدوێ کە چاك بێ، پەروەردگاری تۆ زاناترە بەوەی کە کێ گومڕای ڕێگەکەیەتی و کێش لە ڕێنیشاندراوانە، هەروەها دەفەرموێ: [قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ](الأنعام: ١٦٤).

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بە جۆرێکی تری هەڵگەڕانەوە کردووە، کە بۆ مەبەستێکی زۆر پیس و مەترسیدار بوو، وەك حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی ناپاکی مەتریدار، ئەویش کوودەتا و هەڵگەڕانەوەی هەندێ لە جوولەکەکانی مەدینە بوو، کە هاتن خۆیان بەباوەڕدار نیشاندا و دواتریش هەڵگەڕانەوەی خۆیان ڕاگەیاند، بەمەبەستی بەرپاکردنی گێچەڵ و دووبەرەکی لەنێوان موسوڵماناندا، هەر وەکو قورئانی پیرۆز لەوبارەیەوە دەفەرموێ: [وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ

وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ](آل عمران: ٧٢)، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا قورئان باسی هیچ جۆرە سزایەکی دنیایی نەکردوە بۆ ئەو جوولەکانە لە پای ئەو کارە خراپەیاندا، بەڵکو داویەتە دەست دەسەلأت و بڕیاری دەوڵەت، بەو سیفەتەی کە دەوڵەت بەرپرسی راییکردنی کاروباری خەڵکییە و ئەم هەڵوێستەی –جوولەکەکانیش وەك بەشێك لە هاولأتیانی ناو سنووری ئەو دەوڵەتە– پەیوەستە بە کات و شوێنەوە، کە لەو کاتەشدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) خۆی سەرۆکی دەوڵەتەکە بوو، با خۆی لە هەڵوێستەکە وردبێتەوە و تاوتوێی بکات و بڕیاری تێدا بدات و سزاکەشی دیاری بکات بەپێی جۆری تاوانەکە و ڕەچاوکردنی بارودۆخەکە، خودا دەفەرموێ: [أَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا](النساء: ٥٩).

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) –وەك سەرکردەی دەوڵەت– بڕیاری دا سزای توندی ئەو هەڵگەراوانە بدات کە دژی پەیامی ئاشتی دەجەنگن و بەدکاری لە زەویدا بلأودەکەنەوە و بوونەتە مایەی هەڕەشە بۆ ئیسلام و دەوڵەتەکەی بە لەناوبردنیان –هەروەکو لە هەندێ فەرموودەدا هاتوە (هەرکەس ئاینەکەی گۆڕی، لەناوی بەرن)، دیارە کە بڕیارەکە پەیوەندی بە لایەنی سیاسیەوە هەیە، هەڵگەرانەوەکەشیان سیاسیانەیە، نەك بڕیاری هەڵبژاردنی ئازادانەی بیروباوەڕ، بەهەر حاڵ ئاگادارکردنەوەکە ڕاگەیەنرا و ئاسایشی موسوڵمانان پارێزرا و بەر گیرا لەو خوێنڕێژیەی کوودەتاچی و هەڵگەڕاوەکان بەتەمای بوون، هەر لە بێشکەدا کۆرپەی

کوودەتاکە لەناوبرا. هەر بەهەمان شێوە ڕێگای گرتەبەر بەر بۆ هەر کەسێ دەیویست ناپاکی لە موسوڵمانان بکات و درۆ و ناپاکی و ئاژاوە بەرپا بکات جا بەهەر چەشن و شێوازێکی کاریگەر بێت. بەکارهێنانی (هونەر) و (وێژە) و(هۆنراوە) و (هۆیەکانی ڕاگەیاندن).

ئەوەبو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بڕیاریدا سزای ئەو کەسانە بدات کە ئەو ڕێکارانە بەکاردێنن بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام، چونکە ئەوەی ئەوان دەیکەن ناچێتە خانەی هزر و گفتوگۆ و ڕەخنەگرتنی لۆژیکی و زانستییەوە، بەڵکو تەنها پێدا هەڵدان و وروووژاندنە، چونکە ڕەخنەگرتن و گفتوگۆی ژیرانە خواستی ئەم ئاینەیە و قورئانیش پڕە لە نموونەی لەم جۆرە، کە باسی ڕەخنە و گومان و پرسیار و گفتوگۆی کەسانی بێباوەڕ و هەڵگەڕاوە دەکات لەگەڵ باوەڕداران لە هەموو چاخەکاندا و هەر بەبەڵگەش وەڵامیان دەداتەوە و ڕاستییەکانیان بۆ دەسەلمێنێ، دوێنێ هۆنراوە کاریگەرترین هۆکار بوو، بەڵام ئەمڕۆ جگە لەوە، چیرۆك و شانۆ و وێنە و فیلم و گۆرانی لەکاردایە، کە خراونەتەکار بۆ سووکایەتیکردن و جنێودان بە ئیسلام و موسوڵمانان و لەکەدارکردنیان و گومڕاکردنیان، ئەمەش بابەتێکە شایستەی هەڵوێستە لەسەرکردن و سزادانە[1]، ئەمانەش ئەمڕۆ بە یاسا لە

---

[1] بۆ چاکتر تێگەیشتنی خوێنەر تاکو بتوانێ (توێژینەوە و گفتوگۆ) جیابکاتەوە لە (ناوزڕاندن)، ئەوەیە کە یەکەمیان بەندە بە هزر و ژیری و بەڵگە هێنانەوە و سەلماندن و شوێنەکەشی بریتییە لە هۆڵەکانی وانەوتنەوە و خولەکانی فێربوونی مەعریفە، بەڵام جنێودان و سووکایەتیپێکردن و لەکەدارکردن و تۆمەتبارکردن، شتێکی ترە، بۆ نموونە کەسێك تۆمەت بۆ هاوسەرەکەت یان دایك و خوشکت هەڵدەبەستێ، یان سوکایەتیەك بە پیرۆزییەکانی تۆ دەکات،

دەستووری وڵاتە پێشکەوتووەکاندا ڕێکخراوە، کە نابێ گاڵتە و سووکایەتی بە هیچ بیروباوەڕ و عەقیدەیەك بکرێ، وەخەڵکی ئازادن لە هەڵبژاردنی ئاین و بیروڕای خۆیاندا، بەڵام لەناو ئەوانەشدا نادادپەروەرییەکی گەورە بەرانبەر بە ئیسلام و عەقیدەکەی چەسپێنراوە، کە ڕێگەدراوە بەوەی کە سووکایەتی بکرێ، بە ئیسلام و موسوڵمانان و پیرۆزیەکانیان و هاندانی گەل و ئاینەکانی تر بۆ دژایەتیکردنی موسوڵمانان، لەوانەش نکوڵیکردن لە لە (هۆلۆکۆست)ی ئەوروپیەکان دژی جوولەکە، ئەوانەی ئەم پلانانەش دادەڕێژن لەسەرانسەری جیهاندا تەنها پێنج کەسن و لەهەموو شوێنێکی جیهاندا ئامادەن و لەکاردان.

پێویستە حکومەت و گەلانی موسوڵمان و جەماوەر داوا بکەن بۆ دارشتنی یاسای گونجاو و پابەندبوون و گوشار خستنە سەری دبلۆماسیانە و ئابلۆقەی ئابووریانە بۆ ڕێگرتن لەو سووکایەتی و ناوزڕاندن و هاوکاری دوژمنانی ئوممەتی ئیسلامی کە دژ بە عەقیدە و پیرۆزیەکانیان و داوای دارشتنی یاساش بکەن لەو گەلانەی کە ستەم دەکەن بۆ ئەوەی سنورێك دابنێن بۆ ئەو کەسانەی گاڵتە بە عەقیدەکان و میللەتان و پیرۆزیەکانیان دەکەن، وەك ڕێگرییەك لە بەردەم بەرپابوونی گێچەڵ و ئاژاوەکانی نێوان

---

بە تایبەتیش ئەگەر توانایەکی هونەری یان وێژەیی یان دەزگایەکیشی بۆ بەکار بێنێ، وەك گۆرانی و هۆنراوە و وێنە و کاریکاتێر، ئەوا بێگومان تۆ بەرپەرچدانەوەت زۆر توند دەبێ و جگە لەوەی کە ئەو کارە ڕادەگری داوای سزادانی بەرانبەریش دەکەی، جا ئەگەر یاسایەك نەبێ بۆ ڕێگرتن لەو کارە دزێوە و سزادانی بکەرەکانی، ئەوا کەسەکە ناچارە خۆی بکەوێتە بەرگری لەخۆکردن و تۆڵەسەندنەوە، ئەمەش شتی تری زۆر لێدەکەوێتەوە، پێویستە خەڵکی لەوە هۆشیار بێ و بەری بگیرێ، بەتایبەتیش ئەگەر تاوانەکە دژی پیرۆزییەکانی ئوممەتێك بێ.

بەرەکانی مرۆڤ بە گشتی، خۆ ئەگەر سزا و یاسای دانراو نەبوو، ئەوا گلەییکردن لەو حکوومەت و گەلانە بێسوودە و هیچ مانایەکی نیە وە بەتاواندانانی نکوڵیکردنی بەکۆمەڵ سووتاندن و کۆمەڵکوژی جوولەکەکان (هۆلۆکۆست) بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ڕاستی ئەم بۆچوونە، وە پێویستە گەلانی موسوڵمان و ناموسوڵمان پێکەوە هاودەنگ بن بۆ داڕشتنی یاسای لەو جۆرە و گرتنەبەری ڕێگەی گفتوگۆ و توێژینەوەی زانستی بەمەبەستی گەیشتن بە ڕاستییەکان، ئەمەش ئەوەیە کە ئیسلام و زانایانی موسوڵمان خوازیاری بوون و کاریان بۆ کردووە.

بەڵام بۆ ڕێگرتن لە تۆمەت هەڵبەستنی ناڕەوا و جنێودان و سووکایەتی پێکردن دەبێ ڕێگە نەدرێ بە بەکارهێنانی هونەر و وێنە، چونکە خوێنەر و بینەر ئەوکاتەی سەیری ئەم شتانە دەکا هۆشیاری و تێڕوانینی ڕخنەگرانەی زانستیانەی راوەستاوە و لەکاردا نییە، تەنها ڕووکەشە دیار و سۆزداریەکەی دەبینێ، دواجار ئەمە دەبێتە هۆی چەواشەکردنی جەماوەر و بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی گوماناوی وتارێك، بۆیە ئەم کارانە دەچنە خانەی تۆمەتبارکردنی بێ بنەما و سووکایەتیکردن بە مرۆڤەکان وە شێواندنی روانگەی مرۆڤ و بڵاوکردنەوەی گێچەڵ و ئاژاوە لە کۆمەڵگەدا، وە وروژاندنی هەڵە دێرینەکانی مێژوو بۆ نەوەی نوێ و هەڵگیرساندنی ڕق و قین لە نێوان موسوڵمانان و میللەتانی خۆرئاوادا، کە بەدرێژایی مێژووی ڕابردوو ناکۆك و ناتەبا بوون لە گەڵ یەکتردا، ئەم ڕێگە و ڕێکارانە مرۆڤ دووردەخەنەوە لە توێژینەوەی زانستی و گرتنەبەری ڕێی گفتوگۆی ئامانجدارانە بەمەبەستی ئەنجامدانی چاکسازی راستەقینەی گەل و میللەتانی جیهان بەگشتی و

ئاشتکردنەوەی سەرتاسەری لە نێوان شارستانێتیە جیاوازەکان و ئاین و کلتوورە جۆراوجۆرەکاندا.

بەم شێوەیە –بەچاوهەڵگواستن لەو سزایەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دیاریکرد بۆ ئەو کەسانەی ناپاکی کوودەتا دەکەن و ئاژاوە بەرپا دەکەن لە کۆمەڵگەی موسوڵمانانندا– دەلالەتی ئەو سزایەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بڕیاری لەسەردا، کە ئەو سەرکردەی دەوڵەتی موسوڵمانان بوو لەوکاتەدا، ئەمە سزایەکی تەمبێکارانەیە، پەیوەستە بە خودی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر)، وەك خاوەنی دەسەلاتی یەکەمی ولات و خاوەنی سزادانە بۆ خودی ئەو تاوانە و وە لەو ڕۆژگار و دۆخەدا بەتایبەتی، لەبەر ئەوە ناکرێ بە شێوەیەکی خۆڕسکانە بۆ شتی تریش بەکار بهێنرێ لە هەموو کات و دۆخ و ڕووداوەکاندا، بەلام دەلالەتەکەی وا لێك دەدرێتەوە کە لەهەموو دۆخ و سەردەمەکاندا هەرشتێ ببێتە هۆکاری تێکدانی ئاسایشی کۆمەڵگە ئەوا تاوانێکی ترسناکە و دەچێتە خانەی چەتەگەری چەکداری و بەدکارییەوە، وە بکەرەکەشی ڕووبەڕووی سزای توند دەکرێتەوە لەو ولاتانای موسوڵمانن، هاوشێوەی ئەم تاوانەش بەکارهێنانی ئاینە یان هەرکارێکی تاوانکارانەی مەترسیداری تر بۆ تێکدانی ئارامی کۆمەڵگە و جەماوەر و دامودەزگاکانی.

بە ڕەچاونەکردنی خودی ئەو سزایەی کە پێغەمبەر (دروودی خواس لەسەر) هەڕەشەی پێکرد لەو کەسانەی تاوانی هەڵگەڕانەوە و کوودەتا دەکەن بەمەبەستی بەرپاکردنی ئاژاوە، لە ولاتی موسوڵمانانندا، ئەوا دەلالەتی ئەو سزایەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) ڕایگەیاند، وەك

خاوەنی یەکەمی دەسەلاّتی ئەو دەولّەتە لەو چاخەدا، ئەوا سزاکە سزایەکی سنووردارە و پەیوەستە بە خودی پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لەسەر) لەو ڕوانگەیەوە کە سەرۆکی دەولّەتەکەیە و داڕێژەر و بڕیاردەری سزایەکی گونجاوە بۆ خودی ئەو دیاردەیە و ئەو جۆرە کەسانە تەنها لەو بارودۆخەدا و درێژە ناکێشێ بۆ هەموو کەس و چاخ و دۆخەکانی دواتر.

بەم جۆرە ئەو سزایانەی پەیوەستن بە تاوانەکانەوە، واتا ئەم تاوانە و ئەوانەش کە هیچیان کەمتر نیە لە زیانگەیاندن بە کۆمەڵگە، وەکو تاوانی کوشتن و دزی و زینا و چەتەگەری چەکداری و بلاّوکردنەوەی بەدکاری لە زەویدا، ئەم تاوانانەش دەقی قورئان بە دیاریکراوی باسی کردوون و سزاکەی دیاری کردوون، هەموو ئەمانە دەچنە خانەی بلاّوکردنەوەی بەدکاری و گەندەڵی لەسەر زەویدا، وە لەهەر یەکە لەو تاوانانەشدا سەرنج لەکەسە تاوانبارەکە و دۆخەکەی دەدرێ، چونکە مەبەست و نیاز لەهەر تاوانێکدا لە پشتی تاوانەکەوەیە، لەگەڵ ئەو کاریگەریەی لەدوای خۆی بەجێی دەهێڵێ، ئەوەیە کەدەبێتە هۆکار بۆ بڕیاردان لەسەر دیاریکردنی ئەو جۆرە سزا سنووردارە گونجاوە بۆ هەر یەکە لەو تاوانانە لە سنووری پانتایی دەقەکان لە قورئاندا، لە نێوان سنووری تاوانی کوشتن و تاوانە مەترسیدارەکان کە تاوانکار ئەنجامی دەدات، مەبەستەکەش لەو سزایە بۆ ڕاوەستاندنی ئاژاوەیە دژ بە کۆمەڵگە و پاراستنی مافی مرۆڤەکان و ئاشتی کۆمەڵگەیە، لەم بارەشدا هیچ ڕێگریەك نیە بۆ لێبوردن لەو کەسانە ئەگەر هۆکاری تاوانەکە نزیك بوو لە وەوە کە فریودان و لەدەست دەرچوون و ناچاری و هەڵەبووبێ، یان گوشاری دەسکەوتێکی ناچارییانەی مادی بوبێت،

وەك ئەو دۆخەی لە زۆر کەسدا لەو تاوانبارانەدا بەدی دەکەین کە بەبێ خواستی خۆیان لەژێر گوشارێکی زۆردا کەوتوونەتە ناو تۆڕ و داوی کەسانی فریودەر و بانگەشەکار بۆ فێڵ لێکردن و قۆرخکردنی منداڵ و هەرزەکاران و داماوان و هەژاران و کەسانی ساویلکە بەناوی ڕۆشنبیری و ئازادی و تێرکردنی حەزەکانیان و دەستەبەرکردنی داواکاری و پێداویستیەکانیان و گەلێ ناوی ترەوە.

جێگەی داخە کە هەندێ لە دام و دەزگا خێرخوازی و بانگخوازەکان لەدەوڵەتە ئیسلامییەکاندا لە ئاستی ئەم جۆرە کارانەدا چالاك نین، جا یان بەهۆی ناشایستەیی دەزگاکانیانەوەیە، یان بەهۆی بێ دەسەڵاتی و سستییانەوەیە لەو ڕووەوە، کە ئەوەش وایکردوە ئەو دەزگایانە نەتوانن شتێك بکەن کە خزمەت بێ بەو چین و توێژە هەژار و نەزان و بێبەشکراوانەی ناو کۆمەڵگە، وەك هەموو گەلانی تری دنیا، بەتایبەتیش لەو وڵاتە هەژار و دواکەوتوانەی کە دامەزراوەی وایان نیە کە ڕوناکی بەخش و هۆشیار بن لەکاری پەروەردە و ڕێنمایی ئاینیدا، بەشێوە راست و دروستەکەی ئاین و نەشیان توانیوە پێویستییەکانی ئەو توێژە دەستەبەر بکەن لەهەلی کار و ژیانداری هاوچەرخانەدا، ئەمە هەر لەخۆیدا بەرتەنگ بوونەوەیەکی ناخۆشە لە ژیانی ئەو کەسانەدا و دەرفەتیشی ڕەخساندوە بۆ دەزگا و ڕێکخراوە تەبشیریەکان کە چالاکانەتر کاری خۆیان لەسەر ئەو خەڵکانە بکەن، دواتر ئەوەی کە بۆ دەزگا ئیسلامییەکان ماوەتەوە تەنها بڵاوکردنەوەی سەرکۆنەکردنی ئەو کارانەی ئەو ڕێکخراوە تەبشیریانەیە، لەگەڵ دەربڕینی

ناڕزایی و هەڕەشە و نەفرەت لێکردنیان، ئەمانەش نە سودێکیان هەیە و نە گۆڕانکارییەکیش بەسەر دۆخەکەدا دەهێنێ و نە چارەسەریشە.

هەروەها گرنگە ئەو کەسەی کە دەڕوانێتە گرنگی هەبوونی سزا بۆ هەرکەسێك کە هەڵگەرانەوەی خۆی لە ئیسلام ڕاگەیاندووە و نکووڵیشی لێدەکات و سوورە لەسەری و چاو بەهەق هەڵناهێنێ و دەچێتە ناو ئاینێکی خورافی و ڕگەزپەرستی سروشتگەرایی و خوداناباوەڕی، تێبگات کە نابێ ئەو کەسانە لەڕێی هەرەشە و سزادانەوە بتۆقێنرێن و بەزۆر رابکێشرێنەوە ناو بازنەی ئیسلام چونکە ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر هەشبن زۆر کەم و دەگمەنن و بەهۆی کەمتەرخەمی پەروەردەییانە و کۆمەڵایەتییانەی خۆمان دروست بوون، یان بەهۆی گوشاری دۆخێکی دەروونی و مادی ئاڵۆز و نەخوازراوەوە، بۆیە دواجار سەرەنجامی ئەوانە گەیشتووە بەوەی کە نەتوانن باوەڕ و عەقیدەیان دامەزراو بکەن لەسەر ئیسلام، کە لەراستیدا دوور نیە ئەمانە ببنە هەوێنی دروستکردنی کۆمەڵێك لە کەسانی دوڕوو، تەرەکەوتوو، ڕق لەدڵ بەرانبەر ئیسلام و ئوممەتی ئیسلامی و دواتر لەناوجەرگەی دڵی موسوڵمانانادا بڕوێنرێن، مافی خۆشمانە بپرسین: ئایا چ سوودێکمان لەمەوە دەست دەکەوێ، وە چ مەبەستێکی بەسوود دەست ئەم ئوممەتە دەکەوێ کە ئەم توێژە کەمە ڕووە گێرخواردوەی ناوکۆمەڵگە، بخرێنەوە ناو قووڵایی کۆمەڵگە؟

هەروەها گرنگە ئەوەش بزانین کە دۆخی هەڵگەڕاوەکان، جا هەڵگەڕانەوەکەیان بەهۆی نەزانییەوە یان بەهۆی نەخۆشییەوە، حاڵەتێکی جیاوازە لە حاڵەتی ئەو کەسانەی کە بە ئامانجەوە ئەم کارانە دەکەن، بۆیە

لێرەدا گرنگە ئەو جۆرە کەسانەی بە ئامانجەوە ئەم کارە دەکەن هەڕەشە و هۆشیارییان بدرێتیٚ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە کاری ئامانجداری زۆر مەترسیدار دەکەن و ئەمەش بەوەی کە ئاین وەك یاسایەك بەکاردێنن بۆ کوودەتا و هەڵگەڕانەوە و زیان گەیاندن بەکۆمەڵگە تا ڕێگری بکریٚ لەم کارە دزێو و تێکدەرانەیەیان، وە ئەگەر وا نەبیٚ ئەوا نە باسیان دەکریٚ و نە هەڕەشە و سەرکۆنەشیان ئاراستە دەکریٚ و خۆیان بەرپرسن لەو ئەنجامەی لەوەوە دەستیان دەکەویٚ، ئەگەر نەچنە سنووری گشتی کۆمەڵگەوە، چونکە لەو بارەیاندا دۆزەکە هیچ پەیوەندیەکی بە بازنەی ئازادی ئاینی و قەناعەتی عەقیدەیی کەسەکەوە نیە، بەڵکو بەپێی دەقی قورئان ئەوانە سزا دەدرێن کە بە ئینکاری و سووربوون و بەئەنقەست و بە مەبەست مافی گشتی کۆمەڵگە پێشێل دەکەن بۆ ئارەزووەکانی خۆیان و وازیشی لیٚ ناهێنن و ئاسایشی کۆمەڵگە دەشێوێنن، ئەوە نەبیٚ ئەوانی تر سنووری بازنەی تاکەکەسی خودی مرۆڤەکانە و جیاوازترە.

هەر لەمانەوە تێگەیشتین کە (دۆزی باوەڕ و عەقیدە)، لە ئیسلامدا دەبیٚ هەمیشە بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە (دۆزی قەبووڵ و قەناعەتە) بۆ چارەسەرکردنی هەژاری و نەزانی و نەخۆشی و بەپێی دۆخەکە دەخرێتە کار دژی ئەو کەسانەی بە گیانی ناپاکی و مەبەستی ناڕەواوە ئەوکارە ئەنجام دەدەن.

ئەگەر باسەکەمان دەربارەی سزای هەڵگەڕاوەکان لە پوختەیەکدا کورت بکەینەوە، ئەوا ڕوون و ئاشکرایە کە دۆزەکە بە درێژایی مێژووی ئیسلام هیچ پەیوەندیەکی نییە بە ئیسلام و ئازادی عەقیدە و ئازادی قەناعەتەوە، ئەوە

شتێکه وەك دیاردەیەك ئیسلام ڕێزی گرتووه و بانگەشەی کردوه بۆ ئازادییەکان و لە ڕووی عەقیدەییشەوە ئیسلام لەمە ناترسێ، بەڵکو هەر وەکو باسمان کرد، پەیوەندی هەیە بە دۆخە دەگمەنەکان و گوزەرانی خەڵکیەوە لەکاتی هەبوونی نەزانی و نەخۆشی و ئامانج و مەبەستە جۆراوجۆرەکاندا، بە پێچەوانەوە بەڵکو هەر ئەم تێڕوانینە ئیسلامییە بۆ مافی مرۆڤەکان وایکردوه کە خەڵك و گەلانێکی زۆر بە خواست و هەڵبژاردەی ئازادانەی خۆیان بێنە ناو ئیسلامەوە، بۆیە ئەرکی دەوڵەتە ئیسلامی و ڕێکخراو و دەزگا ئیسلامییە پەروەردەیی یە فێرکاریە بانگخوازەکانە کە هەوڵی زیاتری خۆیان بخەنەکار لە بوارەکانی پەروەردە و فێربوون و بانگخوازیدا و ڕەچاوی دۆخە گشتییەکانیش بکەن و پارێزگاری لە عەقیدەی ئیسلام بکەن و بەجوانی بیگەیەنن، وە بەتەواوی لە تێڕوانینە قورئانیەکە تێبگەن، کە بریتییە لە ئامادەکردنی کۆمەڵگە بەتەواوەتی بۆ ژیانێکی ئیسلامییانە و مرۆڤانەی ئاسودە، چونکە ئەم تێڕوانینە و ئەم هێزە دەروونییەیە کە وزەی ئوممەت دەخاتە کار و توانا و بەخشندەییەکەی پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکات لە بنیاتنانی شارستانێتی و خێر و خۆشی بۆ سەرجەم مرۆڤـ و مرۆڤایەتی.

گرنگە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە پێویستە ئەم ئوممەتە لە خەمی گەنج و لاوەکاندا بێت و بیانپارێزێت، نەك هەر لە نەزانی ئەوان بە ئاینەکەیان، بەڵکو بیانپارێزێ لە ڕووی دەستەبەرکردنی خواستەکانیانەوە، لە هاوسەرگیری و پاکیزەیی و داوێنپاکی و دورخستنەوەیان لە هەژاری و بێکاری، بۆ ئەوەی کەسە نیاز گڵاوەکان بە هیچ ناو و بیانوێکەوە فریویان نەدەن و

دەستخەڕۆیان نەکەن، چونکە ئەو نیاز گلاۆوانە بە مەبەستی تایبەتی هەوڵ دەدەن قۆرخیان بکەن، بازرگانیان پێوە بکەن، بازرگانی بە ئاینەکانەوە بکەن، ئەوان گەلێك مەبەستی سیاسی و داگیرکاری بەد و خراپیان هەیە و ناکاملّی و هەژاری و بێسەرە و بەرەیی ئەو گەنجانە، دۆخێکی شیاو و لەبارە بۆ ئەوەی ئەو نیاز گلاۆوانە ڕاویان بکەن و فریویان بدەن، دەبێ کۆمەڵگە و ڕێکخراوەکان دەستی هاوکاری درێژ بکەن بۆ ئەو لاوانە، بیانخەنە سەر کار و پیشە و پەروەردەکار و ئاراستەکاریان بن، تا کاتی هاوسەرگیریان دێ بۆ ئەوەی، شوێن ئارەزوەکانی خۆیان نەکەون لە ڕێگە نادروستەکانەوە و نەبنە نێچیری بەدکاران لەڕێی پلانە سیاسی و بازرگانی و ئایدیۆلۆجی و بەرەلاّییەکانیانەوە، وە نەکرێنە کەرەسەی بازرگانی و پارەپەیداکردن و هۆکاری بلاّوبوونەوەی بازرگانی داوێنپیسی و گەندەڵی و بەدکاری لەسەر زەویدا.

گەل و دەوڵەتان پێویستە لەسەریان ڕووبەڕووی ئەو دەستە و گرووپ و دەزگایانە ببنەوە کە تێکدەری کۆمەڵگەن، کە ملۆزمی ڕووخاندنی بونیادی ئوممەتن، ئەمەش بەوەی کە چینی لاوان فەرامۆش نەکەن خزمەتگوزاری وداواکاریەکانیان بۆ دەستەبەر بکرێ لە ڕووی فێرکاری و پەروەردە و کۆمەلاّیەتی و ئابورییەوە، وەلا نەخرێن و کەنارگیر نەکرێن، بۆ ئەوەی نەبنە نێچیری ئەو گورگە دڕندانە، هاوکات هەرچی بانگەشەکردنە بۆ قەناعەتپێکردن و ڕاستگۆیی و ژیری و بەڵگەی بەجێ و گفتوگۆی ژیرانە، ئەمەیان لایەنێکی ترە و دەبێ دامەزراوەی دڵسۆزانەی بۆ دروست بکرێ، چونکە ئیسلام لەم جۆرە هەنگاوانە ناترسێ، وە لە کەرەسەی بازاڕی ئەوان

ناترسێ لە ئاڵوگۆڕی عەقیدە و ئاین و بەڵگە هێنانەوەکانیان، بەڵکو ئەمە ئەو ڕێگەیەیە کە دەچێتە خانەی گفتوگۆ و تاوتوێ و گەڕان بەدوای دۆزینەوەی ڕاستی و بەزەیی و بانگخوازی ئیسلامییەوە کە پڕە لە بەڵگەی جوان و سەلماندن و ڕوونکردنەوە و دڵنیایی.

## هەڵگەڕانەوە لە ڕووی بیر و باوەڕ و یاساوە:

بابەتێکی تر ماوە کە باسی بکەین، ئەویش بریتییە لە جیاکردنەوەی دوو شت لە یەکتری ئەوانیش بریتین لە (مافەکانی کەسێکی پێگەیشتوی ژیر) لە هەڵبژاردنی عەقیدەکەیدا، لەگەڵ (ئەو کەسانەی منداڵ و ناکام و نابەکامن) و دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و چاودێری و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی دەروونی و یاسایی و عەقیدەیی و ئایینیان لە ئەستۆی دەوڵەت یان کەسێکی بەخێوکەردایە.

ئیسلام ڕێگەی داوە بەوەی کە پیاوێکی موسوڵمان ژن لەو بنەماڵانە بخوازێ کە باوەڕدارن بە یەکێك لە پەیامە ئاسمانییەکان، چونکە دەسەڵاتی ئەم پیاوە لەڕووی کاریگەری نەژادییانە و ئاینی و یاساییەوە لەڕوانگەی ئیسلامەوە ترسناك نیە لەبەرامبەر هاوسەرەکەیدا، وە ناترسێ لەوەش کە عەقیدە و ئازادی ئاینی لە ژنەکەی قەدەغە بکات، چونکە مرۆڤی موسوڵمان فەرمانی پێکراوە کە دەبێ ڕێزی مافی ئازادی ئاینەکانی تر بگرێ، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان لە بنەڕەتدا بڕوای بە عەقیدەی ڕاستەقینەی پەیام و پێغەمبەرانی تریش هەیە، بەوەی کە ئەوانیش هەرلەلایەن خوداوە هاتوون و ئاسمانین و دژ نین لەگەڵ بنەچەی عەقیدە

ئیسلامیەکەدا[1]، وە پێویستە لەسەری ڕێزی عەقیدەی هاوسەرەکەی بگرێ و نەرم نەرم بەردەوام بێت لە باش رەفتاری و گفتوگۆی نەرمونیان و ژیرانە لەگەڵیدا بۆ ڕوونکردنەوەی راستی ئاینەکەی.

خودای گەورە دەفەرموێ: [یا أَیُّها ٱلَّذِینَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا](النساء: ١٣٦)، [قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ](البقرة: ١٣٦)، [وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ](المائدة: ٤٦)،[إِنَّ

[1] تاکە ڕەخنەیەك کە ئیسلام هەیەتی لەهەموو ئاینە ئاسمانیەکان لەبەرەبەیانی مێژووەوە کە هاتوون بۆ مرۆڤایەتی تاکو ئەمڕۆ، ئەوەیە کە ئەم ئاینانە دەسکاری کراون و لەبەر ئەوەشە کە ناکرێ کتومت بەدەقەکانی ئێستایانەوە پەیوەست بین، وە هەموو پەیامێکیش بەتایبەت بۆ گەل و ئوممەتی خۆی هاتوە بە دیاریکراوی هەر وەك توێژەران و لێکۆڵەرانیش دانی پێدا دەنێن، کرۆکی ئەوەی کە ئیسلامیش بانگەشەی بۆ دەکا، بۆ هەموو مرۆڤەکانیشە بەگشتی، ئەوەیە کە خودا بەتەنها بپەرستن و لەکار و کردەوەی چاکی دنیادا دابراو نەبن، هەروەکو خودا دەفەرموێ: [إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُولَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ](البينة: ٧)، [قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ](الأعراف: ٣٣)، [قُلْ يأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ](آل عمران: ٦٤)، خوێنەری کورد دەکرێ لە تەفسیرە کوردیەکاندا راڤەی ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە.

ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ] (النساء: ١٥٠)، [إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ](الحج: ١٧)، [شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ](الشورى: ١٣)، [ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ](البقرة: ٢٨٥)، [إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ](البقرة: ٦٢)،[ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ] (الحديد: ٢٧)، [لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ](الحديد: ٢٥)، [وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ](سبأ: ٢٨)،[ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِىَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ] (غافر: ٧٨)، [إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ](الحجر: ٩).

هەر لەبەر ئەوە ئیسلام ڕێگەی نەداوە بەوەی کە کەسێکی خاوەن پەیامی ئاینەکانی تر، یان کەسانی نا موسوڵمان ئافرەتی موسوڵمان بخوازن بۆ هاوسەرگیری، چونکە ئاشکرایە کە باوەڕی بە ئاینی ئەم ئافرەتە نیە، یان بە پیرۆزی ئاینەکە یان پێغەمبەرەکەی یان عەقیدەکەی، بۆیە ئەم ئافرەتە دەکەوێتە ژێر ترسێکەوە لەڕووی ماکی(فطري) و دەروونی و ئاینی و یاساییەوە، لەگەلێك باردا، هەروەها لەوەی کە دەسەڵاتی زاڵ بکات بەسەر ئەم ژنەی و منداڵەکانیشیدا، چونکە ئەگەر ئەو باوکە خاوەنە یاساییەکەی خێزانەکە بێت و باوکی ئەو منالآنە بێت و ڕابەری پەروەردە و دەروون و گۆشکردنیان و بەخێوکردنیان بێ، ئەوا لەسەر ئاینەکەی خۆی پەروەردەیان دەکات وە وایان لێ دەکا کە ئاینی دایکیان بە درۆ بزانن و نکوولّی و ئینکاری بکەن لەپیرۆزی و ڕاستی ئەم عەقیدە و ئاینەی دایکیان.

ئیسلام بەمە دەیەوێ ئاسایشی کۆمەڵایەتی بپارێزێ، وە ئەو هۆکارانە لابەرێ کە دەبنە هۆی دووبەرەکی و ناکۆکی خێزانی و دواتر هەڵوەشانەوەی خێزان، یان ئەو شتانەی کە هەستی خێلەکی دەوروژێنن، ئیسلام بڕیاری وایە کە هەرکەسێ موسوڵمانێتی خۆی ڕادەگەیەنێ، بەوەی کە هەر بە موسوڵمانی لەدایك بوە، یان دواتر موسوڵمان بووە، ئەوا ئیسلام و دەسەڵات ئەوەیان بۆ مسۆگەر کردووە کە ئەو پیاوە متمانەی پێ دەکرێت کە دەسەڵات و چاودێری ئاینی و ماکی و یاسایی هەبێت لەسەر ئافرەتی موسوڵمان، هەروەها مسۆگەرکردنی ئەو گرتنەخۆ و چاودێرییە بۆ منداڵەکانیشیەتی، بۆیە پێویستە بزانین کە ئەگەر لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بەباوەڕداری نەمایەوە لەم ئیسلامەدا وە بڕوای بە پیرۆزی و پێغەمبەرایەتی

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) نەما، بەم شتانەی کۆسپی خستۆتە ناو مەرجی گرێبەستە هاوسەرگیرییەکەوە لەگەڵ ژنەکەیدا کە موسوڵمانە، هەروەها بەرامبەر مافی منداڵەکانیشی لە ڕووی ئەو عەقیدەیەوە کە پێشتر هەیبووە، کاتێ کە پێشتر موسوڵمان بووە و بڕوای بە هەموو ئاینە ئاسمانییەکانی تریش هەبووە، ئەم پیاوە بەهەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام مافی خاوەندارێتی نامێنێ بۆ ئەو منداڵە موسوڵمانەی کە هەیەتی، وە ڕێگەی پێنادرێ کە جگە لە ئیسلام بۆ هیچ ئاینێکی تری بەرێ، کە ئەو منداڵە لەسایەیدا باوەڕ بەهەموو ئاینە ئاسمانییەکان دەهێنێت لە بنەمادا و ڕێزی هەموو ئاینەکانیش دەگرێ و پێغەمبەرەکان و بنەمای ئاینەکانیش بە پیرۆز دەزانێت. ئەمە مافێکی منداڵانە و پێویستە لێیان دانەبڕێن لەو ڕێگەوە ڕێزی باوکیشیان دەگرن و مافی عەقیدیش دەپارێزن، وە هەروەها بەهەمان شێوە بۆ دایکیان و ئاینەکەی دایکیشیان، بەم جۆرە منداڵەکان چاکەکار دەبن لەگەڵ دایك و بابیان. بێگومان هەر کە منداڵەکە پێگەیشت ئەوسا دەتوانێ بۆ خۆی ئەو عەقیدە و ئاینە هەڵبژێرێ کەدەیەوێ، جا هەرچی بێ، ئەوەش مافێکی ئازادی عەقیدەیی خۆیەتی و ئیسلامیش ئەو مافەی پێداوە و بۆ کۆمەڵگەشی دەستەبەر کردوە. ئەم جیاوازیکردنە ئاینییە یاساییە، گرنگە بۆ هێنانەدی ئاسایش و سەقامگیری ئاینی و کۆمەڵایەتی و مەزهەبی وە ڕێزگرتنی هەموان لە ئاین و عەقیدە جیاجیاکانی یەکتری و بەربەستێکی باشە بۆ ڕێگریکردن لەو کەسە نەخۆش و نیازپیسانەی کە بۆ نانەوەی گێچەڵ دەگەڕێن لە وڵاتی موسوڵمانان و لەناو کۆمەڵگە و پێکهاتە جۆراوجۆرەکانیدا.

## کەمینە و ڕەوەندی موسوڵمان و جیاوازی ئاینەکان:

ماوەتەوە ئەوەی کە تیشکێك بخەینە سەر کەمینە موسوڵمانەکان لە وڵاتە ناموسوڵمانەکاندا، بەتایبەتیش لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا، کە پێکهاتون لە ژمارەیەکی زۆری کۆچەری و نیشتەجێکان کە خۆیان موسوڵمانن، یان موسوڵمان بوون.

دۆخی ئەم موسوڵمانانە جیاوازترە لە دۆخی موسوڵمانان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، چونکە زۆرینەی گەلان و میللەتان و هاوڵاتیانی ئەو وڵاتانەی خۆرئاوا بەهۆی پەڕاوەکردنی نەرێنیانەی مێژوویی ئاینییە بنەرەتییە ئاسمانییە راستەقینەکانیان دەستکاری کراون و زیاتر لە سرووتی ئەفسانەیی دەچن، بۆیە شتێکی وا لە ئاینەکانییاندا نەماوەتەوە کە کاریگەری هەبێ لەسەر ژیان و چالاکی و چەمکی تێگەیشتنیان بۆ خودی ژیان و بوونەوەر، سەرەڕای زۆری ژمارەی کەنیسەکان و ئازادی کارکردنیشیان، بگرە لە زۆربەی شوێنەکان هەر خودی ئاینەکەش پەڕاوێز خراوە.

لەبەر ئەوە یەکێتی ئەورووپا لە داڕشتنی دەستووری یەکێتیەکەیدا قبوڵی ئەوەی نەکرد کە ئاماژەیەك بۆ ئەم ئاینانە بکات بەوەی کە کاریگەریان هەبێ لەسەر ڕۆشنبیری و کلتوورەکەیان، گەرچی پاپای ڤاتیکانیش داوای کردبوو کە ئاماژەیەك بە ڕۆڵی ئاینەکان بکرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم گەلە ئەورووپیانە وەکو گەلێکی دیندار نەماونەتەوە، بەڵکو بوونەتە گەلانێکی (نازانمخواز ـ اللا أدرية)، واتە ئەوان لە ماکی خۆیاندا پەی بەوە دەبەن کە هێزێکی گەورەتر لەودیوی ئەم گەردوونەوە هەیە، بەڵام بەهۆی شێوە

ئەفسانەییە دینیەکەیانەوە –شتێکی وای تێدا نادۆزنەوە  کە ناوەرۆکێکی هەبێ، یان وەڵامێك بێ بۆ دروستبوونی قەناعەت لەلایان و واتایەکی هەبێ– لەبەر ئەوە ئەوان بێباوەڕ نین بەخودا، هاوکات دینداریش نین، بەڵکو ئەوان ئاینیان بەجیا لەولاوە داناوە، بۆیە وایان لێهاتووە کە پەی بە شتەکان نابەن و شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەودیوی ئەم ژیانە نازانن، وە بگرە دەربارەی ژیانیش، مەگەر هەر ئەوەی کە کاتی و مادی و هەستپێکراوە.

بەکورتی هەر شتێ کە پوختەی ئەم ئاینە بێ، یان پەیوەندی پێوەی هەبێ لەجیهانی نادیار و ئەو دیوی ژیان و مەبەستەکان و ئامانجەکان لە بەدیهێنانیاندا و چارەنووسیان، ئەمانە نەخەمی ئەوروپاییەکانە و نەبیریشیان بەلایاندا دەبەن، وە هیچ هۆکار و بەڵگەیەکیشیان لەبەردەستدانیە کە پەسەند بێ بۆ قەناعەتکردنیان بەو زانیارییانە، بەم جۆرە بوون بە (نازانمخواز ـ اللا أدرية)ەکان، باشووری ئەمریکا و شار و کۆمەڵگە پڕ لە دانیشتوانەکەی لە رۆژهەلات و رۆژئاواشەوە –لەراستیدا– واقعی ژیانی خەڵکەکەی و مامەڵەی رۆژانەی ژیانیان و گرنگیدانیان بە ئاین لەم جۆرە هەڵوێستانەیە کە باسمان کرد، لەڕووی سارد و سڕیان سەبارەت بە پەیوەندی ئەوان بە ئایینەکانەوە. ئەم هەڵوێستە کەمتەرخەمیە، بەرامبەر بە ئاین، وە هەڵوێستی تاکەکەسەکانیش هەر بەرامبەر بە ئاین، رەهەند و شوێنەواری گرنگی هەیە بەپەیوەندی مرۆڤی موسوڵمان بە مرۆڤی ناموسوڵمانەوە لەو ولاتانەدا کە زۆرێك لە

رۆڵــەکانیان هاتوونەتــە نــاو ئیســلامەوە و موســوڵمان بــوون، بەتایبــەتیش ئافرەتان.

پرسیاری کاریگەریش سەبارەت بەو وڵاتانە ئەمەیە: دەبێت هەڵوێستی ئەو ژنە چی بێ کە موسوڵمان بووە و مێردەکەشی –جا بەهەر هۆیەکەوە بێ موسوڵمان نەبووە، جا بەهۆی نەزانییەوە بێ یان بەهۆی گوێ پێنەدانی بەئایین– موسوڵمان نەبووە و لەسەر دۆخی خۆی ماوەتەوە؟ ئایا ئەم داوای جیابوونەوە بکات؟ بەتایبەتیش کە چۆتە تەمەنەوە و منداڵی هەیە؟ ئایا چارەنووسی خۆی و منداڵەکانی بەرەو ئاڵۆزی و دابڕانی خێزانی و بێبەشبوون لە باوکایەتی باوکیان ببات؟

ئەم پرسیارە لە کۆمەڵگە ناموسوڵمانەکاندا وروژاندنی زۆر بەدوای خۆیدا دێنێ، چونکە زۆرینەی خەڵکی لەو وڵاتانەدا ناموسوڵمانن و منداڵ و خێزانیشیان هەر لەسەر ئەو دۆخ و عەقیدەیەی خۆیان گۆش کردووە و رایانهێناون.

ژن لەم بارانەدا زۆر لەوە ناترسێ کە مێردەکەی دەسەڵاتی دەروونی هەبێ بەسەر خۆی یان منداڵەکانیدا، وە لەوەش ناترسێ کە باوکەکە ساردبێتەوە لە بەخێوکردن و چاودێریکردنی منداڵەکانی، وەکو باوکێك، یان رێ لە موسوڵمانبوونی ژنەکەی بگرێ، یان لەوەی کە ژنەکە لەسەر عەقیدەی ئیسلامی منداڵەکانی پەروەردە بکات، جیاوازی نێوان ژن و پیاو ئەوەیە کە هەر کەسێکی ئەو وڵاتانە موسوڵمان بوو، شێوازی ژیانی وەکو شێوازی ژیانی زۆرینەی خەڵکەکە نابێ، ئیتر ئەم پابەندی ئیسلامەکەی خۆی دەبێ، هەر بۆیە وا دەردەکەوێ کە جیاوازە لە زۆرینەی خەڵکەکە، چونکە سروشتی

ئیسلام خۆی وایە، کە پابەندی و دیدگەی جیاوازی هەیە بۆ ژیان و گەردوون، ئەم دیدگەیەش لەو کەسانەدا دروست دەبێ کە موسوڵمان دەبن.

ئەی لەدۆخێکی ئاوادا دەبێ چی بکرێ؟ ئەم ژنە پرسیار لە چارەنوسی خۆی و منداڵەکانی و ئەو زیانانە دەکات کە ئەگەر لە مێردەکەی جیابێتەوە ڕوو بدەن، لەکاتێکدا کە مێردەکەی زۆرباشە لەگەڵیدا، ژنەکەش هیچ ترسێکی نیە لە پیاوەکەی نە بەرانبەر بەخۆی نە منداڵەکانی و نەبەرانبەر موسوڵمانبوونی، و هاوکات ژنەکە ئومێدی وایە کە ئەگەر زیاتر لەگەڵیدا بمێنێتەوە لەوانەیە ئەویش موسڵمان ببێت، –هەروەکو زۆرێك لە هاوسەرگیرییەکان ئەنجامی باشی هەبووە بۆ ئیسلام و موسڵمانبوونی هاوسەرەکان– ئەمە کارێکە زۆر ڕوودەدات و دەبینرێت لەو وڵاتانەدا، چونکە بەهۆی باش مامەڵەکردنی کەسە موسڵمان بووەکەی خێزانەکە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی و پتەوکردنی پەیوەندییە خێزانییە ئیسلامییەکان هاوسەرەکان و دایك و باوکەکانیش و منداڵەکانیش کاریان تێدەکرێ و موسڵمان دەبن. لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەو زیانانەی ئیسلام هەوڵی داوە بە ژن و منداڵ نەگات، لەم حاڵەتانەدا رووبەڕووی ژن و منداڵ نابێتەوە. لەبەرئەوە دەپرسین ئایا گرتنەبەری ڕێگەی یەکەم کە لە خانەی نیازی هێنانە دی بەرژەوەندییەکان و دورخستنەوەزیانەکانە، کارێکی باشە؟ ئایا دەکرێت جیابوونەوەی ژنەکە لە مێردەکەی بە پێویست بزانرێت، کە

بەرژەوەندییەکی دیاری تێدا نابینرێ و بگرە چەندین زیانی گەورەشی لێ دەکەوێتەوە [1].

---

[1] لەوانەیە شیاو بێت لێرەدا ئاماژەیەك بکەین بۆ داڕمانی پەروەردەی خێزانی و هەستی بەرپرسیارێتی بەهۆی کەمتەرخەمی دایك و باوك لە بەرانبەر ئەرکی پەروەردەییانەیان بۆ ڕۆڵەکانیان و سەرقاڵ بوونیان بەکارو کاسبی و بەکاربردنی کەلوپەل و کەرەسەکان، وە بەهۆی هێرشە ناڕەواکانی وڵاتانی خۆرئاوا بۆ بنبڕکردنی ئەو ڕەوشتە جوانانەی لە موسڵماناندا ماون لەوەی کە دیاردەی جیابوونەوە بە شتێکی ئاسایی و سادە بە خەڵکی بناسێنن، کە هەرگیز شتی وا پێشتر لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا باوی نەبووە، نامانەوێ لێرەدا درێژە بە باسی خێزان و ئەرکی باوان بدەین، ئەمەمان لە کتێبێکی تردا باس کردووە بەناوی (قەیرانی خواست و ویژدانی موسڵمان) پشت بە خوا سەبارەت بە خێزان و باوانیش کتێبێکی تر دەنوسین، بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت ئەوەیە کە بە کورتی ئاماژەیەکی خێرا بکەین بۆ هەڵوێستی شەرعی و یاسایی کە خێزان بپارێزێت لە لێکهەڵوەشاندنەوەو دوور کەوتنەوەی گەنجان لە دیاردەی جیابوونەوەی خێزانی(طلاق) بەبێ ئەوەی قوڵ ببنەوە لە دەرەنجامە کوشندەکانی بە تایبەتی بۆ ژن و منداڵ. پێویستە تەماشای سەرچاوە شەرعییەکان بکرێت لە کاتی بیرکردنەوە لە جیابوونەوەدا، ئەوەش دەبێ بە بڕیاری دادوەری مارەبڕ بێت، بە ئامادە بوونی ژنەکە و کەسی یەکەمی ژنەکە (ولی أمر)، ئەم کارەش سەرەتا دەبێ نیازەکەت یەکلایی کردبێتەوە، وە دەبێ ناوبەناو ماوە بدرێ بە هاوسەرەکان، تاکو لەو ماوانەدا زیاتر دوو هاوسەرەکە لە بڕیارەکەیان ورد ببنەوەو پەلە نەکەن، با ڕاوێژ بکەن و کەسوکاری هەردوولاش بێنە ناو بازنەکەوە، هاوکات دادوەریش ڕێنماییان دەکات بۆ ئاشت بوونەوە و چاك بوونەوە، هەروەها دەبێ لەم کارەدا مافی ژن و منداڵەکان پارێزراو بن، وە نابێت پیاوەکە وشەی (طلاق) لەبەرچاوی ژنەکەیدا بڵێتەوە و دوایش بڵێت من شتی وام نەوتووە، چونکە هەندێ پیاو وا دەکەن و بەمەش هێندەی تر ژنەکە توڕە دەکەن، وشەی(طلاق) شتێکی تازە نییە لە خودی خۆیدا، پیرۆز نییە، لە بنەڕەتدا جیابوونەوەی دوو هاوسەرە هەروەکو عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بیت) (هەستی بە مەترسییەکان و (طلاق) کرد بوو، بۆیە بەتایبەتی سەرکۆنەی ئەو کەسانەی دەکرد کە لەبیری ئەوەدا بوون، وە دەیویست تەمێیان بکات و وەکو هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)

لەم بارەیەوە ڕاوبۆچوونەکان زۆرن، بەڵام بە زۆری موسڵمانە کەمینەکانی نیشتەجێی وڵاتە ناموسڵمانەکان دووچاری ئەم جۆرە کێشەیە دەبنەوە، بە تایبەتیش وڵاتانی خۆراوا، کە جۆرایەتی کێشەکە لای ئەوان جیاوازترە وەك لە وڵاتانی ئیسلامییدا، بۆیە پێویستە ڕێکاری وردتر بگیرێنە بەر بۆ مەبەستەکانی شەریعەت و بەرژەوەندییەکانی موسڵمانان، لەم ڕووەوە —وەك دەردەکەوێت— دەبێ ڕەچاوی دۆخی موسڵمانان بکرێت لەو وڵاتانەدا، ئەمەش وا پێویست دەکات بە باشی مامەڵە بکرێت لەگەڵ دۆخەکەیان و چەمکەکانیان و نەریتی باویان. جا ئەگەر ژنێك موسڵمان بوو، وە موسڵمان بوونەکەی نەبووە هۆی بەرپاکردنی کێشەی کوشندە و زەبروزەنگ و هەڕەشەی تیاچوونی خۆی و خێزان و مناڵەکانی ئەوا پێویست بە جیابوونەوە ناکات، بە پێچەوانەوە ئەگەر تێداچوونی دینەکەی و خۆی تێدا

---

هەڵسوکەوت بکەن. قورئانیش بە ڕوونی (طلاق)ی بە سێ جار ناو بردووە [ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ] (البقرة: ٢٢٩)، بەرانبەر بەو کەسانەش کە یەکسەر هەر سێ تەڵاقەکە بە یەکجار دەڵێن، عومەر (خوای لێ رازی بێت) دەفەرموێت: (ئێوە لەوەدا پەلە دەکەن، من پێشبێنی شتی ترتان لێ دەکەم) بەڕاستیش وابوو، پێشبینییەکە ئەوە بوو کە عومەر (خوای لێ رازی) ئەوانی چاکتر تەمێ کرد، کاتێك هەندێ کەس بۆ سەپاندنی ڕای خۆیان بەسەر ژنەکانیاندا هەر سێ تەڵاقەکە بە جارێ دەردەبڕن، (ابن تیمیە) پێی وایە کە هەر سێ تەڵاقەکە هەر بە یەك دەربڕین هەژمار دەکرێت، هەرچەندە ئەمە دەرچوونە لە ڕای کۆی زانایان، چونکە (طلاق) وەکو (سوێند) وایەو دواتر بکەرەکەی پەشیمان دەبێتەوە لەبەرئەوە با کەفارەتی سوێندەکەی بدات و تەڵاقەکە ناکەوێت، وە ئەو کەسە گەمژانەش کە خێرا خێرا ئەم وشەیە دەڵێن، لەبەر گێلی خۆیان و دۆخی وتنەکەش بە هەند وەردەگیرێ، بە کورتی چارەسەر کردنی (طلاق) بابەتێکی پەروەردەیی خێزانییە، ئومێدەوارم زانایانی ئەم ئوممەتە ورد تر بن لە فەتواکانی تەڵاق و هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکاندا و لادانی خەڵکی لە مەترسییەکانی نەمانی خێزان.

بینی، ئەوەش چارەسەر نەدەکرا، ئەوا جیابوونەوەی پێویستەو مافێکی ئازادی عەقیدەی خۆیەتی، هاوکات دەکرێت منداڵەکان پەیوەندی باوکانەیان بە باوکیانەوە هەبێت.

گرنگە ئەوە بزانین کە ئەم دوو دۆخە لە یەکتری جیاوازن، پیاوێك کە لە بنەڕەتدا موسڵمان نییەو ژنێکی هەیەو منداڵیان هەیەو ژنەکەیشی لە بنەڕەتدا موسڵمان نەبووە، بەڵام ئێستا بووە بە موسڵمان، لەگەڵ دۆخی ژنێك کە موسڵمانەو ژنی پیاوێکی موسڵمانەو لە وڵاتی موسڵماناندایەو هەردووکیان لەسەر بنەمای ئیسلام مارە بڕدراون و دواتر پیاوەکە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە بەهۆی هەڵوێستێکی عەقیدەیی یان بارێکی دەرونییەوە و ئێستا نە ئاینەکە بە پیرۆز دەزانێ و نە بڕوای بە پێغەمبەرەکە هەیەو، ئەمانە دوو دۆخی جیاوازن. وە گرنگە کە باسی چاودێری و گرتنە خۆتان بیر بخەینەوە، بە پلەی یەکەمیش چاودێری ئایینی و هەموو گرتنە خۆیەکی تریش کە پەیوەستن بە منداڵەکانیانەوە، دەبێ هەمووشتەکان لە بەرژەوەندی منداڵەکاندا بن.

وە باشترین پەیوەندی لە کاردا بێت لەنێوان منداڵەکان و دایك و باوکیاندا، نەك هەر تەنها باوك یان تەنها دایك، بەڵکو هەردووکیان، وە لەسەر موسوڵمانێتی گەورەبکرێن، چونکە لە قازانجی مناڵەکەدایە و ڕێزگرتنە لە دایك و بابی، بۆیە دەبێ دایك و باوکان هۆشیار بکرێنەوە دەربارەی ئەم دیاردە دزێو و ترسناکە، کە چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر دەروونی منداڵەکان، وە نابێ گۆڕینی ئایین ببێتە هۆی وەلانانی یەکێکیان لەمنداڵەکانیان، بەڵکو هاندان بکرێت بۆ ڕێزگرتنی دایك و باوکیش لە لایەن

خۆیان و منداڵەکانیشیانەوە، هەروەکو ئاینی ئیسلام لەو ڕووەوە گەلێك یاساو ڕێنمایی داناوە، هەروەکو ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەو فرمانن بۆ ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتییە پەروەردەیی و خێزانییە.

[وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ] (النساء:٣٦)

[وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا] (الأسراء:٢٣)

[وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ] (العنكبوت:٨)

[وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ] (لقمان: ١٥)

[قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ] (آل عمران: ٦٤)

[يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ ]المائدة ١٣

[ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ]التوبة ٣١

[وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ]النحل ٦٤

[ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ]النحل ١٢٥

[وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ]فصلت ٣٣

تێکەڵنەکردنی ڕەهەندەکانی پەیوەندییە عەقیدەیی و یاساییەکان، وە هەستکردن بە هۆکارەکان کە دەبنە مایەی هێنانەدی مەبەستەکان، لەوانەش پاراستنی ئایین و خود و ئابڕوو، وە بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکان و لابردنی گەندەڵی و بەدکارییەکان، وەلانانی زیانەکان، وە هەڵبژاردنی کەمترینی زیان لەنێوان دوو جۆرە زیاندا، بە شێوەی کۆمەڵ و تاکەکەسی، ئەمانە ئەو شتانەن کە دەبنە مایەی دەستەبەر کردنی ئاسایش و ئاسوودەیی و دڵنیایی بۆ تاکە کەس و بۆ کۆمەڵگەش وەدەبنە مایەی ڕێگرتن لە کەللە ڕەقی و ئاژاوەگێڕی و ململانێی خێڵەکی و ئایینی. هەموویان شتانێکن پێویستە لێیان تێبگەین، وە بیانپارێزین، وە چاودێری بکرێن لەلایەن ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری کۆمەڵگەو کاربەدەستان وزانایانەوە، وە ئەم باسانە نەگۆڕدرێن بە پڕکردنەوەی نابەجێ و فەتوای ناهەقانە و نەکامڵ و نابار بۆ ئەوەی بەبێ زانست و توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و بێ ئاگا بوون لە دۆخی خەڵکی؛ بڕیاری ناڕەوا و دڵڕەقانە نەدرێت، هەروەکو پەندێکی پێشینان دەڵێت: (ئەو پێستە پێستی لەشی خۆت نییە بەسەر دڕك و داڵەکاندا ڕایکێشە) وە (ئەو کەسەی کە تێهەڵدان دەخوات وەك ئەوکەسە نییە کە تێهەڵدانەکە دەژمێرێت).

خۆ لەوانەیە زۆربەشمان ئەو بەسەرهاتەی مەلای مەشهورمان بیستبێ، کە دراوسێیەکی هەبوو، تەنها بەرژەوەندی خۆی دەویست، مەلای مەشهور ویستی پەندێکی دابدات تاکو واز لە بەرژەوەندخوازی خۆی بهێنێ و بەرژەوەندی خەڵکی تریش لێك بداتەوە، مەلا چوو بۆ ماڵی دراوسێکەی و پێی وت: پشیلە میزی بە دیواری مناڵەکەمدا کردووە، چارەسەر چییە؟ دراوسێکەی گوتی: دەبێ حەوت جار دیوارەکە بڕوخێنی ودروستی بکەیتەوە، ئەوسا لەناو دەچێت، مەشهور هەندێ بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی: ئاخر قوربان ئەو دیوارەیە کە کەوتۆتە نێوان خانووی من و ئەم خانووەی تۆوە...! دراوسێکەی تاساو کەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا بەپەلە گوتی: هیچ نییە، هەر بە تۆزێك ئاو بیشۆرە چاك دەبێ، جا نازانم مەلای مەشهور بەمکارەی تا چەندێك ئێمەی فێری ئەوە کرد کە بەرژەوەندی خەڵکیش وەکو بەرژەوەندی خۆمان ببینین؟!

ئەوەی کە دەربارەی کەمینەکانی نیشتەجێی وڵاتە ناموسڵمانەکان باسمان کرد، تەنها ڕاوبۆچوونێکە بۆ بەرچاوی بەرپرس و سەرکردەی پەنابەر و نیشتەجێ و ڕەوەندەکانیان، تا بتوانن ئەوەی تێدا بەدی بکەن کە ببێتە مایەی پاراستنی ئایینەکەیان وهێنانەدی بەرژەوەندییەکانی موسڵمانان و وڵاتەکەیان و بانگخوازییەکەیان.

## یاسای ئاساییش، نەك یاسای ترس و تۆقاندن:

هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە سزادانی تاوانباران، لە هەموو بارەکاندا جەخت لەوە دەکاتەوە کە کۆمەڵگە مافی هەیە تا سزای گونجاو دابنێ بۆ بنبڕکردنی تاوان، بەپێی پێویست و بە ڕەچاوکردنی دۆخی شوێنی و کاتی، بەپێی ئەو ئاڕاستە ئیسلامییەی ڕێگە نادات بە تێپەڕاندنی ئەو بنمیچە سنوورییەی قورئان دیاریکردووە.

وە بەم چەمکە ئیسلامییە گشتگیرەی یاسای سزادانی ئیسلامی کە مەبەستەکان دێنێتە دی، لەگەڵ ڕەچاوکردنی زۆربەی ڕووکارەکانی ژیانی کۆمەڵایاتییانەی ڕاستەقینە لە گەلێك بواری جیاجیادا، وەکو بواری پەروەردەو ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، کە پەیوەستن بەبنمیچ و دوا سنووری (سنوورە شەرعییەکان لە قورئاندا)، چونکە کاری دیاری کردارییانەی سزاکان لە هەموو بارەکاندا هێڵدراوەتەوە بۆ لیژنە و ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری کۆمەڵگە (ئوممەت) بەپێی تێڕوانینی ئوممەت (کۆمەڵگە) و قەناعەتەکانی لەسنووری(سنوورە شەرعییەکاندا)، بەجۆرێکی ئەوتۆ بازدانە بەسەریداو ئەنجوومەنی ڕاوێژکارییەکەش مەبەستی ڕاستەقینەی دیاری کردنەکە بێ، واتا بەرەنگاربوونەوەی تاوان و دەستەبەرکردنی هۆکارەکانی بەرگرتن لەو کەسانەی کە بەنیازن دژایەتی و سووکایەتی بە کۆمەڵگەبکەن، یان سووکایەتی بە بەها باڵاکان و مافەکان و خوێن بکەن، ئەمانەش لەپێناو دەستەبەرکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، لەهەموو دۆخەکاندا دەبێ وردەکارییەکانی کۆمەڵگە ڕەچاو بکرێن، تەنانەت کاتی سزادانیش، یان کاتی لێخۆشبوون، وە دەبێ بە جۆرێك بن کە بەرزترین سنووری ئەوسزایانە بن کە

دەقی قورئانیان لەسەر هاتووە و نابێ سزاکەش ئەو سنوورە قورئانییانە تێپەڕێنێت و هاوکات نەرمیشی لەگەڵدا بێ بە جۆرێك کە جێگەی لێبوردنیشی تێدا بێتەوە، ئەگەر تاوانەکە زێدەڕەوی و دووبارەکردنەوە و ئینکاری تێدا نەبێ و نەبووبێتە مایەی پێشێلکردنی مافەکانی ئاسایشی کۆمەڵگە، لەو بارودۆخە کاتی و شوێنییەی کە کۆمەڵگەی تێدا دەژی.

ئەگەر سەیرێکی کۆمەڵگە هاوچەرخەکان بکەین ـ سەرەڕای ئەو هەموو گرفتانەی کە بە دەستیانەوە گیرۆدەن لە زێدەڕەوی و خراپی ولادان ـ کەچی هێشتا هەندێك یاسایان هەیە و پێوەی پابەندن، بەڵگەیە لەسەر زانست و حیکمەت و شارەزایی و پێگەیشتن، کە لە بنەڕەتدا ئەو یاسایانەیان زۆرینەی هاو مەبەستە و گونجاوە لەگەڵ یاساکانی شەریعەتی ئیسلام و سرووش (وحی)، ئەمەش کاتێك بە باشی هەستی پێدەکەین کە قوڵتر بینەوە لە لێتێگەیشتنیان، هاوکات هەندێ لەو وڵات و کۆمەڵگایانە بەردەوام یاساکانیان دەگۆڕن و لە بارێکی جێگیردا نین، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە بنبڕکردنی کەتن و تاوانەکان، بەپێی دۆخی ڕۆژگار دەیانگۆڕن، کە شیاوی بارودۆخ و پەڕاوەی کۆمەڵایەتیانەی ژیانی هەموار و ناهەمواریان بە هەند وەردەگرن، ئەوەتا بۆ نموونە جارێك سزای لەسێدارەدان بە یەکجاری هەڵدەگرن و جارێکی تر سەرلەنوێ بەکاری دەخەنەوە، لەو ڕووانگەیەوە کە ئەوە گونجاو و شیاوی کۆمەڵگەکەیانە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کەتن و تاوانەکان و پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگەکەیان، ئەمەش لە چوارچێوەی دیدگەی کۆمەڵگەو وڵاتەکەیانەوە، بەپێی چەمکی خۆیان و بەهاو نەریتەکانیان، نەك هەر ئەمە، بەڵکو جاری وا هەیە هەر لەهەمان وڵاتدا،

سزایەکی وەکو لەسێدارەدان لە بەشێکدا جێبەجێ دەکرێ و لە بەشێکی تر هەڵدەپەسێردرێت، ئەمە دۆخی زۆربەی سزاکانی تریشە لەلای ئەوان، کە لەنێوان توندکردن و سووك کردندا سزاکان یاری دەکەن، بەپێی جۆری پێویستی کۆمەڵگە، لە پێناوی هێنانەدی سەقامگیری و ئاسایشی کۆمەڵگەدا بۆ هاوڵاتیان، چەندیان بۆ بکرێت بەمجۆرە شیاوترین ڕێکار دەگرنە بەر.

ڕێگەی زانستییانە و گشتگیرانە و ڕێککاری و هەستکردن بەمەبەست و ئامانجە شەرعییەکان گرنگە بۆ بیرمەندان و زانایان و ڕاوێژکارانی ئوممەت، بۆ دووبارە سەرلەنوێ چاو پێداخشاندنەوەیان بە زۆربەی ئەو کاروبار و بڕیار و یاسا و حوکمانەی هزری ئیسلامی هاوچەرخ لەم سەردەمەدا تیایاندا کەوتووەتە هەڵەوە ـ نەك سروش (وحی) و دەقی دابەزێنراوی قورئانی ـ ئەمەیان لە ڕابوردوودا و لە ئێستاش دا هەر بەرکارەو بێ کەموکورتیە، بەڵام ئەنجامە ناهەموارەکانی خراپ پەیڕەوکردنیان ڕوون و دیارن، گەرچی بە ئەنقەست و بە مەبەست نەکراون، تا دواجار ئەم هەڵەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە لەلایەن نەیارانەوە ئەم وێنە ناشیرینانە قۆرخ بکرێن بۆ شێواندنی یاساکانی ئیسلام، هەروەکو لە هەندێ شوێن بە ناوی (پیرۆزییەوە) ئەم هەڵانە و ئەو دیدگایەی تەنها بەشێکی شەریعەتی ئیسلام دەبینێت تەواو خراونەکار بۆ لێدان لە ئیسلام و ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی، بە تایبەتیش لەلایەن کەسانی دەسەڵاتدارو سەرۆك و سوڵتانەکانەوە، بەمەبەستی داماوکردنی خەڵك و پلیشاندنەوەی خواستەکانیان و ستەمکردن لە تواناکانیان و سووکایەتی پێکردنیان، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بەدوای خۆیدا چەندین کەس و چین دروست ببن لەوانەی کە دڵ پڕ لە قین و

تۆڵەسێن و گەندەڵ و ستەمکاربن لەناو خودی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان و مرۆڤە موسڵمانەکانیشدا، وە دروست بوونی کەسێتییەکی کۆیلەی دەروونتۆقیوی خراپ، هەروەکو بە چاوی خۆمان لە ئێستادا ئەم کەسانە بەدی دەکەین لەناو حاڵ و دۆخی ئێستای ئومەتی ئیسلامی و موسڵمانانی هاوچەرخدا، سا مەگەر کەسێك کە خودا پاراستبێتی.

لەوانەیە ئەو رژێمە سەربازییە بەدکارانەی لەم چەرخەدا بینیمان پشتیوانییەك بێت بۆ ئەو بۆچوونەی ئێمە بۆ دڵنیا بوون لەم ڕاستییە ئەو نموونانە بەس بێت کە لە هەندێ بنکەو دامەزراوەی سەربازیانەی بەدکاردا لەم ڕۆژگارەدا دەیانبینین، هەروەکو لە سوودان و عێراق ڕوویدا، کە هەموو هۆکار و ئەیدۆلۆژیایەك خرانە کار بۆ برەوپێدان بە بەردەوامی ئەو دامەزراوە سەربازیە گەندەڵانە، لەو هۆکارانەش، وەکو (نەتەوەگەری، لیبراڵی، سۆسیالیستی) هەموویشی لەپێناو درێژەدان بە مانەوەی دەسەڵات و بیانووهێنانەوە بۆ ستەمکارییەکانی ئەو دەسەڵاتە، وە داماوکردنی میللەت وگەلەکانی ئەو وڵاتانە، تا دواجار پەناشیان برد بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی —نەك بۆ رێنومابیوەرگرتن لێی یان سەرخستنی، بەڵکو بە مەبەستی ڕەوایی دان بە کاری تیرۆر و تۆقاندن بەسەر کۆی گشتی خەڵکیدا، وە ترساندن و تۆقاندن و پووکاندنەوەی خواستەکانیان، بەناوی پیرۆزی (قداسە)و ئایینەوە، ئەمەش بەوەی کەدەسەڵاتداران پەنایان برد بۆ جێبەجێکردنی دوایین سنووری سزا ئیسلامییەکان، زۆر بە توندی وە بەوپەڕی زێدەڕەویەوە، وە جێبەجێکردنیان بە هەق و ناهەق، بە تایبەتیش بەسەر کەسە بێ هێزو

داماوەکاندا، وە تێوەگلاندن و ڕاوەدوونانی سەرجەم خەڵکەکە، بەیانی و ئێوارە، ئەمانەیان کرد، بەناوی پەیڕەوکردنی سزا ئیسلامییەکانەوە، ئەوەی کە زۆر خەمناك و قێزەونە، ئەوەیە کە ئەم ڕێکخراوو دامەزراوە عەسکەرتارییانەی دەسەڵات –سەرەڕای سووربوونیان لەسەر جێبەجێکردنی توندترین سزا بەسەر کۆی خەڵکەکەدا بەگشتی– هاوکات هەموو شتەکان و یاساکانی تری ئیسلامیان فەرامۆش کرد و گوێیان پێ نەدان، وەکو مەبەستە شەرعیەکان، بەرژەوەندییە گشتیەکان، یاساکانی چاکسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕەوشتی وپەروەردەیی، لە کاری دادەپەروەری و بنیاتنانەوەدا، وە لە ڕێگریکردن لەستەمکاری و گەندەڵکاریدا.

لەبەرئەوە، لەسەر هەموو لایەك پێویستە، کە بەوپەڕی کۆششی سووربوون لەسەر خواستەکان و بەپێی ڕووکارە زانستییە پرۆگرامی ئایینییە کۆمەڵایەتییەکە کار بکەن، چاو بخشێنرێتەوە بە زۆربەی ئەو کاروبار و دۆزانەی ئوممەتی ئیسلامی بەمرۆژە گەیاند و ڕیسوایی وسەرکزی و لاوازی و پەراوێزبوون وتیاچوونی هێنایە کایەوە، وە سەرجەم ئەو ڕێگایانەش بگیرێن کە بوونە هۆکاری نەفامکردن و گەمژاندنی ئەم میللەتانەی ئیسلام و ئەو قین و داماوی و ڕیسوایی و برسیکردنەی یەخەی گرتوون، وە ئەم ستەم و نادادیەی بە کاروباری موسڵمانان دەکرێ، وە خراپە بەکارهێنانی خواست و پیرۆزییەکانی ئەم خەڵك و ئایینە لە پێناوی گروپێکی کەمینەی دەسەڵات بە دەستی گەندەڵ و فەرمانڕەواوە، وە لێسەندنەوەی دەسەڵات لەو قۆرخکارانە، وە ئەو سامان وداهاتە زۆرەی کە دەستیان بەسەردا گرتووە، وە بەهەدەر دانی ئەو هەموو وزەو توانا بێ شومارانەی کە لەو خەڵکەدا

هەیە، کە ئەوان بوونەتە هۆی پووکاندنەوەی تواناکان و هێزی گەشەکردنی بنیاتنان و داهێنان و پێشکەوتن لەناو ئەم میللەتەدا.

ئەوەش ڕاست نییە کە داخوازی جێبەجێکردنی کەمترین سنووری سزاکان بە کەمتەرخەمییە دابنرێت لە پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامی و پابەندبوون بە شەریعەتی ئیسلامی و مەبەست و سنوورەکانی، هاوکات ئەوەش هەر ڕاست نییە کە هەندێ پێیان وابێ کە گوایە ئەمە دەبێتە هۆی کەمتەرخەمی لە پەرستشەکاندا وە یان خاوبوونەوە لە جێبەجێ کردنیاندا بەو چاوەوە کە وا دابنرێت کە ئەم پەرستشانەش هەر فەرزن ودەچنە خانەی بەرزترین سنووری سزاکانەوە، لە ڕاستیدا فەرزی پەرستشەکان پێچەوانەی سزادانی تاوانەکانن، چونکە (لانیکەمی سنورەکان)ی تێدا فەرز کراوە بۆ درێژەدان بە بەردەوامبوونی پەیوەندیەکان بە خوداوە، وە هەر پەرستشێکی تر لەو دیاریکراوانە زیاتربێ، دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی پێویستبوونی پەیوەندی مرۆڤەکە بە خوداوە، هەر بۆیە ئیسلام لەم بارەیەوە هانی مرۆڤ زۆر دەدات بۆ ئەوەی بە خواستی خۆی زیاتر لە خودا بپارێتەوە و بیپەرستێت، بەپێی دۆخی خۆی و پێویستییەکانی ناخی دڵی خۆی، لەو پەرستشە زیادانەی کە ئیسلام هاندەرە بۆ کردنیان وەکو نوێژە سوننەتەکان و شەونوێژەکان و تەراویح و مانەوە لە مزگەوت بۆ خواپەرستی و ڕۆژووەکانی شەشەڵان و نۆمینەی حاجی و ڕۆژوی ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە و گەلێك سوننەتی تر کە مرۆڤ ئازادە لە کردن و نەکردنیاندا و هەر کەسەو بە هێندی تواناو خواستی خۆی دەتوانێت جێبەجێیان بکات.

هەر بۆیە ئەگەر داواکرا کە کەمترین سنووری سزادان دابنرێت بۆ ئەو کەسانەی پەرستشەکان جێبەجێ ناکەن ـ ئەگەر وا زانرا کە ئەو جۆرە سزادانە دەبێتە مایەی چاکسازی وکپکردنەوەی تاوانکردن ـ ئەوا ئەم سزادانە هیچ پێچەوانە نییەو دژی لانیکەمی فەرزی پەرستشەکان نیە، کە پێویستە هەمووکەسێك پابەندبێ پێیانەوە بۆ درێژەدان بە بەردەوامبوونی پەیوەندیەکانی بەخوداوە، ئەنجامدانی سوننەتەکانیش هەر کەسە و بەپێی توانا و خواستی خۆی.

بەم جۆرە هەبوونی دەق بۆ (لای سەرووی سنووری سزادان)، بەرانبەرە بە هەبوونی دەق بۆ (لای خوارووی سزاکان)ە لەفەرزەکانی پەرستشدا، چونکە هەردوو سنوورەکە سەرەڕای بەرانبەربوونیان بە یەکتر، هاوکات دوو دۆخن و وەکو دوو دیوی دراوێك وان، هەردووکیان هەمان واتا دەگەیەنن بۆ هەمان چەمك، وە ئامانجەکەش هەریەکە، چونکە مەبەست لە سزادان، ئەشکەنجەدان نییەو تۆڵەسەندنەوە نییە، وە ترساندن و چەوساندنەوە نییە، بەڵکو مەبەستەکە ڕێگرتنە لە بڵاوبوونەوەی تاوان وبەرلێگرتنیەتی، وە هەر سزایەکیش ئەو ئامانجە بەدەست بێنێ، بەسەو تەواوە، بەڵام مەبەست لە پەرستشەکان، واتا یادکردنەوەی خوداو پەیوەندی بەردەوام لەگەڵیداو داواکردنی بەردەوامی ڕێنماییکردنی بۆمان و هاوکارییکردنمان، کەواتە ئەو داوایەی لە ئەنجامدانی فەرزەکانی(لای کەمی پەرستشە زیکرییەکان)دایە و هاندانی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانیان و جێبەجێکردنی ئەو سوننەتە زیادانە، بەپێی توانا، دەبێتە مایەی هاندانی بۆ پاکژی و بەردەوام بوونی لەسەر کاری چاك

و دورکەوتنەوە لە نادادی و ستەمکردن و دوژمنایەتی و خۆلادان لە گوناح و تاوان و بەدکاری.

خودای گەورە دەفەرموێت: [يا أَيُّها ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا(٤١)وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا(٤٢)هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا(٤٣)] (الأحزاب:٤١-٤٣)، هەروەها دەفەرموێت: [ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ](العنكبوت: ٤٥) وە لە سورەتی (الماعون) دەفەرموێ: [أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ] واتا ئەو کەسە درۆ دەکات لە بانگخوازیەکەیدا، وە لەوەدا کە خۆی بە دیندار دەزانێ و لایەنگریەتی[فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ(٢)وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ(٣)]، چونکە کارەکەی و ڕەفتارەکەی بانگخوازییەکەی پشت ڕاست ناکاتەوە، بەوەی کە گوایە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە باوەڕدارە [فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ( ٤ )] سزای سەخت بۆ ئەو نوێژ خوێنانەی کە [ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ( ٥ )] بێ ئاگان لە واتای نوێژەکانیان [ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ( ٦ )] ئەوانەی بە ڕوکەش و بۆ ڕیایی نوێژ دەکەن و دڵیان لەسەری نییە، [وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ( ٧ )] ڕێگرن لە بەخشینی هاوکاری بۆ داماوو هەژاران، بە گشتی واتا کارە ڕووکەشانەکانیان هاو مەبەست نین لەگەڵ ئەو نیاز و باوەڕەی کەوا دەردەخەن گوایە باوەڕدارن، ئەگینا لە ڕاستیدا ئەوان درۆ دەکەن لە نوێژ کردنەکەیاندا و تەنها بە ڕوکەش نوێژ دەکەن، ئەوانە ڕیاکارو ڕووپاماکارن. هەر لەم ڕووەوە چەندە جوانە، کە ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی) دەگێڕێتەوە لە

پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) کە فەرمووی: (چەندین ڕۆژووەوان هەیە، هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لە برسێتی، وە چەندین کەس هەیە شەو ناخەون و تا بەیانی خەریکی خواپەرستین، بەڵام جگە لە شەونخوونیەکەیان هیچیان بۆ نامێنێتەوە)[1].

ئەگەر بەو شێوەیەی باسمان کرد، ئاوا لە سستەمی سزادانی ئیسلامی تێگەیشتین کە تیایدا بە تەواوەتی هەست بە گونجان دەکەین لە نێوان تێگەیشتنی سروشتەکان و ڕێنمواییەکانی سرووشدا (وحی)،ئەوا بە باشی درك بە ڕۆڵی عەقیدە و ڕۆشنبیری و ویژدان دەکەین، هەروەها بە ڕۆڵی پەروەردە لە ئاڕاستەکردنی ڕەفتاری تاکە کەسدا بۆ بەدەستهێنانی مەبەستە باڵاکانی شەریعەت، ئیتر لەو کاتەدا سستەمی سزادانی ئیسلامی –وەك باسمان کرد– دەبێتە سستەمێکی زیندووی پێشکەوتووی تێر و تەسەل، وە سەرچاوەی هەستکردن بە ئاسایش و ئاسودەیی ودڵنیایی، بە پێچەوانەی ئەو وێنە بەستەڵۆکە مردووەی کە بە ناتەواو دێتە بەرچاو لەلای هەندێ کەس، ئەو نیمچە وێنەیەی کە زۆر ترسێنەر و ناتەواو خراوەتە ڕوو لەلایەن زۆر کەسەوە کە لە بنەڕەتدا دڵسۆزن، بەهۆی زاڵبوونی پرۆگرامی شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە و بەهۆی نەبوونی پرۆگرامی زانستیانەی گەردوونیانەی کۆمەڵایەتییانەوە و ئەم نیمچە تێڕوانینە ناتەواوە دەبێتە ئامێری تێڕوانین بۆ نمایش و خستنەڕووی شتەکان و هاوکات هەندێ لەوکەسانەی بە مەبەستی خراپ و ئامانجی وێرانکەر دەتوانن بەکاری بهێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی وێنەی ئیسلام لەلای گەل و میللەتانی ترو بڵاوبوونەوەی ترس و بیم و نەمانی هەستکردن بە

---

[1] (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە، (تتمة مسند أبي هريرة)، فەرموودەی ژمارە (٩٣٩٢).

ئاسایش –گوایە– لە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی ئیسلامەوە دێنەوە کایە، جا ئەم دروستبوونی هەستە بە هۆشیارانە بێ یان ناهۆشیارانە، لەنێو دڵی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتەدا و دڵی زۆرێك لە خەڵکیش دەهەژێنێ، گەرچی دەریشی نەخەن و جۆرێك لە شلۆقی متمانەیان لەلا دروست دەکات بەرانبەر ئایین و شەریعەتەکەیان.

## گرنگی چاکسازیکردن لەبواری فێرکردن و پرۆگرامی ئیسلامی هاوچەرخ :

ئەم باسە و ئەم لێکتێگەیشتنە لە سستمی سزادانی ئیسلامی، دوو شت نین کە بەرهەمی ئەندێشەو وردبوونەوە بن لەدەقەکان بە شێوەیەی تیۆریەکی پەتی، بەڵکو بەرهەمێکن کە لە ئەنجامی قوڵبوونەوە و توێژینەوەی کردارییانەوە دەستکەوتوون، کاتێك توێژینەوەمان کرد بۆ سروشتی کەسەکان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و دەروونییەوە، وە ئەمەش لە ڕێی وەڵامدانەوەی خوێندکارانی زانکۆ –کاتێك هەوڵ دەدرا کە باڵەخانە و ژووری بەشی ناوخۆییان لە زانکۆ بۆ دروست بکرێ، واتا خودی کارەکە بۆ پێویستییەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی کرا، وە ئەمەش بووە هۆی قوڵبوونەوە و توێژینەوەی وردتر بە شێوەیەکی زانستیانە و کۆمەڵایەتیانە تا گەیشتینە ئەوەی کە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ لێی تێبگەین زۆر فراوانترە لەوەی کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە، سەبارەت بە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامی و ئامانج و دەلالەتەکانیان دەربارەی دۆزی سستمی سزادانی ئیسلامی و دەلالەتە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان، کە دەبێتە هۆی

بڵاوبوونەوەی ئاشتی و بەرقەراربوونی ئاسایش لەناو خەڵکیدا، کە دەشێت ئەو خەڵکانە پابەندی شەریعەتی ئیسلام بن لە ژیانی خۆیاندا.

وە بە ڕەچاونەکردنی ئەوەی ئاخۆ مەودای وردی ئەو ئەنجامانەی لەم توێژینەوەیەوە دەست کەوتن چەندە و ئاکامی تێڕوانین و شیکردنەوەکان بەچی گەیشتووە؟ وە ئایا مەودای گونجان و نەگونجان چەندە لە وردەکاریەکاندا؟ گرنگ ئەوەیە تێگەیشتین کە ئەم توێژینەوە و بەدواداچوونە بووەتە نموونەیەکی ئەزموونی زانستی و کۆمەڵایەتیانەی زیندوو، دەکرێت دەروازەیەك بێت بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییەی کە هەیە لە تەواوکاری نێوان ڕێنمایی خودایی بۆ سەر دینداری و (وحی) ئیسلامی، وە پەیبردنی ژیرانەی پرۆگرامییانەی زانستییانەی وردی ماکی مرۆیی و سوننەتە گەردوونییەکان لە بەدیهێنراوەکاندا، وە زانینی واقیع و دۆخ و داخوازییەکانی، واتا پرۆگرامە ئیسلامییە ژیرییەکەی مەعریفە، کە ئەویش پێکهاتووە لە چەند پرۆگرامێکی زانستیانەی هەمەجۆر، لەوانەش پرۆگرامی ئەزموونگەرایی، نەك پرۆگرامی ژیرییە وێنەییە تیۆرییە ئەفسانەییەی کە لە شارستانییەتە لەناوچووەکەی گریك ماوەتەوە، کە لە ڕووی مێژووییەوە —بەداخەوە— زاڵ بوو. بەسەر عەقڵی موسوڵماناندا، وە بووەتە هۆی بەرپابوونی دۆز و جەنگی خەیاڵییانەی وا کە عەقڵی موسڵمانی خستە دواوە لە دۆزە پێسپێردراوە گرنگەکەی ژیان، ئەویش ئەو پرۆگرامەیە کە مەعریفەکانی وەحی و زانستەکانی سروشت و ماك و واقعی ژیانی کۆمەڵایەتییە، تا بیکاتە سەرچاوەیەکی مەعریفەی ئیسلامی و تێڕوانینی ژیری زانستییانەی کردارییانەش هۆکاری لایەکەی تر بن بۆ مەعریفەی ئیسلامی، بەم جۆرە زانستە کۆمەڵایەتیە ئیسلامییەکان گەشە

دەکەن، کە وا دەکەن ماك و مرۆڤ بابەتی توێژینەوەو تێڕوانینیەتی، هەر بەم چەشنە بە باشی تێگەیشتن بەرپا دەبێ لە وتاری وەحی و ڕێنماییەکەی بۆ ماکی مرۆیی، وە عەقڵ و توێژینەوەو تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی ژیری —بە هەموو هۆکارەکانیەوە— هۆکارو ئامێری ئەو توێژینەوە و تێڕوانینەیە.

واتا (وحی)و ماکی مرۆڤایەتی و یاسا گەردوونییەکان و واقعی ژیان، سەرچاوەی مەعریفەی ئیسلامین، کە لە بنەڕەتدا (وحی) دەربڕینێکی ماکی مرۆڤایەتیە و هۆشیار کردنەوە و ڕێنماییە بۆی و خستنەگەڕی تواناکانیەتی بۆ هەڵگرتنی سپاردەی جێنشینیکردنەکەی لەسەر زەوی، کە ئەمەش لە خودی ڕەسانەیەتی ماکەکەیدایە، هیچ قورسی و داخوازییەکی گرانی نەخستووەتە سەر جەوهەری ماکەکەی، ژیری و بیر و مێشکی ساغ و بەڵگەنەویستەکانی کەرەستەی پرۆگرامی تێڕوانین و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیەتی بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ لە مانای (وحی)و مەعریفەی ناسینی ماك و یاسا گەردوونیەکان و واقیعی ژیان.

گرنگترین ئەنجامی ئەم ئەندێشەو وردبوونەوە زانستییە کۆمەڵایەتیانە هاومەبەستە لەگەڵ پابەند بوونی مرۆڤ بە حوکمەکانی شەریعەت و مەبەستە شەرعییەکان، وەك پرۆگرامێکیش خرایە ڕوو بۆ توێژینەوە لە مەبەستەکانی سستمی سزادان لە ئیسلامدا و چۆنیەتی لێتێگەیشتنی و شێوازی جوانی خستنە ڕووی، ئێمە پێمان وایە کە ئوممەت لەم کاتەدا، زیاتر لە هەموو کاتەکانی تر پێویستی بە توێژینەوەی لەم جۆرە هەیە، چونکە بابەتی لەم جۆرە دەبێتە هۆی دروستکردنی متمانەی زیاتر بەم شەریعەتە و وابەستە بوونی دڵەکان و ڕەواندنەوەی گومانەکان لە دوو دڵی پابەندبوون پێوەی و

دورخستنەوەی هەستی ترس و تۆقین لێی، چونکە ئەم جۆرە هەستە ناهەموارانە، هەرکات زاڵ بوون بەسەر دەروونی کەسەکاندا، وەك ئەم ڕۆژگارەی ئێستا بەسەر ئوممەتدا هاتووە، تووشی ئیفلیجی دەکات و دەبێتە هۆی سست بوون و پوکانەوەی هێزە شاراوەکانی ناخی تاکەکانی کۆمەڵگە و خاوبوونەوەی کار و مراندنی ویستەکانی.

بێگومان هیوا وەهایە کە هەموومان پابەند بین بە ئیسلامەکەمانەوە، لە ڕووی عەقیدە و پڕۆگرام وژیری زانستیمان بە شێوە تەواوە گشتگیرییەکەیەوە، بەچەشنێك کە هەموومان کۆبکاتەوە لە سەر ڕێنماییەکانی وەحی و تێگەیشتنە زانستییەکەی سروشتی نەژاد و یاسا گەردوونی و بەهەند وەرگرتنی واقعی دۆخی کۆمەڵگە و گرنگی توێژینەوەکان بەپێی کات و شوێن. بە ڕەچاوکردنی ئەوگرێ و کێشە جۆراوجۆرانەی دێنە ڕێمان و ئەو وزە و توانایەی لەبەردەستماندایە (یەکبوونی مەعریفەی ئیسلامی)، چونکە ئەم پڕۆگرامەیە کە یەکگرتن بەرپا دەکات لە ڕووی زانستییەوە بۆ سەرچاوە مەعریفیەکانی ئیسلام لە وەحی ماك، وە بە پڕۆگرامە ژیرییە زانستییەکەی چەمکی جێنشینمان لەسەر زەوی چالاك دەکات.

ئەم پڕۆگرامە بوو کە زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیای فراوان کرد، چونکە پەیڕەویان کرد، هەنگاو بە هەنگاو پڕۆگرام و بەرنامەی ئەو زانکۆیەیان پەرە پێدا (پسپۆڕی ئاوێتە) ئێمەش خوازیارین کە پەرەی زیاتری پێ بدرێ لە ڕێی توێژینەوەی زانستی و کۆکردنەوەی زانستی زیاتر، تاکو ببێتە مایەی هێنانە کایەی مەعریفەیەکی ئیسلامی ڕاستەقینە و بنیاتنانی زانستە کۆمەڵایەتییە مرۆییە ئیسلامییە ڕاستەقینەکە، کە کادر و کارمەندەکانی بەم

پێشدەستیکردنەیان سەلماندیان کە توانیویانە ببنە پێشەنگێکی سەرکەوتوو بۆ ئەم ئوممەتە، بە چەشنێك خاوەن ژێری زانستییانەی داهێنەرانەی پڕۆگرام بن، بەوەش بناسرێنەوە کە تێرو تەسەل و پڕ لە مەعریفەی گشتی و گشتگیرانەی ڕێك و پێك بن، بە جۆرێکی ئەوتۆ کۆکەرەوەی ڕێنامییەکانی وەحی و سروشتی نەژادی مرۆڤایەتی بن، هەروەها بە باشی کاریگەری و واقیع کارا بکەن، لەسەر بنەمای مەعریفەی زانستییانەی ژیرانەی کردارییانەو ئەزموونییانەی وا کە بێگومان هەر ئەوەمان پێویست بێ بۆ بنیاتنانی زانستەکان بە گشتی و زانستی کۆمەڵایەتییانەی ئیسلامی بە تایبەتی، کە هەر ئەو شێوازەشە توانیویەتی سوود وەربگرێ لە ڕێنمایی وەحی و پەردەش لابدات لەسەر دۆزینەوەی پڕۆگرامگەرایی وزانستی ئەوتۆ کە مەبەست و حیکمەتەکانی ئەم شەریعەتە پاکەی پێوە دیار بێ، هەر بەوەش بووە بە سەرچاوەیەکی کارا بۆ ڕێنماییکردنی کاروانی ئەم ئومەتەو تازەکردنەوەی تواناو لێهاتووییەکانی و بەشداریکردنی چالاکانە لە بەگەڕخستنی شایستە لە کاروانی شارستانێتی مرۆڤایەتیداو لادانی لە کوێرەڕێکانی خورافات و پێشبینی هەڵەو نینۆك و چڕنووکی هیچگەرایی ماتریالیزمی.

## وانەیەك لە پڕۆگرامگەرایی:

بەکورتی ئەو لێبوردنەوەیەی پێشوو، بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن توێژینەوەی زانستییانەی دەروونی کۆمەڵایەتییانە سەبارەت بە شوێنی نیشتەجێکردنی خوێندکارانی زانکۆ توانی تیشکێك بخاتە سەر دۆزێکی گرنگی دۆزە شەرعییەکان و دەلالەت و مەبەستەکانیشی بخاتەڕوو، وە وایشی لێ بکات کە لە بابەتێکی

سـەپێنراوی هەڕەمەکییـە بیکاتـە دۆز و بابـەتێکی زینـدوو، بەمـەش بـوو بـە یاسـایەکی واتـا بەخشـی خـاوەن دەلالـەت لـە سروشـتی دەروونـی مرۆڤەکاندا و لە بنچینەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی.

هـەروەها نووسـەری ئـەم کتێبـەش ئومێـدەوارە –بـەبێ گوێدانـە ئـەوەی کەوتووەتـە هەنـدێ هەڵـەوە لـەم توێژینەوەیـەدا– کـە توێـژەران و شـارەزایان چـەند لـە تواناياندایـە بایـەخ بـدەن بـەپرۆگرامی زانسـتییانەی ئیسـلامی وە دەسـت بکرێـت بەپـەیرەوکردنی، گەشـەپێدانی، گشـتاندنی، لـەڕووی توێژینـەوەوە لـە جۆرەهـا لایـەنی ژیـانی کۆمەڵایـەتی لەکۆمەڵگـە موسـڵمانەکاندا، بـە مەبەسـتی کـارا کردنـی ڕاسـتێتی مـاکیی مرۆڤایـەتی لەجێنشـینێتی مرۆڤـدا لەسـەر زەوی و دووبـارە بنیاتنانـەوەی کۆمەڵگـە و گێڕانـەوەی توانـاو خواسـتی بنیاتنەرانـەی ئەوجێنشـینیە، وە سـەرلەنوێ چـاو بخشـێنرێتەوە بـەو چارەسـەرە هاوچـەرخانەی لـە ئێسـتادا هـەن دەربـارەی نـەگۆڕە ئیسـلامییەکان بەگشـتی، وە وتـاری ئیسـلامی و چـاککردنەوەی و لێتێگەیشـتنی لەچوارچـێوەی پرۆگرامگـەرایی ئیسـلامی زانسـتییانە و گشـتگیرانەی تـەواوی وا کەدەچـێتەوە پـاڵ سـەلامەتی لێتێگەیشـتنی دەقـە شـەرعییەکان –توێژینـەوەی زانسـتییانەی مـاك، بەوپـەڕی ئـەو سـنوورەی لـەتوانای مەعریفەدایـە، وەلەبـەر ڕۆشـنایی واقیعـی هاوچـەرخ و تواناکـەیان، تـا ئیسـلام وەکـو ئیسـلام لـەکاردا بـێ و شـەریعەت و نەگۆڕەکانیشـی سـەرلەنوێ تـازە بکرێنـەوە –بـە هێنـدی ئـەوەی کـە مـرۆڤ دەتوانـێ پێـی بگـات و لـە توانایدایـە– گەشـەی شارسـتانێتی

مرۆڤانـــەی جێنیشـــینێتی ســـەرزەوی و ئاوەدانکردنـــەوەی پـــڕ لـــە فـــەڕ و خێردارانە بۆ جیهانێکی نوێی مرۆڤایەتی بێتە ئاراوە[1] .

---

[1] بەسوودە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە پەیوەندی چییە لەنێوان سنووری مەعریفەی گەردوونی و چەمکی تێگەیشتن لە وەحی و هۆشیاری و ڕێنماییەکانی و قەناعەت بوون بە هەردووکیان، مەبەستی وەحی بەردەوامی ڕێنمایی کردنی مرۆڤە بۆ هەوڵدانی لەم ژیانەدا و هاوکاریکردنێتی لە تێگەیاندنی مرۆڤ بۆ ئاشنا بوون بە گشتینەکان لەبنچینەی بوونەوەردا، هەروەکو قورئانی پیرۆزیش بەچەندین جۆرو دەربڕینی جیاجیا ڕووکاری ئەم تێگەیشتنە لەوەحی دەخاتە ڕوو، سەبارەت بەباسکردنی دیاردە گەردوونییەکان بە جۆرێکی وردو دەروون وروژێنەر بەبێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە چۆن لێکی دەداتەوە لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا، نموونەی ئەوەش چیرۆکی باس کردنی شێوە ئەندازەییەکەی زەوییە، کە بە (ڕووتەخت) باسی کردووە [وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ] (الغاشیە:٢٠)، هەروەها بە(ڕاخراو) باسی کردووە [وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا] (نوح:١٩) وە بە (درێژکراوە) باسی کردووە [وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ] (الرعد:٣)، وە بە (شێوە هێلکەیی) باسی کردووە [وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَا ] (النازعات:٣٠)، هەموو جۆرە باس کردنەکان مەبەستی جوان نیشاندانی دەستی توانای داهێنەرانەی خودایە، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ مرۆڤ چۆن لێی تێدەگات، وە چۆن شێوەی زەوی بەدی دەکات، وە پێشتر زەوی هەسارەیەك بووە وەکو هەموو هەسارەکانی تر و شێوەیشی(نیمچە تۆپ) بووە، بەڵام شێوەکانی تری (ڕوتەخت، ڕاخراو، درێژکراوە، هێلکەیی) لە ڕووی نیمچە دیدگەی بەشەکیەوەن بە گوێرەی بینەرەکەی و پێچەوانەی (شێوە نیمچە هێلکەیی)یە بتەڕەتیەکە نین، وە ئەم زانیاریانە زۆر پێشکەوتووترن لەو زانیاریە مەعریفیانەی مرۆڤ پێی گەیشتووەو گوماناوییە، خودا باسی (شێوە هێلکەیی)یشی بۆ شەوو ڕۆژیش باسکردووە، [خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ] (الزمر:٥) کە مانای ئەمە لەو سەردەمەدا گران بووەو گوماناوی بووە، بەڵام لەچاخەکانی دواتردا کە زانستی گەردوونزانی پێشکەوت حیکمەتی ئایەتەکان زیاتر درەوشایەوە، وەك پەرچوویەکی قورئانی لە چاخەکاندا (تکویر اللیل والنهار)

کێشه سەرەکیەکە بەپلەی یەکەم لەوەدا نیە ئاخۆ (نەگۆڕ چییە؟ وە گۆڕاو چییە؟) بەڵکو گرنگترینە کە لە کارەکەدایە، کە ئایا چۆن لێی تێدەگەین و چۆن دەیخەینە ڕوو ئەو شتەی کە نەگۆڕە، وە چۆن ئوممەتی پێ دەدوێنین و وە چۆن ماکی مرۆڤایەتی و پەیامی ئوممەتی پێ کارا دەکرێ، لەسەرکردایەتی کردنیەوە تا ڕێنماییکردنی و پێشەنگبوونی بۆ

---

زوو وا لێی تێگەیشتبوون کە مەبەست لە بەدوایەکا هاتنی شەو و ڕۆژە، بەڵام کە زانست دەری خست کە زەوی شێوەی هێلکەییە، ئیتر مانای وردتری ئایەتەکە زانرا، پاشان خودا باسی ئەوە دەکات کە (خۆر)یش هەر (تۆپ شێوە)یە [إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ] (التكوير:١)، ئەمڕۆ (شێوە تۆپ)ی (خۆر) لەخانەی پێوانەکردنی نادیاردایە بە بەراورد بە شێوە دیارەکەی زەوی، ئەمانە ئەو زانستە وردانەن کە تەنها لە خودایەکی زاناو بەئاگاوە ڕادەگەیەنرێن، جا ئەگەر ئەم ئایەتە بخوێنینەوە کە دەفەرموێت: [حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا] (یونس: ٢٤) تێدەگەین کە هەرکات فەرمانی خودا هات، دێت، جا شەو بێ یان ڕۆژ، هەردوو کاتەکەش لای خودا هەر یەکە، چونکە هەسارەی زەوی گۆییە و ئەوەش وای کردووە کە کات لای ئێمە شەو یان ڕۆژ بێت، بەڵام لە دەرەوەی هەسارەکەوە ئەگەر سەیری بکرێت ئەوا کات هەر کاتە و شەو و ڕۆژی نییە، دواجار مرۆڤ بەهۆی زانستەوە بۆی دەردەکەوێ کە هەموو ئایەتەکانی قورئان ڕاست و دروستن [سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ (٥٣) أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ (٥٤)] (فصلت:٥٣-٥٤)، لێرەوە تێدەگەین کە تێگەیشتن لە قورئان و واتاو دەلالەتەکانی پەیبردن بە ڕاستێتی پەیامەکەی و پەرچووەکانی بریتیە لەم دەربڕینە سەبارەت بە نەژادو یاسا گەردوونیەکان، ئەمەش لە هەموو ئەودۆخانەدا کەسنووری مەعریفەی مرۆڤایەتی تێیدایە، مانای بەردەوام پێداچووەنەوە و وردبوونەوە لە ئایەتەکان لەچوارچێوەی سنووری مەعریفی فراوانی مرۆڤدا بۆ پەیبردنی تەواو بە بەڵگەو دەلالەتەکانی وەحی و پشتیوانیکردنی و پەیڕەوکردنی بۆ درێژەدان بە کاروانی مرۆڤە لەسەر زەوی دا.

کەژاوەی شارستانێتی وبونیادنانی مرۆڤییانەی دەستبژێر و خواست و یستەکان؟ بایەخی گەورەی ئەم ئەزموونە، بەلای نووسەری ئەم کتێبەوە کە سەرەتای مژدەبەخشی دەرکەوتووە لە جۆرایەتی بەرهەمەکەی لەناو دەرچووانی ئەو زانکۆیەدا، وا دەرکەوت کە ئەزمونێکی زیندوی کردارییانەی سەرکەوتووانەیە، سەرلەنوێ دارِشتنەوەیەکی نوێی کرد بۆ پرِۆگرامی نوێی خوێندنی زانکۆیی و بەگەرِخستن و بەرجەستە کردنی سوودەکانی (پرِۆگرامگەرایی زانستیانەی ئیسلامیانەی گشتگیرانە) وە چالاکبوونی ئەم پرِۆگرام گەراییە بە چەمکی پسپۆرِیانەی ئاوێتە، بە تایبەتی لە زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەلاَیەتی و مرۆڤایەتیەکاندا، کە گەیاندیە ئەو ئاستەی توێژینەوە ئیسلامییە جەوهەریەکەی بابەتەکە یان کراوە بە پسپۆرِیەتیەکی سەرەکی یان دووەمی دوای سەرەکییەکە، دەتوانرێت دوای تێپەرِبوونی یەك سالْ (پسپۆرِیە دووەمیەکە) کە بریتین لە (ئیسلامییەکان- کۆمەلاَیەتییەکان- مرۆڤایەتییەکان) بگۆرِدرێن بۆ پسپۆرِییەتیەکی تر کە سەرەتا بەوە دەستکرا بەکاروانی کارکردن بۆ یەکخستنی سەرچاوەکانی مەعریفەی ئیسلامی، وە هێنانەدی تەواوکاری پرِۆگرامییانەی کرداری لەنێوانیاندا، وە بەدەستهێنانی سوودە داواکراوەکە لەسەر خواستی مرۆڤ خۆی بۆ مەعریفە گشتییە رِێنماکارییەکە، وە دووبارە بنیاتنانەوەی کۆمەلْگەیەکی شکۆمەند و پرِ لەتوانا و ئاشتی و دادپەروەری.

## پاشکۆ:

## شێوازێکی نوێ لە نەخشەی بەشی ناوخۆیی زانکۆ:

دەکرێ زانکۆ و پەیمانگا زانستیەکانی دیکە سوود لەو لێکۆڵینەوەیە ببینن کە سەبارەت بە چاککردنی شوێنی نیشتەجێی خوێندکارانی زانکۆ ئەنجامدرا بۆ بەدیهێنانی تایبەتمەندی خوێندکار لە شوێنی نیشتەجێبوونیدا وپڕکردنەوەی خواست و پێداویستیەکانی لە هۆگری کۆمەلآیەتی و پارێزبەندی ڕەوشتی بەبێ تێچوونی زیادە. لێکدانەوەی پێشوو ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چوار خوێندکار گونجاوترین ژمارەیە بۆ شوێنی نیشتەجێی خوێندکار کە ژینگەیەکی تەندروست بەدی بهێنێت بۆ کارلێکی کۆمەلآیەتی وە یارمەتیدەر بێ بۆ پارێزبەندی ڕەوشتیی، لێرەدا پێویستە بزانین چۆن تایبەتمەندی هەموو خوێندکارێك بپارێزین و فەراهەمی بکەین لە کاتێکدا ئەو کەسە هاوڕێی سێ خوێندکاری دیکەیە؟ وەك هەوڵێك بۆ نەهێشتنی هۆکارەکانی ناکۆکی و دووبەرەکی کە هۆکارەکەی شوێنە نیشتەجێ هاوبەشە باوەکانی خوێندکارانە.

توانراوە تایبەتمەندی تاکایەتی و کۆمەلآیەتی لە ژوورێکدا و لەیەك کاتدا بەدی بهێنرێ ئەویش بە گۆڕانکاریەکی زۆر بچووك لە ڕێکخستنی ژوورەکاندا، کە توانراوە چوار ڕووبەری سەربەخۆ لەچوارچێوەی ژوورێکدا دەستەبەر بکرێ، هەر ڕووبەرێکیان سەرجەم پێداویستیەکانی خوێندکار لەخۆبگرێ و ئازادی تەواوی هەبێ لە هەڵس و کەوت و بەکارهێنانی ژوورەکەدا بەشێوەیەك هیچ کەس ناکۆك نەبێ لەگەڵیدا یان لەبەکارهێنانیدا لەهەرکاتێکی شەو یان ڕۆژدا، بەلآم هیچ کام لەو چوار خوێندکارە ناتوانێ

ڕووبەرەکەی تایبەت بەخۆی لەو چوار ڕووبەرە دابخات بەڕووی سێ خوێندکارە نیشتەجێکەی دیکەی ئەو ژوورەدا، ئەمەش ئاسانکاری دەکات بۆ کارلێکی کۆمەڵایەتی و گەشەپێدانی پەیوەندی هاوڕێیەتی و برایەتی و پێکەوە ژیان و پشتگیری لەنێوانیاندا، هەروەها هۆکاری دووبەرەکی و بەریەك کەوتنی نەرێنی لەنێوانیاندا کەم دەکاتەوە، هەموو ئەمانە بەبێ هیچ زیادکردنێك لە قەبارەی ژوورەکەدا بەدی هێنراون.

بۆ ئەوەی ئەم کارە بەدی بێت، پێویستە ژوورێکی لاکێشە بهێنینە پێش چاوی خۆمان کە دابەشکراوە بۆ چوار بەشی یەکسان، دووان لەو چوار ڕووبەرە لەباری درێژی دروستکراون بۆ ئەوەی بوار بۆ دوو ڕووبەرەکەی دیکە بڕخسێنێ پەنجەرەیان هەبێ و بڕوانێ بەسەر بۆشاییەکی فراوان و کراوەدا.

بەمەش ئەوەی بچێتە ژوورەکە چوار ڕووبەر دێتە پێش چاوی هەر ڕووبەرێکیش سیسەمێکی تێدایە لەتەنیشتیەوە کەنتۆری جلی خوێندکارەکە، وە لەتەنیشت پەنجەرەکەوە کورسی و مێزی خوێندنی خوێندکار دادەنرێ، ئەم ڕێکخستنەش –وەك لە وێنەی هاوپێچدا دەیبینین– بۆ هەموو خوێندکارێك یەکەیکی تایبەت بەخۆی دەستەبەر دەکات کە بە ویستی خۆی هەڵس و کەوت لە چوارچێوەی بەکارهێنانی تایبەتیدا بکات هەر کاتێك بیەوێ شەو بێ یان ڕۆژ، بەبێ ئەوەی لەهەموو کاروبارە تایبەتیەکانیدا هیچ کام لە هاوڕێکانی دیکەی نیشتەجێی ژوورەکەی بێزار بکات، بەمەش تایبەتمەندی خوێندکارەکە هاتەدی بە دروستکردنی یەکەی سەربەخۆ، لە هەمان کاتدا پێکەوەژیانی بەکۆمەڵ بەدی هات" چونکە هیچ کام لە یەکەکان دەرگایان بۆ نەکراوە کە جیایان بکاتەوە لە خوێندکارە نیشتەجێکانی

دیکەی ژوورەکە و ببێتە هۆی لاوازکردنی گیانی هاریکاری و پشتیوانی و پێکەوە ژیان بە هۆی ئەوەی هاوبەشن لە شوێنی نیشتەجێ لە یەك ژووردا.

بەم گۆڕانکاریە سادەیە لە نەخشەی ژوورەکەدا لەیەك کاتدا سەربەخۆیی و تایبەتمەندی بۆ هەموو خوێندکارێك بەدی هێنا، لەگەڵ ئەوەی تەواوی پێداویستی لە بەکارهێنانی شوێنە نیشتەجێ تایبەتەکەی بێئەوەی لە هاوڕێەتی و تێکەڵاوی سێ خوێندکارەکەی دیکەی نیشتەجێی ژوورەکە بێبەش بێت. ڕەنگە وێنەی ئەم ژوورە شێواز و نەخشەی دروستبوون و تایبەتمەندیە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکەی کە بەدوای خۆیدا دێنێت ڕوون بکاتەوە، کە بەهۆی ئەو نەخشەیەوە ئامانج لە بەدیهێنانیدا بەدەست هاتووە.

لێرەوە ئامۆژگاری پەروەردەکاران دەکەین کە سەرنجی نەخشەی تەلارسازی زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزی بدەن بەمەبەستی ئاشنابوون بەو سوودەی کە ئەو تەلارە ئیسلامیە بەدی هێناوە لە توانا و جوانی لە چەندین ڕووەوە کە بێ هاوتایە لە ڕووی توانا و ئاسانی بەکارهێنان و بەدی هێنانی تایبەتمەندیە ئیسلامیەکانەوە بەتایبەت لەڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پاك و خاوێنی و دەست نوێژەوە.




**نەخشەی نهۆمێك لە شوێنی مانەوەی خوێندکارانی قۆناغی زانکۆیی**

**لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیا**

# دۆزی سێیەم

# یاسای دەوڵەتی مەدەنی ئیسلامی و
# گرفتی دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی لە هزر و
# مێژووی سیاسیی ئیسلامییدا

## چەمکی ئوممەتی بانگەوازی قورئانی:

قورئانی پیرۆز کۆمەڵە چەمکێکی خستووەتە روو، کە پێویستە سیستم و دەستگا کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئاراستەکردنی مرۆڤایەتی لەسەریان بنیات بنرێن، بەڵام شێوەی راپەڕاندنیان و هۆکارە گۆڕاو و گەشەکردووەکانیانی داوەتە دەست مرۆڤەکان خۆیان بەپێی پێویستی سەردەم و فراوانبوونی زانست و تێگەیشتن و پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و ئەو گۆڕانکاری و بەرەوپێشچوون و توانایەی کە بەدەستیان دەهێنن. دیارترین چەمکێك کە درەنگانێك بیرمەندە موسڵمانەکان وەك دامەزراوەیەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی گرنگ لێی بەئاگا هاتنەوە، (نەك تەنها دامەزراوەیەکی راوێژکاریی یان خۆبەرەوەبەر بۆ لای دەسەڵاتدار، کە پێشتر ئەم چەمکە پشتگوێخرابوو، وەك دامەزراوەیەکی سەرەکی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی دانەڕێژرابوو)، ئەو دامەزراوەیەش دامەزراوەی شوورا(راوێژ)ە، کە چەمکی پرسوڕا لە واقیعی سیستمی سیاسیی ئیسلامییدا بەرجەستە بکات و بەگەڕ بخات.

## بونیادنانی دامەزراوەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پاش سەردەمی پێغەمبەرایەتی:

بۆیە سەرنجی موسڵمان رادەکێشین بۆ دووبارە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، تا کۆمەڵە چەمکێکی دیکە کە لە قورئاندا هاتوون و پێویستن بۆ بنیاتنانی دامەزراوەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی ئیسلامیی هاوچەرخ بەشێوەیەکی کاراو دروست سەرلەنوێ هەڵێنجن کە بەداخەوە بیرمەندە موسڵمانەکان بەشێوەیەکی تێروتەسەل تا ئەمڕۆش بیریان نەکەوتووەتەوە.

هۆیەکەشی تا ئەندازەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆڵە جیاجیانەی پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا بینیونی وەك: پەیامبەرێکی موبەللیغی خاوەن سرووش، بانگخواز، مامۆستا، سەرۆکی وڵات، دامەزرێنەری کۆمەڵگە، ئەمانە کۆمەڵێك (ڕۆڵ) بوون، کە دەبوو موسڵمانان پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ لە یەکدییان جیاکردبایەوە، بۆ نموونە ڕۆڵی پێغەمبەرایەتی و پەیامگەیاندن بە کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ کۆتایی هات، بەڵام سۆفی و شیعەکان بە باسی کەراماتی شێخ و پیاوچاك و بێگوناهی ئیمامەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان کاریان لەسەر بەردەوامیی ئەم ڕۆڵە کردووە، هەروەها دەبوو پاش کۆچی دوایی ڕۆڵی پێغەمبەر ﷺ وەك مامۆستا و بانگخوازێك جیاکرابایەوە، لە ڕۆڵی سەرۆکی حکومەت و ئەو نوێنەرایەتیکردنە کە دەکرێت سەرۆکی حکوومەتان و حیزبەکانن بیگێڕن لە گۆڕانکاریی پلان و بەرنامە سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا، ئەم جیاکردنەوەیەش بۆ ئەوەیە بەرژەوەندیی گشتیی میللەت پێشێل نەکرێت و ئایین و پیرۆزییەکانی بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکان بەکارنەهێنرێن، کە بێگومان (ئەگەر ئەرکی بانگەواز و پەروەردە لە ئەرکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن جیانەکرێنەوە) مێژوو سەلماندوویەتی ئایین و پیرۆزییەکانی سیاسییانە دەخرێنە خزمەت دەسەڵاتداران و بەرژەوەندییەکانیانەوە، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی دیکتاتۆرییەت و پاشانیش بڵاوبوونەوەی گەندەڵی، چونکە مرۆڤەکان بە سروشتی خۆیان لاوازیی روویان تێدەکات، هەرگیز ناگەنە پاکێتی پێغەمبەران.

## هۆکارەکانی بەهێزبوونی دوانەی گرێدراوی: دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی:

گرنگـە بـزانین دیکتاتۆرییـەت و گەنـدەڵی پێکـەوە بەنـدن، زۆرجـاریش بـە بیانووی پووچەڵ و چاوەڕاوکردن دیکتاتۆران دزە دەکەن و دەگەنـە دەسـەڵات، دەسپێچی گرنگیش کە کاری دیکتارتۆرییەت ئاسان دەکات بـۆ شـەرعیەتدان بـە تۆقانـدن لــە بڕیـار و کاروبارەکانیـدا: کەمهۆشـیاریی جـەماوەر و ئاسـتنزمیی ڕۆشـنبیریی و بێئەزموونیـەتی، هــەروەها نــەبوونی دەزگــای پــەروەردەیی و ڕاگەیاندنەکان کە پاسـەوان و پـارێزەری میللەتن.ئەمـەش میللـەت دەخاتـە نـاو بازنەیەکی داخراو و خولانەوەیەکی پڕوکێنەرەوە، واتە: لە کەمهۆشـیارییەوە بـۆ دیکتاتۆریـەتی دەسـەڵاتە ملـهوڕەکان و بەرژەوەندییـە تایبەتـە گەندەڵـەکان، بەمشـێوەیە گەنـدەڵی چـەقۆی دیکتاتۆریـەت و خۆسـەپاندن و ملـهوڕی قـووڵتر دەکاتـەوە لەسـەر گـەردن و تواناکـانی میللـەت، ئـەو خۆسـەپاندنەش دەگاتـە ئاستێك دەروونی میللەت تێکبشکێنێت و ڕۆشنبیری نزمتر بکاتـەوە و هۆشـیاری لاوازتـر بکـات، جـا بـەو شـێوەیە خولانـەوە لـە نـاو بازنـە داخراوەکـەدا کـە لـە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، بەردەوام دەبێت. کەواتە گـەلان بـۆ سیسـتمی ژیانیـان و پێشخستنی ژیاریان پێویستیان بە بنیاتنـانی کۆمـەڵێك دامـەزراوە دەبێـت بـۆ هۆشیارکردنەوەی میللەت و ڕێگرتن لە خۆسەپاندن و دیکتاتۆریـەت و گەنـدەڵی دەسەڵاتداران و دارودەستەکانیان، تا وەك پەککەوتـە و بیرکـۆڵ مامەڵـە لەگـەڵ میللەتاندا نەکەن و خۆیان لە یەککاتدا داواکار و دادوەریش بن. بە دڵنیاییشـەوە بەبێ هۆشیاری جەماوەر دیکتاتۆریەت و گەندەڵی قەڵاچۆ نـاکرێن، بـەڵکو تـەنها بــە هۆشــیاربوونەوەی میللــەت و ڕێکخســتنی ریزەکــانی و بــوێریی لاوانــی، دیکتاتۆریـەت و گەنـدەڵی رادەماڵرێـت، میللـەتیش ئـەو وزە زۆرەی بەخشـینە و ئەو هاوکێشەی هێز و بەرژەوەندییانەی لەناو کۆمەڵگەوە بەدەست دێنێت.

## ڕێگاکانی لەناوبردنی دوانەی دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی:

جا بۆ ئەوەی هاوجووتەی دیکتاتۆریەت و گەندەڵی بە هۆشیارکردنەوەی میللـەت و کادرەکـانی رابمالرێـت، پێویسـتە بایـەخ بـە خێـزان و ئـەدەبیاتی پـەرورەدەی بـاوك و دایـك بـدرێت، لەبـەر ئـەو رۆڵـە گرنگـەی کـە لـە نـاخی نەوەکانیانـدا هەیانـە، هـەروەها پێویستیشـە رۆڵـی پـەروەردە و فێرکـردن و بانگـەواز، بـە سـەربەخۆیی بهێڵرێتـەوە، دەزگایـەك یـان چـەند دەزگایـەکی سـەربەخۆ و تایبـەتیان بـۆ دابمـەزرێن، کـە راسـتەوخۆ لەلایـەن میللەتـەوە هەڵسوڕێنرێن و رۆڵیان لـە پێگەیانـدنی کەسـایەتی و نـاخی تـاکی موسـڵمان هـەبێت و کـەلتووری مرۆڤـەکان پاڵفتـە بکاتـەوە، ئائەمـە رێگـای کردەیـی راستەقینەی هۆشیارکردنەوەی هاوولاتیان و بوارپێدانیانە بۆ ئاراستەکردن و چاودێریکردنی رۆڵی دەسەلات.

جا لە سۆنگەی هۆشیاریی هاوولاتی و پەروەردەکردنیانەوە رۆڵی ئایین و بـەهاکان دێنـە گـۆڕێ لـە ئاڕاسـتەکردنی دەسـەلاتدا، ئـیتر حکومـەت بـە سەپاندنی دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی، میللەتی پـێ فریـو نادرێـت، بەمشـێوە سیسـتمی میللـەت دەپـارێزرێن و لەگەڵیشـیدا مـاف و بەرژەوەنـدی و داهاتەکانیش لە فەوتان و بێسەروبەریی دەپارێزرێن. داهات و وزەکانیش لـە پێویسـتییەکانی میللـەت و گەشـەپێدانی تواناکـانی و دۆزینـەوە و بەگەڕخستنی وزەی پەنهانی ڕۆڵەکانی میللەتدا ئاڕاسـتە دەکـرێن، بەوشـێوە میللـەتی موسـڵمان دەبێتـە ئاڕاسـتەکار و چـاودێر لەسـەر دەسـەلاتداران و بەرنامە سیاسییەکانیان، نەك بە پێچەوانەوە.

## کات و شوێن لەنێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا:

ئالێرەوە چەقبەستنێکی ڕێژەیی و بەرەوپێشنەچوونی ژیانی خەڵکی لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەدی دەکەین، هۆیەکەشی سروشتی سەردەمەکە و دوورخستنەوەی کاریگەریی زانایان و بیرمەندان بوو لە ژیانی گشتیی میللەتدا لە لایەن سەرانی دەسەڵاتەوە، ئەمەش بووە هۆی لاوازبوونی رۆڵ و جووڵەی زانایان و پاشانیش کزبوونی بازنەی زانست و مەعریفە، ئینجا کزبوونی رۆڵیان لە هۆشیارکردنەوەی میللەتدا لە کاروباری گشتیی ژیانیان و کاروباری بنیاتنان و پێشخستنی دەزگاکانیدا، ئەمەش کارێکی کرد کە بیرمەند و زانایان بە کردەیی تەنها خۆ بە هەندێك سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ ببەستنەوە، کە کۆی سوننەتی پێغەمبەر رێکخستنی ژیان و کاروباری دەسەڵات و بەڕێوەبردنی کاری سیاسیی میللەت لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا لەخۆ دەگرێت، بەڵام ئەوان خۆیان لە پەنای سوننەت و هەندێك پیرۆزیدا، بەتایبەت سوننەتە کەسێتییەکان، گیر کرد، بێگوێدانە ئەو گۆڕانکارییانەی پاش سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەسەر دوورگەی عەرەبی و وڵاتدا هات لە هەموو ڕوویەکەوە.

کەچی گرنگییدان و خۆبەستنەوە و هەڵێنجانیان لە قورئانی پیرۆز کەمکردەوە، لەگەڵ ئەوەی قورئان تایبەتمەندی ئەوەی هەیە کە ڕەهەند و چەمکەکانی نەبەستراون بە هیچ سەردەم و جێگایەکەوە، بەمەش بوار دەڕەخسێنێت کە هاوشانی گۆڕانکاری هەموو سەردەم و شوێنەکان هەنگاو بنرێت و پێداچوونەوەی بەرەوپێشەوە چوونەکانی ژیان بکرێت، بەو

شـێوەیەی کـە ئامانجـەکانی پـەیامی خـوایی بێتـە دی بـە پێـی بـارودۆخ و گۆڕانکارییەکانی هەموو سەردەم و شوێنەکان.

لەم سۆنگەوە سەرنج بۆ دوو ئایەتی پیرۆز رادەکێشین، کە بەشـێوەیەکی تایبەت پەیوەندن بە چەمکی بانگەواز و فێرکردنی ئایینەوە و باوەڕمان وایـە پێویست دەکەن کە کاروباری بانگەواز و فێرکردنی ئایینی بدرێتە دەزگایەکی کۆمەڵایەتی پەروەردەیی گرنگ، کە دەبوو میللـەت هـەر لـە سـەرەتاوە ئـەم دەزگایەی بە سەربەخۆیی دامەزراندایە و زەمانەتی سەربەخۆبوونیشی دابین بکردایە، ئەم دەزگایە لە کۆنیدا هاوشانی دەزگای دەستووردانان و دەزگـای راوێژی سیاسیی و چاودێری و یاسادانان بوایە، تەنانەت لەگەڵ دەزگای قەزا و هەر دەزگایەکی دیکەی بنەڕەتی کۆمەڵایـەتی هاوکـات بوایـە، ئەمـەش بـۆ ئـــەوەی ئـــەو دەزگـــای فێرکـــردن و پـــەروەردە ئایینییـــە بتوانێـــت رۆڵـــی دامەزرێنەرانە و کـارای خـۆی ببینێـت، لەوانـەش دەزگـای خێـزان و بـاوك و دایك، لە سەرخستنی بانگـەواز و هۆشـیارکردنەوە و پـەروەردە و فێرکردنـی ئایینی و هۆکارەکانیان بەدەست بخات، بە دوور لە خۆرەی ناشـیرینکردن و پەراوێزخستن یان قۆستنەوە و خراپبەکارهێنانی ئایین، بە هـەر شـێوە و لـە هەر بەرگێکدا بن، جارێك بە گۆشەگیرکردن و پەراوێزخستن بـەوەی چـەمکی ئایین و بانگەواز و فێرکردن بکرێنە چەند دروشمێکی بۆش و بەتاڵ و هەندێك ئاهـــەنگ و مەولوودنامـــەگێڕان، یـــان فـــەتوا دەرکـــردن بـــۆ پشـــتیوانیی دەســـەڵاتداران و ململانـــێ سیاســـییەکانیان، جـــارێکیتر بـــە شـــێواندن و خراپبەکارهێنانی بانگەواز، ئەویش بە قۆستنەوەی ئایین و پیرۆزییەکانی لـە لایـەن دەسـەڵاتدار و سیاسـیی و خـاوەن بەرژەوەندییەکانـەوە کـە پیرۆزیـی

ئایین دەکەنە داردەست بۆ بڵاوکردنـەوەی تـرس و تۆقانـدن و دەمبەسـت و گزیکـردن لـە جـەماوەر، لـە پێنـاو خزمـەتکردنی دەسـەڵات و سیاسـەت و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان. دوو ئایەتە پیرۆزەکەش کە دەبێت لـە ژیـانی سیاسیی و کۆمەڵایەتی ئیسلامییدا لێیان تێبگەین، یەکەمیان: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران: ١٠٤). دووهەمیشیان ئایـەتی: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبة: ١٢٢).

وشەی (أمة) لێرەدا بە مانای (تاقم) (کۆمەڵ) یان بە زمانی ئەم سەردەمە بە مانای دەستە یان دەزگای سەربەخۆ دێت، کە میللەت سەرکردایەتییەکەی هەڵدەبژێرێت تا ببێتە دەزگایەك جگە لە ئەرکی سەرشانی چاوپۆشی لە هیچ شـتێکیش نـەکات، نـە دەسـەڵات نـە کاریگـەریی بەرژووەندییـەکان نـە هـیچ ئیعتبـارێکی دیکـە، مەگـەر کاتێـك میللـەت متمانـەیان پـێ ببەخشـێت یـان پشتیوانیان لێ بکات و بڕوای بە راپەڕاندنی کارەکانیانی هەبێت.

## پێویستی وردبوونەوە لە چەمکە قورئانییەکان:

هەروەها پێمانخۆشە سەرنجی خوێنەر بۆ ئـەوە راکێشـین جگـە لـەم دوو ئایەتـە، ئایەتگـەلێکی دیکـەی قورئـانی هـەن، ئەوانـەیان لێـرەدا گرنگـە ئاماژەیان پێبکرێت، دوو بڕگەی قورئانییـە، کـە پەیوەسـتن بـە دەزگایـەکی کۆمەڵایەتی بایەخدارەوە، ئەویش دەزگای خێزانە، ئەم دوو بڕگـە قورئانییـە حەقە زیاتر لێکۆڵینەوەی زانستی کۆمەڵایەتییان لەسەر بکرێـت و گرنگییـان

پێبدرێت، تا ببنه بناغەی دارشتنی یاساکانی خێزان، لێکۆڵینەوەکەش لەبەر ڕۆشنایی بەرەوپێشچوونی سەردەم و توانای لابردنی لەمپەرەکانی سەر ڕێگا، هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو برگە قورئانییانەوە چاوێك بخشێنێتەوە بە کەلەپورماندا کە بە هۆی گۆڕانی بارودۆخ و پێویستی و تواناکانی ئەمڕۆوە، ئەو کەلەپورە نابێت بە ئامانج گەیشتنی ئەو چەمکە قورئانییانە، بۆیە ئەوە دەخوازین کە لەمڕۆژەدا شێوە جێبەجێکردنی ئەو تێگەیشتن و کردەوە و هەڵس و کەوتە باوانەی کە تا ئەمڕۆش کاریان پێ دەکرێ هەموار بکرێن، سەبارەت بە یاسای خێزانی موسڵمان بەشێوەیەکی کارا و راستەقینە چەمکە قورئانیەکان و مەبەست و ئامانجەکانیان جێبەجێ بکرێن دەربارەی پەیوەندی خێزان و پاراستنی ئاکارە تایبەت و جیاوازە خۆماکەکانی، ئەو دوو چەمکە قورئانییەش (إمساك بمعروف) أو (تسريح بإحسان) خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ) (الطلاق: ٢)، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: (الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْروفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسانٍ) (البقرة: ٢٢٩) [١]

---

[١] لێرەدا پێدەچێت گرنگ بێت ئاماژەیەك بدەین بە خەمساردی سەبارەت بە خێزان و لێکترازانی کە بۆتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی جیابوونەوە بەشێوەیەکی مەترسیدار لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا بەجۆرێك خەریکە یەکسان بێ لەگەڵ ڕێژەی جیابوونەوە لە دەوڵەتە مادییەکان کە دامەزراوەی خێزن تیایاندا لەبەریەك هەڵوەشاو و داخوراوە، وە بەهێزترین –نەك گرنگترین– ڕێگاچارە کە یارمەتی دەرە بۆ کەمکردنەوە و سوککردنی ئەم قەیرانە، لایەنی پەروەردەیی و لایەنی فێرکردن و لایەنی ئابوری وەك ئەوەی لایەنی گرنگ بن لە دروستبوونی ئەم قەیرانەدا، ئەم لایەنەش بریتیە لە جیابوونەوەی ژن و مێرد تەنها لەبەر وتن و دەربڕین وتنی وشەی (تەلاق)... لەم بارەیەوە زانایان ڕا و بۆچوونی جیاوازیان هەیە، بە نموونە ڕادۆزی و

## خێلآیەتی و دارِمانی جێنشینی سەرداران (الخلافة الراشدة):

جا هەرچەندە بەشێك لە زانایانی پێشین درکیان کردووە بە چەمکی (با بە کەمێکیش بێت) ئەو رۆڵە جیایانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا گێڕابوونی، بەتایبەتی جیاوازی نێوان رۆڵی پێغەمبەرێتی و گەیاندنی لەگەڵ رۆڵی فەرمانڕەوایی، بەڵام جیاوازی نێوان پێغەمبەری موبەلليغيان لەگەڵ پێغەمبەری بانگخواز و مامۆستا لا روون نەبووە، ئیتر بە هۆی کۆمەڵە رووداوێکی خێرا و کەڵەپووری کەڵەکە بوو بەرژەوەندیگەلێکی رێگەپێنەگیرا، هەروەها بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر سیستمی کۆمەڵایەتی و سیاسیی پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لە چەرخی یەکەمدا هات، پاشان کارەساتەکانی رووخانی سیستمی خیلافەت و زاڵبوونی چەمکی هۆز و بنەماڵەچێتی بەسەر سیستمی دەوڵەتدا، دوایيش

---

بۆچوونەکانی جێنشینی پێشەنگ (عومەری کوڕی خەتتاب) و ڕادۆزی و بۆچوونەکانی پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی تەیمیە)، چونکە خودی وشەی (تەڵاق) پیرۆز نیە بەڵام مەبەست لێی جەختکردنەوەی نیاز و مەبەستە لە جیابوونەوە و هیچی تر.

من وای دەبینم تەڵاق پێویستە لە ڕووی شەرعەوە نەکەوێ، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێ کە لەبەردەمی دادوەردا ڕوو بدات وە بە ئامادەبوونی ژن یان بریکارەکەی، ئەویش بۆ ئەوەی کاتێکی زیاتر هەبێ بۆ لێکدانەوە و بیرکردنەوە و وتوێژ بەپێی توانا، بە هۆی ئەوەی جیابوونەوە کارەساتی خێزانی بەدوای خۆیدا دێنێ بەتایبەت ئەگەر ژن و مێردەکە کوڕ یان کچیان هەبێ خۆ ئەگەر منداڵ بن ئەوا زۆر سەختتر و دژوار ترە، وە بۆ ئەوەی ژن توشی گرفت نەبێ کاتێ تەڵاق ئەدرێ بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، وە ڕەنگە مافەکانی بخورێن، وە ماف و پیرۆزیەکانی پێشێل بکرێن لەلایەن هەندێك مێردی گەوجەوە، بەم شێوەیە هەرچەندە مێردەکە وشەی تەڵاق بڵێت بەڵام تەڵاقەکە ناکەوێ نە لە ڕووی دین و شەرعەوە نە لەڕووی بەرپرسیارێتی مادی و مەعنەوییەوە، تەنها مەگەر لەبەردەم دادوەری پسپۆڕدا بێت.

تێکەڵبوونی کەلتووری ئەو وڵات و نەتەوە نوێیانەی کە موسڵمان دەبوون و زاڵبوونی ستەم و گەندەڵی دەسەڵاتداران و بەرژەوەندیی خۆیان و دارودەستەیان، لە پاڵ ئەمانەشدا بەرکەنارخستنی زانایانی قوتابخانەی مەدینە و رێگەپێنەدانیان بە بینینی رۆڵی سەرکردایەتیکردن، بەڵکو ئاراستەکردنیان تا ببنە مامۆستای وانەبێژ و ئەکادیمی و پاڵپشت بۆ ئەمیر و موچەخۆرەکانیان، تا گەیشتە پێگەیاندنی تاقمێك کە بەرژەوەندییان بە بەرژەوەندی تاقمە سیاسییە دەسەڵاتدارەکەوە ببەسترێتەوە، تا گەیشتە ئەوەی ئایین و ئامانجەکانی ئایین لە ژیانی سیاسیی بپچڕێنرێت.

هەموو ئەمانە لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە ماوەیەکی دوورودرێژ گۆڕانکاری ریشەیی ئەوتۆ بەسەر سروشتی رۆژگارەکەدا نەدەهات لە رووی ئاوەدانکردنەوە و ئابوورییەوە، هەموو ئەمانە بەشداربوون لەوەی تاقمە سیاسییەکە و داروەدەستەیان با ئامانجی سنووربەندکردنی بیری زانا و بیرمەندەکان بگەن، بەوەی حەزیان لە لاسایی و دواکەوتن بێت و رۆڵ و بیرکردنەوەیان لە قاڵب بدرێت و لە زۆربەی کاروباردا (لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسمانکرد) ئەو زانا و بیرمەندانە ناچاربوون تەسلیم بە ئەمری واقیع ببن، تەنها سەرنجی پرۆسەی جێبەجێکردنی شەریعەت بدەن لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا و سەرنجی ئەو ئاراستانە بدەن کە لە کاتی چەسپاندنیدا بەسەر دۆخی کۆمەڵگەی سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا دەچەسپا، بۆیە زۆر لەو زانایانە پابەندبوون بە رووکاری دەقەکانەوە بەشێوەیەکی بەشەکی (جوزئی) و بژاردەیی (انتقائي)، زیاتر لە پشتبەستن بە چەمکە گشتییەکانی شەریعەت و مانا و ئامانجە باڵاکانی کە پەیوەست بە هیچ سەردەم و شوێنێکەوە نین و

بەردەوام بە نوێگەریی و ئیجتیهادکردن پێش دەکەون، لە رێگەی بیری سیاسیی کۆمەڵایەتی زیندووی پێشکەوتووەوە، کە لەگەڵ ناوەرۆکی گۆڕانکارییە نوێیەکاندا بیگونجێنن، بە سوودوەرگرتن لەو حیکمەتە پابەندییەی پێغەمبەرایەتی کە چۆن بەپێی گونجان و حسابکردن بۆ چەمك و ئامانجی شەریعەت بەسەر قەومەکەیدا لەو سەردەم و جێگایەدا جێبەجێی دەکرد.

ئەم دیاردەیەش لە بیری ئیسلامییدا بە دیاردەی لاساییکردنەوە و داخستنی دەرگای ئیجتیهاد ناسرا، ئیتر لەو کاتەوە بیری ئایینی ئیسلامیی (جگە لە هەندێك هەوڵی بوێر و داهێنەرانە) بە شەکی و بژاردەیی و زیادەڕۆییکردن و قۆستنەوەی رووکاری دەق و کەلەپوور و خۆحەشاردان لە پەنای پیرۆزی دەقەکانەوە، بوون بە نەخش بۆی، بەمەش رۆڵی ئایین پەراوێزخراو بەکارهێنانی بۆ خزمەتکردنی تاقمە سیاسییەکە و ستەم و گەندەڵییەکانیان سەریگرت، چونکە دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی پێکەوە ئاڵاون، یەکتر موتوربە دەکەن، ئەم بازنە رووخێنەرە نەگبەتە لە ژیانی کۆمەڵگەدا ناشکێنرێت، مەگەر میللەت و گەلان بە هەوڵی دڵسۆزانەی بیریار و پەروەردکار و ریفۆرمخوازە بوێرەکان هۆشیار بکرێنەوە و رۆشنبیرییان پوخت بکرێتەوە و تێڕوانینی بوونەوەریی و شارستانییان نوێ بکرێتەوە و پەروەردەیەکی باشی نەوەکانی بکرێت و دەزگا سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان بنیات بنرێتەوە، دەسەڵات لە یاسا گشتیی و ئاڕاستەکانیدا بگەڕێتەوە بۆ دەستی زۆرینەی میللەت.

خۆ ئەم پرۆسەیەش بەبێ دەستپێشخەریی بیریار و پەروەردەکار و ریفۆرمخوازان، بەو شێوەیەی کە باسمانکرد، بەبێ ئەوانە هیچ بوار و ئومێدێك نییە بۆ هەستانەوەی میللەتو گەشەدان بە وزە و بەگەڕخستنی ئیرادەی ژیان و بینا و داهێنان تیایدا.

گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە سەرکەوتوویی سەردەمی دەسەڵاتی خەلیفە ئەبوبەکر و عومەر و سەرەتای سەردەمی خەلیفە عوسمانیش (خوا لێیان رازی بێت) هەرچەندە رۆڵی بانگەواز و پەروەردە و فێرکردن لە رۆڵی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی لەو سەردەمانەدا جودانەکرابوونەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتیی فەرمانڕەوایی و شێوەی دەسەڵات و پیاوانی بەڕێوەبەر هەر لە سەر ئەو حاڵەتە بوون کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا رێکخرابوو.

بەڵام پاش مردن و شەهیدبوونی زۆر لەو پیاو و هاوەڵانە و لاوازی و پیربوونی زۆری ئەوانەشی کەمابوونەوە، لەگەڵ گۆڕانی بارو گوزەران و خەڵکەکە و پاش فراوانبوونی سنووری دەوڵەت و بەرینبوونی فتووحاتی ئیسلامییو موسڵمانبوونی زۆر لە گەلانی دی، ئیتر دەبوو گۆڕانکاری و لە شێوەی سیستم و کەسایەتی و قۆناغەکانیشدا روو بدەن، چونکە پێغەمبەری خوا کە هەمیشە وەحیی پشتیوان بوو، حیکمەتی سەردەمەکەی پلەبەندییەکی تۆکمە بوو، بۆ چەمکەکانی قورئان و چەسپاندنی ئامانجەکانی، تا ببنە بەڵگە بە سەر خەڵکەوە کە ئەم قورئان و ئایینە رووناکی و رێنمایی ژیانی ئادەمیزادە و کاری خەیاڵ و ئەفسانە نییە.

بەو جۆرە دەبوو پاش کۆچی دوایی پێغەمبەریش ﷺ حاڵی موسڵمانان ـ بەپێی توانا ـ هەر بەو شێوەیە بمایایەتەوە، بە سوودوەرگرتن لە ئایین و

بنەماکانی، هەروەها سوودبینین لە بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ لە بەڕێوەبردنی دەسەلاّتدا، لە پلەبەندکردنی دید و بەها و بنەما ئایینییەکان و جێبەجێکردنی مەرام و ئامانجەکانیان بەسەر هەموو میللەت و سەردەمەکاندا، لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا تا ئەوەی دەتوانن پێوەی پابەند بن (وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ) (المطففين: ٢٦).

لەوەی رابورد دەردەکەوێت کە مەرج نییە سەردەمی پێغەمبەرایەتی بەردەوامبێت یان رێکخستنە رووکاریەکانی بەردەوامبێت، مەگەر ئەوانە نەبێت کە میللەت و بیریار و رابەرانی بە گونجاوی بزانن، کە هێشتا لە باریدایە ئامانج و بەرژەوەندییە ئایینییەکان بەدیبێنێت، بەڵکو لەسەریانە شتانێك دابهێنن کە پێویستیانە، ئەگەر وانەکرێت ئەوە دەگەیەنێت کە سەردەمی پێغەمبەرایەتی و پەیامە ئیسلامییەکەی داهێنانێکی مرۆیی بووە و مەرامی خۆی بەجێگەیاندووە و کۆتایی پێهات، لەگەڵیشیدا ئەرکە شارستانییەکەی بە گۆڕانی حاڵ و بەرەوپێشچوونی توانا و پێویستییەکان کۆتایی هات.

ئالێرەوە بەهۆی کۆمەڵێك رووداو و گۆڕانکارییەوە کە تەواو نەکران و بەخێرایی تێپەڕین، هەروەها بە هۆی تەسکیی ژینگەکە لە رووی مادديی و شارستانییەتەوە و ئامادەکاریی نەکردن بۆیان، دەڵێین هەردەبوو بە وەفاتی زۆرینەی هاوەڵان و نزیکبوونەوەی تەواوبوونی سەردەمی خیلافەتی راشیدە، هەندێك شوێنەواری سەلبی لە حاڵی دەسەلاّت و دەوڵەتدا دەرکەوتایە، پاش تەواوبوونی سەردەمی دەسەلاّتی پیاوانی دەوڵەتی پێغەمبەر، کە بە رووداني

کارەساتی ناخۆش کۆتاییان هات، بـەوەش سـەردەمی خیلافـەتی راشـیدە و سەردەمی بەرەی هاوەڵان و دەوڵەتەکەیان تەواو بوو.

ئـیتر لـە دوای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئەمەوییـەوە بـە درێـژایی مێـژووی ئیسـلامیی (بەدەگمـەن نـەبێت) (هەرچـەندە جـەختیان لەسـەر زەرورەتـی پابەندبوونی دەقاودەق و دەستگرتن بە هەنگاو هەنگاوی سەردەمی یەکەمی ئیسـلامیی دەکـردەوە)، بـەڵام مامەڵـەی عەشـیرەتگەریی و بنەماڵەچـێتی و ئەتنی، تەشـەنەی کـرد و زاڵبـوو، ئـیتر دەسـەڵات و حـوکمی خۆسـەپێن لـە سیستمی حکومەتە یەك لە دوایەکەکانی میللەتی ئیسلامییدا خـۆی سـەپاند، بەو گەندەڵی و سـتەمانەی کـە لـە خۆیـانی گرتبـوو، ئەمـەش بـووە بنـەمای گشتیی و شتەکانی دیکە بوونە شاز و حاڵەتی تایبەت.

### زیندووکردنەوەی بیری ڕادۆزی (الاجتهاد) و لەمپەرەکانی سەردەم:

بۆیە لەم سەردەمەی کە تیایدا دەژین، کە لە زۆر رووەوە لە چەرخەکانی رابـردووەوە دوورە، بەتایبـەت لەگـەڵ گەشەسـەندنی ئـەو شـاڵاوە هزرییـە رۆژئاواییە لە رێگەی کەناڵە ئاسمانییەکان و ئینتەرنێت و دەسەڵاتی زانستی و تەکنـەلۆژی و ئـابووری و سیاسـییەوە دەیکـەن و ئـەو کاریگەرییـە نێگەتیڤەی کردوویەتی لەسەر میللەتانی ئیسلامیی، بەتایبـەتی لاوەکانمـان، هەموو ئەوانە دەیسەلمێنن پێویسـتە پێداچـوونەوەی ریشـەیی بکرێتـەوە لـە گوتـاری هـزری هاوچـەرخی ئیسـلامییدا بـە گشـتیی، بەتایبـەت لایەنـە سیاسییەکەی، کە لە سایەی ئەو لادان و مامەڵە و فشارانەدا درووسـتبوون و گەشەیان سەند و بە ئاگایی یـان بێئاگـایی پێگەیشـتنو بـە کـرداری لەگـەڵ

میللەتدا ژیان، بەمەرجێك پێداچوونەوەكە لە بازنەی پێداچوونەوەیەكی گشتیی و سەرتاسەریدا بێت بۆ هەموو مەسەلەیەكی پەیوەست بە تێڕوانینی شارستانی و رابردووی میللەت و رێبازە كۆنە میراتییەكانی یاسا دارشتن، ئەمانەش بە تێگەیشتن لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی و رۆڵ و مانا مرۆییەكانی، بە گەڕانەوە بۆ سۆنگەی چەمكە قورئانییەكان و ئامانجەكانی، بە هۆشیارییەكی ئایینی زانستیی كۆمەڵایەتیی ئاوەدانخوازییەوە.

ئەمەش بۆ ئەوەی بیر و بەرنامە دارشتن و سیستمی میللەت پێ بەپێی پێشكەوتنی شارستانییەتی مرۆڤایەتی و دەسەڵاتی زەبەلاحی تەكنەلۆژیا هەنگاو هەڵنێن، بەو شێوەیەش مەسەلە چەسپاوە ئیسلامییەكان بە بیرێكی زیندوو و رۆشنی ئیجتهادی دیاری دەكرێت و ئامانجەكانیان روون دەكرێتەوە و تازەگەریی لە گوتاریاندا دەكرێت، تا دۆودۆشاو تێكەڵ نەكرێت و بنەڕەتی و لاوەكی و چەسپاو و نەچەسپاوە ئیسلامییەكان لێكنەئاڵێنرێن.

وە بۆ ئەوەی گوتار و یاسا و رێكخستنەكان لەسەر بار و شێوەیەك نەمێننەوە كە لەگەڵ واقیعی دۆخی ئوممەت و سەردەمدا نەگونجێن، وە لەپێناوی ئەوەی گوتار و یاسا و رێكخستنەكان هەمیشە ـ لە كۆمەڵگەی موسوڵماندا ـ مەبەستە قورئانیە رێنوێنیكەر و سروشتە خۆماكەكانی بەدی بێن بە درێژایی كات و شوێنە جیاوازەكان.

## سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی ڕۆڵی ئاین
## لە دامەزراندنی نەتەوە و دەوڵەتدا:

لەم بارەوە گرنگە بزانین دامەزراوەکانی پەروەردەیی ئایینی و بانگخوازە ئایینییە ئیبراهیمییەکانی رابردوو کە لە پەرستگا و کەنیسەدا بوون، دەکرا کاریگەری و بەخشینیان چەند قات بوایە ئەگەر سروشتی سنووردارێتی کاتیی و شوێنیی ئەو ئایینانە نەبوایە، جگە لە دەستکاریی کران و لادان و تێکدانیان، کە ئیسلام تەنها بۆ راستکردنەوەی ئەو ئایینانە و نوێکردنەوە و گەڕاندنەوەی رۆڵی ئایین بۆ رێنماییکردنی مرۆڤایەتی هات، تا شانبەشانی دۆخی مرۆڤایەتی لە چەرخەکانی ئایندەدا هەنگاو بنێت.

ئیسلامیش وەك كۆتا پەیامی خوایی زاڵبوو بەسەر ئایینەکانی دیکەدا، بە تایبەت کە پەروەردگار سەرچاوەی یەکەم و بنەڕەتیی (کە قورئانی پیرۆزە)، پاراستووە، هەروەها هەوڵی زانایانیش زۆرینەی فەرموودەکانیان لە لادان و ئەفسانەگەری و تێکدان پاراستووە، هەموو ئەمانە پێویست دەکەن کە دەزگاکانی بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و پەروەردەی ئایینیی و رۆشنبیریی ئیسلامی و راگەیاندن سەربەخۆ بن و جودا بکرێنەوە لە دەزگای دەسەڵات و فەرمانڕەوایی، ئەمەش زۆر پێویستە و رەگەزێکی گرنگە بۆ وشككردنی سەرچاوەی تاکڕەوی و گەندەڵی، کە لە رابردووەوە تا ئێستاش لە زۆر رووەوە نەخشی حوکم و دەسەڵاتە لە مێژووی سیاسیی میللەتی ئێمەدا. بەمەش دەکرێت میللەت بێدار بکرێتەوە و تێڕوانین و هزر و بەرنامەی پەروەردەیی رۆڵەکانی ئیسلاح بکرێن، بەدوور لە هەموو

کاریگەرییەکی تایبەت و نێگەتیڤی هەر تاقم و دەسەڵاتێکی بچووکی ناو کۆمەڵگە.

وەك پێویستیشە مزگەوت بکرێتە دڵی دەزگای بانگەواز و پرۆگرامی بانگەواز و فێرکردن،، پەروەردە، رۆشنبیریی ئایینی و کۆمەڵایەتی، ڕاگەیاندن، سەر بە دەزگا یان دەزگاکانی بانگەوازو راگەیاندن بن، میللەتیش سەرکردایەتی و بەڕێوەبەرانی هەڵدەبژێرێت، بەمەش دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن یان هەر دەستەیەکی تایبەتی ناو حکومەت دەسەڵات و بڕیاری بەسەریاندا نابێت. تەنانەت جگە لە چاودێریی میللەت هیچ چاودێرییەکیان بەسەرەوە نابێت، ئالەم کاتەدا دەگونجێت تێڕوانین و بیری ئایین ڕاست و ڕوون و نوێ ببێتەوە و پێشبکەوێت و گەشەبسێنێت، لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندنی گشتییدا بەشداری بکات لە زاڵبوون بەسەر سەرچاوەکانی تاکڕەوی و گەندەڵییدا، بەو شێوەیەش بینای دەزگاکانی حوکم و ژیانی گشتیی لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا ڕاست دەبنەوە و میللەت دەبێتە بڕیاردەر و ئاراستەکاری دەسەڵاتی سیاسیی، تەنها لە میللەتیشەوە شەرعیەت دەدرێت بە پیاوانی حوکم و بەرژەوەندی و سیاسەتیان هیچ دەسەڵاتیان بەسەر کاروباری بانگەواز و پەروەردە و فێربوونی ئایینی و راگەیاندنی گشتییدا نابێت، ئەمەش جیایە لە راگەیاندنی تایبەت کە لە خەڵکی بەرژەوەندیخوازەوە سەرچاوەی گرتووە، وە جیایە لە دەزگا و دامەزراوە گشتی و تایبەتیەکانی کۆمەڵگە.

## کاروباریان له ناوخۆیاندا بەڕاوێژە:

ئەڵبەتە دۆخی میللەتی ئیسلامیی کاتێك ژێراوژوور بوو کە گوتاری ئایینی (بە ئاگایی یان بەبێ ئاگایی) وایدانا میللەتی موسڵمان ئەوانەن کە نەزانن و تێنەگەیشتوون، بەڵام پیاوانی دەسەڵات و دارودەستەکانیان خاوەنی بڕوانامە و پسپۆڕی و ئەکادیمی و نازناوی قەبەن، یا بەشێوەیەکی تر ئەوانەن کە ئەزانن و تێدەگەن، ئیتر میللەت بوون بە نەزان و بێتوانا و دەسەڵاتدار و داروەستەیان بوون بە (زانا و پێگەیشتوو) و کوێخا بەسەر میللەتەوە، ئەوانی دیکە چەندە ئەکادیمی و پسپۆڕی کاروباری ئایینی و کۆمەڵایەتی بن، کران بە میکانیزم و راوێژکار و جێبەجێکاری بڕیارەکان، نەك بڕیاردەری سیاسیی (کە لە بنەڕەتا مافی میللەتە بگاتە لوتکە و پاراستنی بەرژەوەندیی خۆی)، ئەمانەش بە تێکەڵوپێکەڵکردنی کارتەکان و بیانووی نەشارەزایی زۆرینەی میللەت و تێنەگەشتنیان ئەنجامدرا.

ئەم بانگەشەیەش لە لایەن دەسەڵاتداران و داروەستەکانیانەوە لە لایەك و بەهۆی تێکەڵبوونی کارتەکان و لێڵی کارەکە لای هەندێك لە دڵسۆزان، لەلایەکی دیکەوە، لە ڕاستییدا بانگەشەیەکی بەتاڵە، چونکە کارەکە کاری سیاسەت و بڕیارە کە مافی میللەتی خاوەن بڕیارە، نەك کاری ڕاپەڕاندن و حکومەت، لەبەرئەوە دەبوو بە پرسی میللەت بڕیاری سیاسیی گشتیی بدرایە، بە سوودوەرگرتن لە پسپۆڕانی ئەو بوارە. چونکە بانگەشەکردن بۆ نەزانی و بێتوانایی میللەت و سەندنەوەی مافی بڕیاردان لێیان، ئەمانە نەزانی و دیکتاتۆریەت و گەندەڵی قووڵدەکەنەوە و تاقمە سیاسییەکە و دەزگا و داروەستەکانیان کە بە زانایی و رابەری و رۆشنبیر ناوزەدکراون، وەك

خۆیان دەمێننـەوە. چـونکە ئەگـەر نـەزانیی یـان کـەم تێگەیشـتن زۆرینـەی میللەت بگرێتەوە، لە ئاستی سیاسیی و بڕیار دروستکردندایە نەك لە ئاسـتی ڕاپەڕانـدن و هونـەری و ئەکادیمیـدا، ئەمەشـیان لـە ئەسـتۆی دەسـەڵاتی ڕاپەڕاندنە، چونکە ئەگەر میللـەت پێویسـتی بـە زیـادە هۆشـیاری رۆڵـەکانی ببێت بۆ پەیبردن بە ئەرکی سەرشانیان، چارەی ئـەم کەموکورتییانـە زیـادە هەوڵدانی پەروەردەیی و فێرکاری و رۆشنگەری و راگەیاندنە، بـە پرۆگـرام و بەرنامەی بانگەواز و پەروەردە و فێرکردن و هۆشیاری بەهێز، بە قایلکردن و سـەلماندن نـەك سـەپاندنی کوێخایـەتی و گەوجانـدنی جـەماوەر و زیـادە خۆسـەپاندن و تـاکڕەوی، تـا دەسـەڵاتداران هێنـدەی تـر گەنـدەڵکاری ئەنجامدەن.

## پێویستی جیاوازیکردن لە نێوان راوێژ و راوێژکردن و زانیاریە پیشەییەکان (المعارف المهنية)

لەم میانەیەدا گرنگە ئەوە بیرخەینەوە کـە پیـاوانی چـەرخی یەکـەم ئـەم هـەزاران کتێـب و پـەراوێز و بابەتـە ئەکادیمییانـەی ئـەمڕۆ شـارەزا نـەبوون، هەموو ئەوەی بە سـادەیی و بـێ گرێوگـۆڵ و زۆرلـەخۆکردن پـاش وەفـاتی پێغەمبـەر ﷺ دەیـانزانی، بریتیبـوو لـە پابەنـدبوون بـە بنـەمای راوێـژ و دادپـەروەری و ئیسـلاح و ئاوەدانخوازییـەوە، کـە ئەمانـە بنـەڕەتی بـەها و ئامانجـە ئیسـلامییەکانن و بەڵگەنەویسـتانە لـە ئـایین پـەی پێـدەبرێت، لـە دەرەوەی ئەمە وردەکاری و پسـپۆڕی لـە کـاتی پێویسـتییاندا بـەدی دێـن و بڕیاریـان لەسـەر دەدرێـت، بـا ئـەو فەرمایشـتەی عومـەری کـوڕی خـەتتاب لەمبارەوە بیرخەینەوە (ئەی عومەر چ زیانێکت پێ دەگات ئەگەر مانای (أَبًّا)

نەزانیت) مەبەستی ئایەتی (وَفَاكِهَةً وَأَبًّا) (عبس: ٣١) بوو، واتە: کاروباری سیاسەت جیایە لە کاروباری ئەکادیمی و هونەری و فەتوادان و حوکمی دادوەریێتی، چونکە ئەم کاروبار راپەڕاندنانە پێویستی بە وردبوونەوە و پسپۆڕی هونەری و ئەکادیمی هەیە.

لەم بارەوە بۆ نموونە کاروباری سیاسەتی کشتوکاڵی هەر وڵاتێك باسبکەین، بێگومان ئەوی گرنگە سەرکردایەتی سیاسیی و بنکە جەماوەرییەکە شارەزای حاڵەتی گشتیی کشتوکاڵی وڵات و سروشت و تواناکانی بن، تا سیاسەتێکی لەباری بۆ دارێژن و هەموو ئیعتیبارە سیاسییەکان لە بازنەی ئەم سروشت و ئیمکاناتانەدا جێگا بکەنەوە.

دیارە ئەمەش جیاوازە لە زانینی هونەری کشتوکاڵیی سەبارەت بە هەر بەروبوومێك و چۆنیەتی و کاتی چاندن و جۆرەکانی پەینی پێویست و زانیاریەکانی تر لەسەر رێنمایی کشتوکاڵیی تا دەستکەن بە بەروبووم چاندن، کە ئیعتباراتی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی زۆرینەی میللەت گرنگی پێدەدات و هانی چاندن و وەبەرهێنان و بازاڕ بۆ پەیداکردنی دەدات.

بۆ زانینی جیاوازی نێوان کەسایەتی سیاسیی و کەسایەتی هونەریی تەکنیکی، دەکرێت ئەم نموونەیە بەسەر هەموو کەرتەکانی دیکەی ژیاندا بگشتێنرێت، ئیتر بواری رەخنەگرتن لە میللەت و نوێنەرە سیاسییەکانیان نامێنێت، کاتێك بڕیاری گشتیی پێویست دەردەکەن، بەو بیانووەی کە زۆرینە میللەت یان سیاسییەکانیان لە بوارە جیاجیاکاندا پسپۆڕی هونەریی نین، تەنانەت لە بواری پسپۆڕی یاسایی و دارشتنی دەستووردا.

## دین و دەوڵەت: جیاوازی نێوان گەل و پیاوانی دەسەلات:

دوا تێبینیش ئەوەیە گرنگە هەزری سیاسیی کۆمەڵایەتی ئیسلامیی سەبارەت بە کاروباری دەسەڵاتی (دەسەڵاتی راپەڕاندن) بە ئایین و بانگەواز و فێرکردن و ڕۆشنبیری ئایینی تێکەڵ نەکرێن، جا ئایا بڕینی دەستی دەسەڵاتداران و بەرژەوەندییەکانیان و بەرژەوەندیی دارودەستەکانیان لە دەستخستنە ڕۆڵی ئایین و بانگەواز و پەروەردە و فێرکردن و رۆشنبیری و راگەیاندن کارێکی باشە یان خراپ؟ وە ئایا لە ڕاستییدا ئەمە جیاکردنەوەی دین و بەهاکانە لە دەوڵەت و سیاسەت؟ یان لە ناوەرۆکدا دەستگرتنی دەسەڵاتە لەوەی ئایین و بنەما و بەهاکانی بشێوێنیت، بە پەراوێزخستن یان خراپ بەکارهێنان و دین و خستنە خزمەتی خۆیەوە؟

گرنگی ئەم بابەتە (واتە جیاکردنەوەی ئایین لە زاڵبوونی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەسەریدا) ئەوەیە کێشەکە هێشتا زۆر کەس لێی تێناگەن، لای زۆرینەی میللەت بە ڕۆشنبیرەکانیشیەوە تێکەڵو پێکەڵە، بۆیە گرنگە لەوە بگەین کە دوورخستنەوەی کاروباری بانگەواز و فێرکردن و پەروەردە و ڕۆشنبیری ئایینی لە دەستێوەردانی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و بەرنامەی ڕۆژانەی سیاسیی و کۆمەڵێك بەرژەوەندی کە ناچارە ڕەچاوی کات، ئەم دەستگرتن و دوورخستنەوە و جیاکردنەوەیە، جیاکردنەوەی ئایین نییە لە دەوڵەت، یان ئایین لە سیاسەت، بەڵکو دوورخستنەوە و ڕێگرتنە لە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن کە زیان بە ئایین و بەها پیرۆزیەکان بگەیەنێت، ئیدی بە پەراوێزخستن بێت یان بە شێواندن و خراپبەکارهێنانی ئایین بێت، ئەم دەستگرتنەش خزمەتکردنی میللەت و دەوڵەتیشە، هەروەها پاراستنی ئایین

و بیروبـــــاوەڕ و پیرۆزییەکانـــــە لـــــە شـــــێواندن و پەراوێزخســـــتن و خراپبەکارهێنانیان بۆ خزمـەتی سیسـتمی دەسـەڵات و داروودەسـتەکانی، تـا بەرژەوەندییەکانیانی لە پەنادا بپارێزن.

لە ڕاستییدا دەسـەڵاتی فـەرمانڕەوایی جێبـەجێکردن ـ بـە سـادەیی ـ بـە مانـای دەوڵـەت نایـە، بـەڵکو یەکێکـە لـە دەزگاکـانی سیسـتمی حـوکم لـە دەوڵەتـدا، ڕاسـتییەکەی (میللـەت و جـەماوەر) تـەنها بناغـە و ڕەگـەزی سـەرەکین لـە ئاراسـتەکردنی سیاسـەتی گشـتیی و دامەزرانـدنی دەوڵەتـدا و تەنهاش بە ویستی ئەوان دەسەڵاتداران شەرعیەت وەردەگرن.

کەواتە ئەوی لە مانای دەوڵەت بگات و پایەی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی تێـدا بزانێت، لەوەش دەگات کە دوورخستنەوەی دەستی دەسـەڵاتی راپەڕانـدن و پیاوانی بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان لە زاڵبوون بەسـەر کاروبـاری ئـایین و پیرۆزیدا، ئەمە خۆی لـە خۆیـدا پاراسـتنی ئـایین و بـەها و پیرۆزییەکانـە لـە خراپبەکارهێنانیان بە هەر ڕەنگ و شێوەیەك بێت، نەك جیاکردنەوەی ئایین لە ڕێککردنی کاروباری دەوڵەت و ئاراستەکردنی بەرنامـەی ژیـانی سیاسـیی، بەڵکو پتەوکردنی دەسـەڵاتی ئـایین و بانگـەواز و پەروەردەیـە لـە سیسـتمی فــەرمانڕەوایی میللەتــدا، ئەمــەش پێگەیانــدنی کــادر و پــەروەردەی لاوان دەخاتـە سـەر ڕێگـەی راسـت و دروسـت لـە بەردەسـتی میللەتـدا دەبـن بـۆ ئامادەسازی، تا پێدەگەن بۆ ئاراستەکردنی کاروباری کۆمەڵگەکەیان، لەسەر بناغەیـەکی قـووڵ و پتـەوی ئـایینی و دوور لـە کاریگـەریی بەرژەوەندییـە تایبەتییەکانی هیچ کەسێك، بەتایبـەت دەسـەڵاتداران و داروودەسـتەکانیان، نەك زۆرینەی میللەت، کەواتە مەسەلە ئەوەیە ئێمە لە مەرامی قورئانی پیرۆز

بگـەین، لـە پەنـدەکانی مێـژوو بگـەین، دەبێـت ڕێکخسـتنی بیناکـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئامانجـەکانی ئـایین و ئەزموونـەکانی میللـەت ڕاسـتکەینەوە، لـە سروشـتی مرۆڤـەکان بگـەین، ئەمـەش بـەوە دەبێـت ئـەو دەسـەڵاتانەی کـە پەیوەندن بـە ئـایین و بـەها و بانگـەواز و ڕۆشـنبیری و فێرکردنـی ئـایینی و کۆمەڵایەتی و ڕاگەیاندنی گشتیی، بیاندەینەوە دەست میللـەت، لـە ڕێگـای کۆمەڵە دەزگایەکی سـەربەخۆوە کـە دەسـەڵاتیان ڕاسـتەوخۆ لـە میللەتـەوە وەرگرتبێت، تا ئەم دەزگایانە دڵسـۆز و لێبڕاوانـە ڕۆڵـی کادرەکـانی میللـەت بهێننـەوە و هۆشـیارییانکەنەوە، زانیـاری ڕاسـتیان بـدەنێ تـا بتـوانن ڕۆڵـی خۆیان لە ژیان و لە ئاراسـتەکردنی کۆمەڵگـەدا ببیـنن، دەزگـا گشـتییەکانی ژیانیان ڕێکخەنەوە بە دەزگای فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتیشـەوە، کـە بـەپێی پۆلێنکردنێـک کـە لـە سـەر ئـایین ئامانجـەکانی بنیـاتنراوە و ئـەوان لێیتێگەیشتوون و لەسەری پەروەردە بوون، بەبێ شێواندن یـان بـەکارهێنان یـان فەرامۆشـکردن. بەراسـتی باشـترین ڕێگـا بـۆ خزمـەتکردنی ئـایین و بیروباوەڕ و بەهاکانی کۆمەڵگە و دەوڵەتیشدا فێربوونی ئـایین و بیروبـاوەڕ و ئاکارە بە دید و گوتار و شێوازی دروست، دوور لە خڵتە و پۆخڵەیی.

## گرنگی دروستیی بونیادنانی دامەزراوەکانی بانگەواز و ڕاگەیاندن:

ئەم پێداچوونەوەی هزری ئیسلامیی سیاسیی کۆمەڵایەتی هاوچەرخانە و سـەرلەنوێ بنیاتنانـەوەی دەزگاکـان، لەناویشـیاندا دەزگاکـانی (بانگـەواز و پەروەردە و فێرکردن و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی سەربەخۆ)، بێگومـان ئەمـە هـەنگاوێکی گرنگـە بـۆ بنیاتنانـەوەی بناغـەی هۆشـیاری و سیاسـیی و کۆمەڵایەتی ئیسلامیی دروست، چـونکە ئـەم پـەروەردە و هۆشـیارییە تاقـە

ڕێگای گرەنتین کە هاوولاتیان ڕێنوێنی دەکەن بۆ هەڵبژاردنی ڕێباز و بەرنامەی سیاسیی هۆشیارانە، بۆ بەجێگەیاندنی ئامانجەکانی ئایین و بڵندکردنەوەی بەها و ئاکار لەناو کۆمەڵگەدا و پابەندبوون پێیان بە باوەڕ و قەناعەتەوە، ئائەمەش بە کورتی یانی دورخستەنەوەی ئایین و پیرۆزییەکان لەبەردەستی پیاوانی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و لەو لاوازی و لادان و تەماحکارییەی تووشی دەبن، وەك ئێستا لە زۆر وڵاتدا دەیبینین، کە لە کاتێکەوە سیاسییەکان زاڵبوون بەسەر ئایینیەکاندا، وەك ئەوەی لە مێژووی سیاسیی گەلانی ئیسلامییدا روویداوە، یان کاتێك ئایینەکان بەسەر سیاسییەکاندا زاڵدەبن، وەك ئەوەی لەناو مەسیحی و رۆمانییەکاندا روویدا، پێش ئەوانیش شارستانیەتە کۆنە دیکتاتۆرەکان هەروا بوون، کەواتە ئەم دوورخستنەوەیە مەبەست پێی پاراستنی ئایین و پیرۆزییە لە تێکدان و شێواندن و خراپبەکارهێنان، لەمەشدا ئامانجەکانی ئایین بە دی دێن و پلەوپایەی شایستەیان لەناو دەوڵەت و کۆمەڵگەدا بۆ دادەنرێت، واتە: دوورخستنەوەی ئایین و پیرۆزییەکان لەبەردەستی دەسەڵاتی راپەریندا لێکترازاندنی لە دەوڵەت و سیاسەت نییە، بەڵکو بەهێزکردن و زەمینەسازاندنە بۆیان تا رۆڵی خۆیان لەناو دەوڵەت و کۆمەڵگەدا ببینن. وە لە سیاسەتکردنی کۆمەڵگە ـ لەڕێی ئەوانەی کە پەیوەستن بەو بابەتەوە و گرنگی پێدەدەن ئەوانیش سەرجەم ڕۆڵەکانی ئوممەتن ـ بە ڕێنمایی دروست بۆ بەرنامەی سیاسی ژیان بەپێی ئامانج و بابەتە هەنوکەیی و بەرژەوەندیە گشتیەکانی ئاین، کاریگەر بەو هۆشیاری و پەروەردە و وانە ئاینیە دروست و

ڕاگەیاندنــە پاکــەی وەریــانگرتوە، ئــەویش تــەنها لــە ڕێــی دامــەزراوە سەربەخۆکانی تایبەت بەم مەبەستانە.

گرنگــە بــزانین ئــەو بەرنامــە و بڕیارانــە دەردەکــرێن و بــە خواســت و هەڵبـژاردنی میللـەت پشـت ئەسـتوورن، ئەمانـە هێـز و توانایـەکی سیاسـیی ڕاستەقینەی وایان هەیە کە ئەوانیتر نیانە، ئەمانە زۆرینەی گەل پشتیوانیانە بـە پێچـەوانەی ئـەو بەرنامـەو بڕیارانـەوە کـە لەلایـەن دەسـەڵات و خـاوەن بەرژەوەندییـە تایبەتەکانـەوە دەردەچـن، لـە ڕەنگدانـەوەی بەرژەوەنـدی و ویسـت و خواسـتی میللـەت نـین. لەبـەر ڕۆشـنایی ئەوانـەی رابـورد، گرنگـە جیـاوازی بکـەین لـە نێـوان زەبـری سـەپاندنی پیرۆزیـی (لـە کاتێکـدا ئـایین دەکرێتـە دەستپێچـی خزمـەتکردنی بەرژەوەندییـە تایبەتـەکان) و لـە نێـوان هیدایەتی وەحی و ڕووناکی ئایین بۆ میللەت و گەلان (کاتێك ئایین دەکرێتـە پرنسیپ و چەمك و ئاکار و بانگەواز و پەروەردە).

## کارەساتی تێکەڵکردنی ڕۆڵ و گوتارەکان:

جـا بـۆ پاراسـتنی میللـەت لـە خراپتێکەیشـتن و لـەڕێلادان، پێویسـتە تێکەڵکردنی ڕۆڵ و کارت و چەمکەکان بـۆ میللـەت جیابکەینـەوە. لەوانـەش دەبێت وریای ئەو وتەیە بین کە دەڵێت: (ئەوی خودا بە دەسەڵاتدار دەیکات بە قورئان نایکات) ئەمە نەکرێتە دەستپێچ بۆ زاڵکردنی دەسەڵاتداران بەسەر ملـی خەڵکـەوە. خـۆ عەقیـدە و مەبـدەء و چـەمك و ئاکـار بـە بانگـەواز و پەروەردە پێی دەگەین (بالحكمة والموعظة الحسنة) (وجــادلهم بــالتي هــي أحسن) (وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين) (الدين حسن الخلق)، بۆیە سـەرنجدان

لـە دەقـەكان بـە گشـتیی و سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ بەتایبـەت، پێویسـتە سەرەتا لەسەر بەرنامەیەكی دروست بێت، بە تێگەیشتن لێـی و دەرك كـردن بە ئامانج و مەبەستەكانی، ئەویش بە گرتنەبـەری ڕێبـازێكی ورد و وریایانـە، لەو دەقانەی كە متەواتر نین و دەگونجێت لە دەقەكە یان ماناكەیـدا هەڵـە و بێئاگایی یان كەموزیاد كردن و هەڵبەستن هەبێت، جگـە لـە تێبینـی كردنـی ئەو كات و شوێنەی فەرموودەكەی تێداوتراوە، یان كات و شوێنێكی تـر كـە بە جـۆرێكی تـر فەرموودەیـەكی تێـدا وتـراوە، بـەپێی بـارودۆخ یـان ئـەوەی فەرموودەكەی بەرەو رووكراوە، هەروەها دەبێت ئەو رۆڵ و كارانەی تایبـەت بوون بە پێغەمبەر ﷺ بۆ كەسی دیكە نەبووە و نابێـت جیایـان بكەینـەوە، چونكە ئەو پەیامبەری وەحـی هێنـی هـەموو كـات و شـوێنێك بـووە، لەیـەك كاتیشـدا بـانگخواز و مامۆسـتا و پەروەردەكـەر و سەرمەشـقی قەومەكـەی و دوای ئـەوانیش بـووە، لـە هەمانكاتیشـدا سـەری دەسـەڵات و فـەرمانڕەوا و دامەزرێنــەری كۆمەڵگــە و دەوڵــەتیش بــووە، تــا كۆمەڵگایــەكی مرۆیــی لەناوجەرگەی ژیانی خەڵكیدا دامەزرێنێت و بیكاتە بەڵگە بۆ شـیاوی ئـایین و بنەما و بەهاكانی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.

بۆیە رەگەزی كات و شوێن بۆ تێگەیشـتنی گوتـار و ڕەفتـاری پێغەمبـەر ﷺ زۆر گرنگــە، كــە ئامــانجی بینــای دەوڵــەت و كۆمەڵگەیــەكی مرۆیــی شارستانیی بووە، لەناو كۆمەڵە و هـۆز و تیرەیەكـدا كـە سـادە و سـەرەتایی بـوون و پێشـینەی دەوڵەتـدارییان نـەبووە، كەچـی پێغەمبـەر ﷺ وایكـرد هاووڵاتیان (موسڵمان) ئەوانـەبوون كـە پابەنـدی ئـەرك و مـافی هـاووڵاتیبوون

بێـت، وە هـاووڵاتی و (أخ مسـلم) (سـتەم لـەوی دی ناكـات و پشتگوێیشـی ناخات)، (خواش پشتیوانی بەندەیەكە تا ئەو بەندە پشتیوانی براكەی بێت).

بەبیٚ ئەم بەرنامە ڕۆشـنە لـە تێگەیشـتن لـە چـەمك و گوتـار و ڕۆڵـەكان، ئەستەمە ڕێگرتن لە لادان و سنوربەزاندن لە خراپ بـەكارهێنانی پیرۆزیـەكان بۆ ڕەواییدان بە ستەم و دیكتاتۆریەت و گەندەڵی بۆ بەرژەوەندی دەسـەڵات و دار و دەسـتەكانی، ئەمـەش دواجـار دەبێتـە هـۆی بێبەشـبوونی ئومـەت و مرۆڤایەتی لە ڕێنموونی سروش و ئاراستەی نەژادی مرۆڤایەتی لە بەدیهێنانی مەبەست لە دروسـتكردنی بونیـادی ژیـان لەسـەر بنـەماكانی راسـتی و داد و برایەتی و بەزەیی و ئاشتی.

## مەدەنیەتی سیستمی سیاسی ئیسلامی:

بـە كـورت و پـوختی: ئـەم تێڕوانینـە بەرنامەدارییـە و ئـەم رێكخسـتنە ئیسلاحییە واتە: دارشتنی سیستمی میللەت و گەلانی ئیسلامیی لەسەر ئـەم بنەمایە، تەعبیر لە ئاوات و ئامـانجی میللـەت دەكـات، دەیكاتـە میللـەتێكی زیندووی ئیسلامیی لە دەولەتێكی مەدەنی ئیسلامییدا.

دەستەواژەی (ئیسلامیی)ش لێرەدا واتە: ئایین و بـەها دەبنـە نـاوەرۆكی هزر و ویژدانی میللەت و دەشبنە چوارچێوەی هەموو بڕیار و سیستمەكانی.

مەبەستیش لە (مەدەنی): پابەندبوونی سەرجەم توێژەكانی میللەتـە، بـە رێكخستنە كۆمەڵایەتی و مرۆییەكانـەوە، كـە خۆیـان لەسـەری رێكدەكـەون، ئەمــەش ئامانجــەكانی ئـایین و بــەهاكان دێنێتــە دی نــەك پێچــوانەكەی. بەمشـێوەیە میللـەتی ئیسـلامیی ئەوەیـە: ناسـنامەی هـاووڵاتی بوونیـان و

پەروەردە و تێگەیشتن و ئامانج و خواستیان ئیسلامیی بێت، دەوڵەتەکەش دەبێتە دەوڵەتێکی ئیسلامیی، چونکە لەسەر ناوەرۆکی ئەو چەمك و ئامانجە باڵا و مرۆییانە دامەزراوە.

ناموسڵمانە کەمینەکانیش دژی نابن، چونکە بەرنامە و سیستمیان لەسەر بناغەی سیستمێکی تەوافوقی داڕێژراوە، کە لە بەرژەوەندیی موسڵمان و ناموسڵمانەو ناسنامەی ئەوانیش دەپارێزێت. هەروەها ڕەچاوی بابەتە هەنووکەیی و خواست و بەرژەوەندییە بنچینەییەکانیان دەکات، وە سەرجەمیان ڕێك دەکەون لە چوارچێوەی دەستوورێکی مەدەنیدا لە ڕووی ڕێکخستنەوە، وە لەچوارچێوەیەکی مرۆڤانەی ئیسلامیدا لە ڕووی ناواخنەوە. مرۆییش لێرەدا بە واتای: ئەو چەمکە دێت کە تەعبیر لە بەهاو مافە مرۆییە بنەڕەتییەکان دەکات، کە هەموو مرۆڤەکان بە گشتیی، بە موسڵمانیشەوە، ڕێکن لەسەری و هەر بە سروشت و بنەمای ئایین و باوەڕ و کەلتوورەکەیان دژی نابن. جا ئەو حکومەتە ئیسلامییەی کە لەسەر ئەم بنەمایانە دادەمەزرێت ئەوە (حکومەتێکی ئیسلامییە) لە هەمانکاتدا حکومەتێکی مەدەنیشە، واتە پشتی بەستووە بە ویستی هەموو توێژەکانی گەل، لە پێشیانەوە توێژی موسڵمانانی ئەو دەوڵەتە و بەها و خواست و بابەتە هەنووکەییەکانی کە سەرچاوەیان گرتوە لە ناسنامە و بەها و پرنسیپەکانیەوە وە لە پەروەردە ئیسلامیەکانیەوە کە ئاڵای بەها و گیانی هاوکاری و چاکە و برایەتی و ڕاوێژ و ئاشتی هەڵکردووە و پابەندیانە تەنها لە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی دەستدرێژیکەران و پاراستنی لاواز و ستەملێکراواندا نەبێ.

## سیستمی سیاسی رۆژئاوایی دیموکراسی ماددی سیستمی ڕاوێژکاری مەدەنی ئیسلامی نیە :

لەم باسەدا بۆ ئەوەی مەسەلەکان تێکەڵ نەکرێن و دیدەکان لێڵ نەبن، گرنگە جیاوازی بخەینە نێوان سیستمی حوکمی شورای ئیسلامیی و حوکمی دیموکراسیی عەلمانی. چونکە سیستمی حوکمی دیموکراسیی عەلمانی ئەو وێنە سیاسییەی سیستمی رۆژئاوای مادەگەرای عەلمانییە، کە لە بواری ئابوورییدا بە سیستمی سەرمایەداری و لە بواری کۆمەڵایەتیدا بە سیستمی لیبراڵی و لە بواری سیاسییدا بە سیستمی دیموکراسی تەعبیر لە خۆی دەکات. دیارترین نیشانەی جیاوازی سیستمی دیموکراسیی عەلمانی لە سیستمی سیاسیی شورایی ئیسلامیی جیاییەکی بنەڕەتیی فەلسەفییە، کە دەبێت لە هەندێك لایەنی هەر سیستمێکدا رەنگ بداتەوە، با لە هەندێك روویشەوە وەك پابەندبوون بە هەڵبژاردنەوە و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (دەسەڵاتی راپەڕاندن، تەشریعی، قەزایی) لێکچوون لە نێوانیاندا هەبێت لەهەندێ ڕووەوە لەوانە لێکچوون لە گرنگی پابەندبوون بە هەڵبژاردنەوە واتە مەرجەعیەتی زۆرینەی گەل و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بۆ ئەوەی هاوسەنگی هەبێ لە نێوان یاسادانان و جێبەجێکردندا، وە بێ لایەنی دادگا، بەمەش بەرژەوەندیە تایبەتەکان سنوور نابەزێنن و دوژمن نابێتە ناوبژیوان.

سیستمی دیموکراسیی عەلمانیی رۆژئاوایی (بەهۆی ئەفسانەیی کەهەنووتی ئایینەوە و خراپی مامەڵەی پێشینەی رەفتارکردنی) لەناو کۆمەڵگەی رۆژئاواییدا سیستمێکی سیاسییە و پشت بەو هزرە ماددییە دەبەستێت، کە ویستی مرۆڤ دەکاتە یەکەم و کۆتا سەرچاوەی بڕیاردان

لەســەر چــاکە و خراپــە، واتــە حــەق و راســتی لــە سیســتمی عــەلمانی دیموکراســییدا کێشــەیەکی کەســێتی تایبەتــە، هــەموو تاکێــك بــۆ خــۆی بڕیاردەدات چی بە راست و چاك دادەنێـت، کەسـیش بـۆی نییـە بڕیـار یـان ئامۆژگاریی کەسی دی بکات.

لەبەرئەوەش هیچ تاکێك بە تەنیا ناتوانێت بۆ خۆی بژی، بەڵکو پێویستی بە هاوکاریی ئەوانی دیکەیە، بۆیە تاکەکانی کۆمەڵگەی رۆژئاوایی رێکەوتوون لەسەر سیسـتمێکی گشـتیی کـە هـەموو لایـەك پێـوە پابەنـدبن، بـەو شـێوە سیستمی دیموکراسی (واتە زۆرینەی کۆمەڵگە) کە بەو مانایە دێـت زۆرینـەی هاووڵاتیـان لەسـەر ئـەوە رێککـەون کـە کاروبـاری کۆمەڵگـە بـە قەناعـەتی زۆرینەیان بەڕێوەبچێت، ئەمەش ئـەو خاڵەیـە کـە زۆرینـە و کەمینـە دەبێـت پێوەی پابەند بن، کە زۆرینـە خـاوەنی هێزەکەیـە، بـەڵام دەبێـت مافـەکانی کەمینەکان بپارێزرێت، دەرك بکـات بـەوەی هـەر سـتەمێك بکرێـت لـە مـافی کەمینـــەکان، بێگومـــان لـــە ئاینـــدەدا بـــە پەرچـــەکردار و یـــاخییبوون وەڵامدەدرێتەوە و ئاسایشی کۆمەڵگە تێکدەدات، ئەمـەش بـە زیـانی هـەموو توێژەکانە بە کەمینە و زۆرینەشەوە.

ئاشکرایە لـەم سیسـتمە مـاددی (عەلمانی)یـەداو لـەم فەلسـەفە ماددییـە عەلمانییەدا، بـە تێپـەڕبوونی کـات و فراوانبـوونی چەسـپاندنی، وەك ئـەمڕۆ دەیبینین، گرفتـی جەوهـەریی لـەم سیسـتمەدا سـەرهەڵدەدات، وایلێهـاتووە چەمکی ئـازادی بووەتـە رووکـەش و بـە مانـای پاشـاگەردانی کۆمەڵایـەتی و ئەخلاقی دێت، کە هەرچی بەها و باوەڕ و ئاکار هەن هەرەسیانهێناوە، بەشە ئاژەڵییەکەی مـرۆڤ بووەتـە سەرچـاوەی هـەموو شـتێك، بۆیـە خەریکـە ئـەو

کۆمەڵگایانـە بـاجی شـوێنەوارە سـلبییەکانی دەدەن، ئـیتر خێـزان نابێتـە باوەشـێکی ئـارام و پـارێزەری نـەوەکان، داخوازییـە گیـانی و دەروونـی و سۆزدارییە نا مادییەکانی پێ دابین ناکرێت، ئەمەش لـە ناوەراسـتی چـەرخی رابـردووەوە زۆر بـە خێرایـی ئـەو میللەتانـەی بـەرەو لێـواری داڕووخـان و هەرەسـهێنانی ئـەخلاقی و کۆمەڵایـەتی دەبـات، وەك دووبارەبوونـەوەی مێژووی میللەتەکانی پێشوو.

بـەڵام ئەگـەر سیسـتمی راوێـژی ئیسـلامیی لەسـەر بنـەمای چـەمکە قورئانییەکان بنیاتنرا، ئەوکاتـە ئـەرکی موسـڵمانان، کـە پابەنـدی خواسـتی کۆمەڵگاو بڕیارەکانی زۆرینەن، هەروەك سیسـتمی دیموکراسـیی عەلمانییـە، بەڵام لەوەدا لە سیستمی دیموکراسیی عەلمانیی جودایە کە موسڵمان حەق و راستەقینە بە کێشەیەکی بابەتی لە قەڵەم دەدات و تێڕوانینـی گشـتگیرانەی بۆ بوونەوەر هەیە کە کێشەکە هەموو لەبـەر دەسـتی لـۆژیکی مرۆیـی نییـە، کەواتە ئـەم تێڕوانینـە گشـتگیرییە پێویسـتە بـۆ رابەرایـەتییکردنی کـاروانی مرۆڤایـەتی، لـە بـواری گیـانی و ئاکـاری و کۆمەڵایـەتی و شارسـتانی و ئاوەدانخوازییـەوە تـا کـاروانی مرۆڤایـەتی لـە ژیانـدا چـاکەخواز بێـت بـۆ بەختەوەرکردن و ئۆقرەیی دەروونیی مرۆڤەکان. کەواتە هـاووڵاتی موسـڵمان بۆ پیادەکردنی ئیسلام و بیناکردنی کۆمەڵگە لەسەر بنەمای تێڕوانین و بەها ئیسـلامییەکان، دەبێـت بـە تێـڕوانین (دیدگا)یـەکی گـەردوونی ئیسـلامیی و چەمك و ئامانجە رۆحی و ئاکارییە چاکەویست و ئاوەدانخوازییەکەیەوە بێت.

گرنگیشە ئەم دیدە گشتگیر و بەها و چەمکە ئیسلامییانە لـە فەلسـەفەی سیسـتمی ئیسـلامییدا لای هـاووڵاتی موسـڵمان روون بێـت، ئەمانـەش

مەسەلەیەکی خەیاڵی و دیرنشینی نییە، بەڵکو مەسەلەکە دید و بنەما و بەها و چەمکگەلێکی ئاسانی دیاریکراو و ئاشکراو ڕوونن، بەڵگەدار و زانراون، مرۆڤدۆست و چاکەویستن، شتی پڕوپوچ و خەیاڵیی تێدا نییە، بەڵکو دید و بەها و چەمکگەلێکن کە بە وەحی دابەزیون و لە واقیعیشدا لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا جێبەجێکراون، بۆیە لەگەڵ سروشتی مرۆڤەکاندا دەسازێت و عەقڵ پێی ڕازییە و دەروون و ڕۆح پێی ئۆقرە دەگرن، کەواتە بەڵگەیە بەسەر مرۆڤەکانەوە لە چوارچێوەی کۆمەڵە بنەمایەکدا فەراهەم دێت، کە بناغەیەکی مرۆیی و ڕۆحی و ئاکاری و چاکەویست و ئاوەدانخوازی هەیە.

ئیتر ئەوەی بە بەڵگە باوەڕی پێ دێنێت، ئەگەر قبوولّی کرد و پێی ڕازیبوو، دەروون و ویژدانی وەریگرت، ئەوە موسڵمانە، هەرکەسێکیش ڕەدی کردەوە و بنەما و ئامانجەکانی قبووڵ نەبوو، لە نەزانینەوە بێت یان بە میراتی بۆی مابێتەوە لەوەدا ئازادە، بەڵام بە موسڵمان ناژمێردرێت، بۆی نییە لە بنەماکانی ئیسلام کەموزیاد و گۆڕانکاری بکات، واتە هەموو تاکێك ئازادە موسڵمان بێت یان ناموسڵمان، بەڵام کەس بۆی نییە لە بنەماو ئامانجە چەسپاوە ئیسلامییەکان گۆڕانکاری و کەموزیاد بکات و مافێك بە خۆی بدات کە هی ئەو نییە و ناسنامەیەك بەرزبکاتەوە کە خۆی ناچێتەوە سەری. بەمەش سیستمی حوکمی سیاسیی لەناو میللەتی ئیسلامییدا دواجار پابەندە بەو دیدگایە و بڕیار و ڕێکخستنە سیاسییانەوە کە لە ڕێگای قەناعەت و ڕازیبوونی میللەتەوە فەراهەم هاتووە، کە (بە زاراوەی ڕۆژئاوا) ئەمە دەبێتە سیستمی ئیسلامیی، بەڵام سیستمی دیموکراسیەتی راوێژی ئیسلامیی، نەك دیموکراسی ماددی عەلمانی، بەمەش لە ڕێکخستنی

سیستمی سیاسیی راوێژیی ئیسلامییدا ئەرکی موسـڵمانان لـە بـەر ڕۆشـنایی ئەو دیدگا و بەها و چەمکانەدا پرسوڕا کردنە بەو شێوەیەی کە ئامانجی ئـەو کات و شوێنە دەپێکن و پێکەوە ڕێکدەکەون.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ڕێککەوتنەش دەسەڵات پابەندی ڕای زۆرینەیە، لە چوارچێوەی دید و چەمك و ئامانجە بنەڕەتییە ئیسلامییەکان، کە لەناو تاکەکانی کۆمەڵگەوە سەرچاوەی گرتووە، لە مرۆڤێتی و هاووڵاتیبوون و برایەتیکردن. هەروەها دەسەڵات دەبێت پابەندی بنەماکانی برایەتی و دادپەروەری و هاریکاریی بێت، لە پاشانیشدا کەرامەتی مرۆڤ و مافە بنەڕەتییەکانی هاووڵاتی دەپارێزێت بە هەموو چین و توێژەکانەوە بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ ئیعتبارێکی ئەتنی و ڕەگەزیی و پلەوپایە بۆیشی نییە لەم بنەما و بەهایانە دەرچێت و پێشێلیانکات، کەواتە ئامانجی دەسەڵات لە کۆتاییدا پرسوڕا وەرگرتنە بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەست و ئامانجانە، ئیتر لە سایەی سیستمی ڕاوێژییدا، هەموو موسڵمانێك بەپێی باوەڕ و پەروەردە و کاریگەری لە ئیسلام بۆی نییە ستەم یان دەستدرێژییەکی ناحەق قبوڵ بکات کە بکرێتە سەر هەر تاکێکی موسڵمان یان ناموسڵمان.

گرنگیشە بزانین لە سایەی سیستمی ڕاوێژیی ئیسلامیی مەدەنیدا، ڕۆڵی حزب و تاقمە سیاسییەکان ململانێیە لەسەر پێشکەشکردنی بەرنامەی سیاسیی بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی میللەت، لێرەشەوە ئیتر (لەم سیستمە ئیسلامییەدا گرفتی بوونی فرەحزبی یان دەسەڵات ئاڵوگۆڕ پێکردن نامێنێت، چونکە هۆشیاری میللەت و نەبوونی ئایدۆلۆژی (کەهەنوتی) (کە بەناو حەقیقەتی ڕەهاوە قسە دەکات و هەموو حەق و بڕیارەکان بۆ خۆی

دەبینێتەوە) وا دەکەن دەسەڵاتی دیکتاتۆری بە هەر ناوێکەوە بێت، سەرهەڵنەداتەوە، تەنها میللەت خاوەن بڕیار دەبێت و سەرچاوەی دەسەڵاتیشە، ئیتر لەم سیستمە ئیسلامییەدا میللەت خاوەنی حکومەتێکی مەدەنیی سیاسییە، رازیبوون و رازینەبوون لێی بەندە بە قەناعەتی میللەت بە پێکهاتە و بەرنامەی حکومەتێك کە لایەنە سیاسییە هەڵبژێرراوەکان پێکیان هێناوە، وە بەبێ ئەم رازیبوونەش نە شەرعیەت هەیە نە دەسەڵات، وە لەم سیستمەدا ـ لەهەموو بار و دۆخێکدا ـ بوار نیە بۆ کوێخایەتی یان تاکڕەوی یان قۆرخکردنی دەسەلآت بەبێ ڕازیبوونی میللەت.

ئالێرەوە هەردوو سیستمی دیموکراسیی عەلمانی و راوێژیی ئیسلامیی، یان بە دەستەواژەیەکی روونتر هەردوو سیستمی دیموکراسین ماددی عەلمانی و دیموکراسیی شورایی ئیسلامیی، (لێرەدا وشەی دیموکراسی واتە بڕیاری زۆرینە)، با لە هەندێك ڕووەوە لێکچوونیان هەبێت، بەڵام جیاوازی جەوهەری و فەلسەڤی قووڵ لە نێوانیاندا هەیە، ئەوەندەی لە نیوان هەردوو کۆمەڵگە و شارستانییەکەیاندا جیاوازی فەلسەڤی قووڵ هەیە، تێکگیرانیان لە تێکگیرانی هەردوو چەمکی (حەق بە هێزە) و (هێز بە حەقە)وە سەرچاوە دەگرێت، ئەم جیاوازییە فەلسەفییە بنەڕەتییە دەبێت لە بەرنامە و پەیکەر و رێکخستنی بڕیاردان و دەستگاکاندا رەنگ بداتەوە، تاوەکو میللەتی ئیسلامیی بە بەرپرسی نەزانرێت، کاتێك دەزگا و رێکخستنەکان تەعبیر لە فەلسەفە و ئامانجی ئەو ناکەن و دەگەن بە کۆمەڵە بڕیارێك کە میللەتی پێوە گەردنگیر نابێت و پێشی ڕازیی نییە.

## سیستمی سەرۆکایەتی و حزبی پەرلەمانی بژاردەیەکی ئیسلامیە:

هەروەها دەگونجێت بە هۆی جیاوازی فەلسەفی هەردوو سیستمی دیموکراسیی شورایی ئیسلامیی و دیموکراسیی ماددی عەلمانی، پابەندی راوێژکاریی لە سیستمی ئیسلامییدا لە زۆر حاڵەتدا سەربکێشێت بۆ دەرکەوتی ئەوی ئەمڕۆ لە سیستمی سیاسیی هاوچەرخدا بە (حزبی پەرلەمانی) ناسراوە، راوێژکارانی سیستمی ئیسلامیی زیاتر پابەندن بەوەی بەرژەوەندی و حەقە، لە ناخەوە قەناعەتیان پێیەتی، نەك بەهۆی هەڵوێستە حزبییە چەقبەستووە پێشوەختەکان، ئەمەش لە هەندێك حاڵەتدا کاریگەریی دەبێت لەسەر دامەزراوی (استقرار)ی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و بەردەوامیی سیاسەتەکانی بۆ بەرپاکردنی گۆڕانکاری لە پێکهێنانی بنکە پەرلەمانییەکەیدا، ڕەنگە ئەم دۆخەش وابکات کە سیستمی سەرۆکایەتی (النظام الرئاسي) بەشێوەیەك لە شێوەکان زیاتر گونجاو بێت بۆ سیستمی شوورای ئیسلامیی، کە ئەمە غەیری ئەو سیستمەیە کە لای قوتابیانی زانستە سیاسییەکان بە (سیستمی پەرلەمانی) ناسراوە.

ئیتر ئەرکی میللەتە لە ئاڕاستە و دیدگا و فەلسەفە شارستانییەکە بگات، بۆ ئەوەی دەستگا و ڕێکخستنە دەستوورییەکانی بەشێوازێکی کاریگەری دروست، کە لەگەڵ سروشت و بەرژەوەندییەکانیدا رێکبکەوێت، بنیات بنێت، بۆ ئەوەیش بزانێت چۆن چۆنی سوود لە کارلێکە شارستانییە پرشنگدارەکەی وەربگرێت و لەگەڵ ئەزموونی میللەتان و سیستمی شارستانییە کۆمەڵایەتییەکانیان ڕێکیان بخات، هەر میللەتی ئیسلامیی لە زۆر حاڵەتدا دەبێت بزانێت چۆن سیستمە کۆمەڵایەتیی و شارستانییەکانی

به کەمترین هەوڵ و ماندووبوون بەگەڕ دەخات، به سوودوەرگرتن له هەموو هەوڵێکی خێریی بنیاتنەر که مرۆڤایەتی بەدەستی هێناوه، تاوەکو ئەمیش له سۆنگەی سیستمه شارستانییه ئیسلامییەکەی و داهێنانەکانیەوه بەشداریی له رێنمایی سیستمه مرۆییه ژیارییەکانی دیکه بکات.

لێرەشدا گرنگه دووپاتی بکەینەوه له سیستمی ئیسلامیی ڕاوێژیی مەدەنیدا دەستی حکومەت و دەسەلاتی ڕاپەڕاندن ناگاته بەکارهێنانی پیرۆزیی ئایین و بابەتی هۆشیارکردنەوه و بانگەواز و پەروەرده و فێرکردن و رۆشنبیری و راگەیاندنی گشتیی، ئەوانه سەربەخۆن، ئەوانه کاروبارەکانیان دەستگایەك یان کۆمەڵه دەستگایەکی سەربەخۆ بەڕێوەیان دەبات، بڕیاری هەمووشیان راستەوخۆ دێتەوه ژێردەستی میللەت و نوێنەره تایبەتمەندەکانی لەو بوارانەدا، لەبەرئەوه ئیتر حزب و تاقمه سیاسییەکان لەم سیستمه ئیسلامییه مەدەنییەدا، بواری میراتگری ئایینیی یا به پیرۆزبوونیان نییه، ئەوەی هەیانه تەنها ململانێی سیاسییه بۆ خزمەتکردنی میللەت له ژیانیاندا، ئەمەش بوار بۆ فرەدیدگایی و پۆلێنکردن و بیروبۆچوونی جیاواز دەڕەخسێنێت، هەرچەنده هەموویان پابەندن به دەستووری میللەت و شەرعیەتیان له رەزامەندی ئەو بەرنامانەوه وەردەگرن.

لەمانەوه که باسمانکردن به بێگومان ڕووندەبێتەوه که سیستمی میللەتی ئیسلامیی سیستمێکی مەدەنیی شورایی ئیسلامییه، چونکه ناوەرۆکەکەی پشت ئەستووره به ویستی گەل، له هەمانکاتدا ناسنامه و بەها و ئامانج و ویستی موسڵمانان پێگەی بنەڕەتی ئەو دەبێت، که ئەمەش بەشێوەی رێککەوتنی دەستووری لەگەڵ توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگەدا لەناویشیاندا ناموسڵمانەکانی ناو دەوڵەت، دیاری دەکرێت، له رێکخستنیشدا سیستمێکی

مەدەنییە، چونکە تەوافوقی دەستوورییە و نوێنەرایەتی دەستە و ناسنامەکان دەکات لەسەر بنەمای باوەڕ و بەها و ڕێکخستنێك کە ئەو دەستوورە مەدەنییە تەوافوقییە لەسەریەتی بۆ هەموان دیاریی دەکەن، پشت ئەستوورە بە ویستی گەل و دید و بەها و کێشەکانی و ناوەرۆکەکەی ئیسلامیی و مرۆییە و لەتەك سروشتی مرۆڤ و ئامانجەکانی ڕێکە، ویستی میللەت لەسەر بەڕێکردنی کارەکانی پیادە دەکرێت دەسەڵاتدار و حکومەت و یاسا تەنها جێبەجێکارن، نەك بەپێچەوانەوە.

## دژیەکی نیە لەنێوان شارستانێتی ڕژێمی ڕامیاری و خواست و بەها ئیسلامییەکان:

بەمە دەتوانین بڵێین نەگونجانێك نییە لە نێوان مەدەنیەتی سیستم و مرۆیەتی بەها و ئامانجەکانی لەگەڵ موسڵمانێتی میللەت و بەرزیی ئامانج و مەبدەئەکانی، هەروەها نەگونجانێك نییە لە نێوان ئیسلامیەتی دەوڵەت و ئینسانیەتیدا.کەواتە دەرئەنجامی سیستمی ئەم دەوڵەتە مەدەنییە ئیسلامییە مرۆییە ئەوەیە: زامنی ئازادیی بیروباوەڕ و سەلامەتی دەرهاویشتەکانە، پابەندبوونە بە دادپەروەری و خستنەگەڕی دەستگاکانی بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و پەروەردە و فێرکردن و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، بۆ خزمەتی میللەت، بەشێوەیەك میللەت باڵادەست دەبێت بەسەر حاکم و دەسەڵاتدا، حاکم و دەسەڵاتیش راپەڕێنەر و پێسپێردراو و پاسەوانی دڵسۆزی بەرژەوەندیی میللەت و کۆمەڵگە دەبن، بە هەموو چین و توێژەکانیەوە.

بە دروستبوونی سیستمێکی وەها، حکومەت و دەستگاکانی لە وڵات و دەوڵەتی میللەتی ئیسلامییدا ڕەنگدانەوەی ویست و خواستی گەلە، نەك

حکومەتێکی دوو ڕووی تاکڕەوی دیکتاتۆری گەندەڵ، خزمەت تەنها بە بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکات، یان حکومەتێکی کەهەنووتی و دیکتاتۆری گەندەڵ کە بە ناوی خواوەندەوە، کۆمەڵە خەڵکێك دەسەڵات بسەپێنن بەسەر میللەتدا بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندیی تاقمێکی سیاسیی دیاریکراو، چونکە هەموو ئەم جۆرە حکومەتانە لە کۆتاییدا دەسەڵاتێکی دیکتاتۆریی دەردەچن و دەبنە مۆڵگەیەکی بەهێز بۆ چەسپاندنی گەندەڵی و گەندەڵکاری و بەرژەوەندییە تایبەتەکان، لەگەڵ ئەمانەشدا مەسەلەی فرەڕایی و دەسەڵات گۆڕینەوە مەحاڵ دەبێت، وەك ئەمڕۆ دەبینین و سەرنجی حاڵی ئەو سیستمە تێکەڵە عەلمانی و ئایینە کەهەنوتییانە دەدەین، کە چۆن چنگیان گرتووە بەسەر کاروباری زۆربەی وڵاتە ئیسلامییە بەدبەختەکاندا و داهات و سامانیان تەخشان و پەخشان دەکەن.

## بەڕێوەبردنی ململانێی سیاسی لەدەوڵەتی مەدەنی ئیسلامیدا پێویستی بە توندڕەوی نییە:

گرنگ ئەوەیە بزانین لەم سیستمە مەدەنییە ئیسلامییەدا کە حکومەت و دەسەڵات هیچ شەرعیەتێکیان نییە، تەنها شەرعیەت و دەسەڵاتێك نەبێت کە لە میللەت و گەلەوە بە هەموو پێکهاتەکانییەوە وەرگیرا بێت، هیچ حکومەتێکیش نامێنێتەوە و حکومەتداریی ناکات تەنها بە ویست و ڕەزامەندیی میللەت نەبێت لەسەر بەرنامەو شێوەی راپەڕاندنی ئەو حکومەتە، بۆیە لەم سیستمەدا شەرعیەت و گوێڕایەڵی بۆ هیچ دەسەڵاتێك نییە، تەنها بۆ ئەو دەسەڵاتانە نەبێت لەناو میللەتو خواستەکانیانەوە

هەڵقوڵابن، لە حاڵەتی سەرەڕۆیی و لەڕێلادانیشدا "کە توندوتیژی لە ململانێی سیاسییدا نابێت هەبێت لەناو کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئیسلامییدا، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە (وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا جەنگیان لەگەڵ نەکەین؟ فەرمووی: نەخێر تا نوێژ دەکەن)"، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە میللەت و گەل (لە کاتی ناچاریدا) ئەگەر لە ئامۆژگاری و رەخنە شکستیان هێنا، ئیتر مافیان نییە سنوورێك بۆ ئەو سەرەڕۆیی و لادانی حکومەتە دابنێن، بەوەی میللەت بەرەکە لە ژێر پێی تاقم و دەسەڵاتدارە لادەرەکان دەربهێنێت، بە پەنابردن بۆ بەرگریی بە کۆمەڵ ڕێگەی مەدەنییانە، گرنگترین ڕێگاش بەبێ تێکدانی ئارامی کۆمەڵگە ناڕەزایی دەربڕین و خۆپیشاندان و یاخی بوونی مەدەنییانەیە، ئەمەش بۆ گەڕانەوەی مافەکان و ڕێگرتن لە ستەمکاریی و ڕاستکردنەوەی کەموکورتییەکانە، یان گەڕانەوەی دەسەڵات و شەرعیەتە بۆ شوێنی خۆیان، وەك لە فەرموودەکەشدا هاتووە (گەورەترین جیهاد وشەیەکی حەقە لە بەردەم دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردا) یان (گوێڕایەڵی هیچ بەندەیەك لە سەرپێچیکردنی پەروەردگاردا ناکرێت)، یان (گوێڕایەڵی پێویستە لەسەر هەموو کەسێك مەگەر فەرمان بە سەرپێچیکردن بدرێت، ئەوکاتە گوێڕایەڵی لەسەر کەس نییە)، یان (گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدا دەکرێت).

بەم تێڕوانینە ئاشکرایە کە (ئوممەتی ئیسلامیی) بە پلەی یەکەم بریتیە لە تێڕوانین و پەروەردە و بانگەواز و فێرکردنی ئیسلامیی، هەروەها دەوڵەت و دەستوور و حکومەتی مەدەنی لەناو ئەو میللەتەدا مرۆیی و ئیسلامییە، واتە ئیسلامییە بە ناوەرۆك و ناسنامەشەوە، وەمەدەنییە لەڕووی گونجان و

ڕێکخستنەوە، لەسەر ئەم بنەمایەش بواری جیاکردنەوە لە نێوان ئوممەت (وەکو ئاین و دید و پەروەردە و بانگەوان) لەگەڵ سیاسەت و ئاڕاستەی دەسەڵاتداردا دروست نابێت.

هەر بەم تێڕوانینەش دەردەکەوێت کە میللەتی ئیسلامیی، میللەت یان دەوڵەت یان حکومەتی دیموکراسیی ماددیی عەلمانیی نییە، کە ئایین تیایدا ونە، هەروەها میللەت و دەوڵەت و حکومەتی مارکسیی بێباوەڕی خۆسەپێن نییە، کە دژی ئایین بێت و بیڕوخێنێت، هەروەها میللەت و دەوڵەت و حکومەتی تێکەڵە (هجین)ی گەندەڵی دیکتاتۆریش نییە، کە ناسنامەی بزر کردبێت و ئایین تێیدا لە پەراوێزێکدا بێت و تەنها لە کاتی بۆنە و یاد و تازییەکاندا بیر بکەوێتەوە، هەروەك چۆن بۆ حکومەتە (کەهەنووتیە گەندەڵە دیکتاتۆرییەکە نییە ئایین بەکاربهێنێت بۆ بەرژەوەندیی تایبەت و تێرکردنی تاقمێکی تایبەت)، بەڵکو میللەتێکی ئیسلامیی بە ئاکارە، لە هەمانکاتدا دەوڵەت و حکومەتێکی مەدەنیی شورایی ئیسلامییە، بەرێکەوتن و هەرەوەز لەسەر چاکە و خۆپارێزی پێکدێت.

ئابەم گیانە هۆشیارییەی میللەت و ویست و خواستیەوە، کاروباری ئایین و بەهاکان بڵند رادەگرێت، دید و بیروباوەڕ و ئازادییە مرۆییە ژیارییەکان دەپارێزرێت، لە بەرژەوەندییەکانی میللەت و توێژەکانی گەل و چەوساوەکان پارێزگاری دەکرێت، سەرزەوی ئاوەدان دەکرێتەوە، دادپەروەری لەناو هەموو خەڵکدا دەچەسپێنرێت، هەموو ئەمانەش نایەتەدی کاتێك نەبێت کە گۆڕانخوازان لە گرنگیی دامەزراوەکان تێبگەن لەبەدیهێنانی وادە و بەڵێن و ئەرکەکانیان. گەر وانەبێت، ڕیفۆرمخوازان (إصلاحيون) زۆری

پێناچێت خۆیان دەکەونە ناو داوەکەوە و کۆتایی بە خۆیان و شوێنکەوتەکانی خۆشیان دێت و دوور نییە وەك خەڵکانی پێشوو ئەمانیش بەرەو ستەم و دیکتاتۆریەت بچن. لێرەوە بیریار و گۆڕانخوازەکان نابێت بەرنامە و هزرە و ئیسلاحییەکانیان تەنها لەسەر ئامانج و مەبەستی باڵاو هیواو وادەی رازاوە و تیۆری سۆزی جەماوەر بنیات بنێن.

بەڵکو پێویستە بنیاتی بەرنامەی خۆیان لەسەر ئامانج و مەبەستی باڵا و وادەی راستگۆیانە بنیات بنێن، کە پشت ئەستوورن بە کۆمەڵە دەستگایەکی کرداریی تێروتەسەل، لەوێوە جەماوەر توانای بڕیاردانی دەبێت و چاودێری راپەڕاندنیان دەکات، هەر جەماوەریش دەتوانێت چاودێریی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکات، بواری دیکتاتۆریەت نەدات، دەسەڵاتەکانیش هەموو لە دەستێکدا خڕ نەکاتەوە، یان نایخاتە چەند دەستێکەوە بەبێ لێپرسینەوە و چاودێری، کە بەویستی خۆی هەڵسوکەوت بکات بەبێ چاودێر، پاش ئەوەی دەست دەداتە شێواندنی رۆشنبیری و گەوجاندنی میللەت بە پرۆگرام و شێواز و هۆکاری پەروەردەیی و فێرکاری و ڕاگەیاندن کە خۆی بەڕێوەی دەبات و پیاوانی دەسەڵات و شوێنکەوتە و کاربەدەستە گوێڕایەڵەکانیان کۆنترۆڵیان دەکەن، کە لەڕاستیدا جگە لە بەدیهێنانی مەرام و بەرژەوەندی و بەردەوامی دەسەڵات و گەندەڵیان گرنگی بە هیچ شتێکی دیکە نادەن.

جا پێویستە میللەت لە بازنەیەکی خەیاڵی بەتاڵدا نەسوڕێتەوە و نەکەوێتە داوی خەونی بەربڵاو و کەراماتی بێبەڵگەوە، چونکە گەشە و ئاوەدانکردنەوە و قەڵاچۆکردنی گەندەڵی و دیکتاتۆری و هەژاری و ستەم،

بە خەیاڵ ناکرێن، بەڵکو پێویستی سەرشانی بانگخوازان و بیریاران و ڕابەرانە، کە مەبەستیانە میللەت ئیسلاح بکەن و خەبەریان کەنەوە، بەڵکو لەسەریانە بەراوردی سەرکەوتوویی و خزمەت بە ئەنجامی کارەکان بکەن نەك بە لاف و گەزاف، پشت بەو قسە شیرینانە ببەستن کە هیچ دەستگایەکی جێبەجێکاریان بۆ دانەنراوە، تەنها سیاسییە قسەزان و خاوەن بەرژەوەندییەکان وادەی دەدەن، کە وەکو بەنج بەکاریدەهێنن بۆ سڕکردنی میللەت و گەلان، بەتایبەت ئەوانەی هۆشیار و رۆشنبیرنین و دەستگاگەلێکیشیان نییە بۆ چاودێریی ڕاپەڕاندن و ڕێگرتن لە زیادەڕۆیی.

ئەگەر سەرنجی ئەدەبیاتی تاقمە سیاسیی و ڕۆشنبیرەکانی سەر بە دەسەڵات ـ ئایینی یان نا ئایینی ـ بدەین، بە درێژایی مێژوو دەبینین خاڵی هاوبەششی نێوانیان زیادەڕەوییە لە وادەی قەبە و قسەی لوسکردن، ئەم تاقمانە کۆکن لەسەر قسەی شیرین و وادەی درۆدان و هەوڵی خەیاڵیی بۆ ئیسلاحکردن و دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی دادپەروەری و ئاوەدانخواز، بنەبڕکردنی گەندەڵی، قسەی بۆشکردن لەسەر پلانی گەشەپێدان و چاککردنی بواری فێرکردن و تەندروستی، داهات کۆکردنەوە، ڕامالینی هەموو هۆیەکانی هەژاری و نەخۆشی، بوژاندنەوەی پیشەسازی و بازرگانی، بە کورتی هەر شتێکیان بەخەیاڵدا دێت و بیروهۆشیان بەلایدا دەچێت، ئیتر وادەی پێدەدەن و دەیخەنە ئەستۆی خۆیان.

کەچی ئەم تاقمە دەڕوات و ئەویان دێت، ئەم حکومەت دەڕووخێت و حکومەتێکی دیکە دادەمەزرێت، دەوڵەت لە دوای دەوڵەت دروست دەبێت، قسەی لووس و وادە و بەنجکردن هەر بەردەوامە، بێئەوەی هیچ

دەستگایەکی دەستووریی بۆ ڕاپەڕاندنیان ڕێکخەن، ڕۆژانە وادەکانیان دووبارەی دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی ئەو قسە و بەڵێنانە هیچ شوێنەوار و کەڵکێك بە حاڵی ئەو گەلانە بگەیەنێت، چونکە دەستگا و ئالیەتێ جێبەجێکردنیان نییە، بۆیە هەمیشە لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەچن.

تاوەکو لە هۆی ئەوەش نەگەین کە ئەم ڕژێم و دەسەڵاتدارانە ـ بە چاوپۆشی لە ئاراستەی ئایینی و نائایینییان ـ بۆچی دەگەنە ئەو دیکتاتۆرییەت و گەندەڵی و گەندەڵیکردنە، کە مێژوویەکە پێیەوە دەتلێینەوە، ناتوانین سنوورێك بۆ ئەو خولانەوە بێهودەیەی جەماوەر لەو بازنە بۆش و بێ کەڵکانەدا دیاری بکەین، هەرچەند ناو و سیستمەکان دەگۆڕێن و ڕووکارەکان ئاڵوگۆڕ دەبن، بەڵام هەروەك خۆیان ماونەتەوە.

## پەروەردە و هۆشیاری پاشان پەروەردە و هۆشیاری:

گرنگترین هۆی ئەم دیاردە ترسناکە شەیتانیەش، ناهۆشیاری و بێئاگایی جەماوەرە لەو ڕێباز و بەرنامانەی کە ڕێڕەوی حکوومەتەکان ڕێکوپێك دەکەن و سنوور بۆ دیاردەی لێکئالانی گەندەڵی و دیکتاتۆری دادەنێن.

ئەم دیاردە ترسناکەش هیچ لەمپەرێك بەرەو ڕووی ناوەستێت و ناتوانێت ڕیشەکێشی بکات، جگە لە پێکهێنانی کۆمەڵە دامەزراوەیەکی دەستووریی کارای تێروتەسەل، کە کار و کارگێڕییەکان ڕێك بخات، دەسەڵاتەکان لێك جیابکاتەوە و سنووربەندیان بکات، کۆمەڵە یاسا و سیستمێك داڕێژێت کە سەلاحیات و پسپۆڕی و بوارەکان دیاری بکات، هەروەها لێپرسینەوە و چاودێریی لەخۆبگرێت، ئەگەر بەم شێوەیەی لێبێت بڵاوبوونەوەی گەندەڵی

سەخت دەبێت و دەسەڵاتیش لە دەستێك یان چەند دەستێکی دیاریکراودا کۆنابێتەوە، کە هەر خۆیان بیبڕێن و بیشیدوورن، ئەو کاتەش حەز و ئارەزوو و بەرژەوەندیی تایبەت هەرگیز نابنە دارێژەرەی سیاسەت، وە دەستدرێژیەکانیش بەبێ چاودێر تێناپەڕن.

خاڵی دەستپێکردنی ئەم چارەسەرەش هۆشیاربوونەوەی میللەتە، لە بایەخداریی دەزگاکانی یاسارێژیی و ڕاپەڕاندن، لێپرسینەوە و چاودێریی، پەروەردە، فێرکردن و راگەیاندن، چونکە لە کۆتاییدا ئەوە میللەتە ـ بە هۆشیاریی خۆی و بوونی ئەم دەستگایانەوە ـ دەبێتە گرنتیدەری ڕاپەڕاندنێکی دروست، هەر ئەویشە کە دەستگاکان وەها کارا دەکات، کە بەشداربن لە دامەزراندنی بنکەی جەماوەریی و کارایان دەکات لە رێنمایی رێڕەوەکەیدا، کەواتە هۆشیاریی میللەت و دەزگا جیاوازەکانی بە فەرمی و نافەرمییەوە، ئەمانە خاڵی دەستپێکردنن، هەر ئەمانەشن وا لە جەماوەر دەکەن ببنە جەستەیەکی رێکخراوی پتەو و یەکگرتوو، کە بەبێ ئاگاداری و راوێژ و رازیبوونی ئەو هیچ شتێك ناکرێت، رێگەش نادات بە هۆی بوونی ئەو رێکخراوانەوە ئەندامەکانی میللەت تاك بکرێنەوە، بەڵام گۆشەگیر و بێدەسەڵات و تەرا بکرێن لە یەکتری و بیانکەن بە ڕانە مەڕێك و چۆنیان ویست وا لێیان بخوڕن و نەهێڵن بزانن لە دەوروبەریان چی روودەدات.

بۆیە هۆشیاریی میللەت و دامودەزگاکانی، ئەو قەڵغانەیە کە میللەت و بەرژەوەندییەکانی پێ دەپارێزێت و ناهێڵێت خاوەن بەرژەوەندییە تایبەتەکان، بەهۆی زۆر و لێزانینی خۆیان، میللەت فریو دەن و سەریان لێبشێوێنن بەهۆی نەبوونی دامەزراوە گشتی و ئەهلیەکانیەوە یان بەهۆی

لاوازیەکەیەوە یان لاوازی ڕێکخستنیەوە وە تەماویبوونی دەسەڵات و بوار و سەربەخۆییەوە.

بەو شێوە ئێمە دووپاتی دەکەینەوە کە ڕێگای جێبەجێکردنی پرۆژەی ئیسلاحی سیاسی ئیسلامی، لە هۆشیاریی بیرمەند و پیاوانی ئیسلاحی ئیسلامییەوە دەستپێدەکات و هەنگاو دەنێت وە بە سووربوون و کۆڵنەدانیان پشت بەست بە دیدگا دروست و خواست و چەمکەکان کە ئامانجی بەهێزکردنی ئوممەتە لە بونیادنانی کۆمەڵگەی دادپەروەر و ئاوەدانی موسوڵمان ئەویش بە بونیادنانی ئەو دامەزراوانەی کە لێهاتویی بەدی دەهێنن وە دەرگا بەڕووی دیکتاتۆریەت و گەندەڵیدا دادەخەن.

## پێشەنگە شیاوەکان بۆ ڕاوێژی کۆمەڵگە:

لێرەدا مەسەلەیەك ماوە کە دەبێتە ئەرکی بیریار و پەروەردەکار و ئیسلاحییەکان کە بە لێکۆڵنەوەی زانستیانە لێیبڕوانن، تا بڕیاری لەسەر بدەن، بە گوێرەی حاڵی هەر میللەت و وڵاتێکی ئیسلامیی لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە چۆنی بۆ بلوێت بڕیاری لەسەر بدەن، مەسەلەکەش دیاری کردنی ئەو تەمەنەیە کە هاووڵاتی تیایدا بەشداری لە دروستکردنی بڕیاری سیاسیی و تەشریعیدا دەکات، بەتایبەت مافی دەنگدان و کاندیدبوون، ئەمەش بۆ ئەوەی لەو پشێوییەی کە لە سیستمە دیموکراسییە ڕۆژئاواییەکاندا بڵاوە، قوتار بین، چونکە بەرژەوەندیخوازان ئەو پشێوییەیان قۆستۆتەوە تا لەو ڕێگاوە کۆمەڵێك سەرکردەی خراپی گەندەڵ

بەرهەم بهێنرێت تا فریودان و ئاراستەکردن و فشارخستنە سەریان ئاسان بێت، وەك حاڵی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی ئەمڕۆکە دەبینین.

لە گرنگترین ڕێگاکانی ئەم ئاژاوە و ساختەکردنە دیاریکردنی تەمەن و باج دانە، کە کراوەتە پێوەر بۆ دیاریکردنی مافی دەنگدان، ئەمەش وایکردووە بڕیاری سیاسی لە ژێر تیشکی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی خاوەن بەرژەوەندیدا بدرێتە دەست خەڵکێکی سیاسی گەندەڵ و خاوەن بەرژەوەندیی تایبەت، لە ڕێگای دەنگی زۆرینەوە لە زۆر وڵاتدا، ئەمانەیش لە خەڵکێکی هەرزە و منداڵکار پێکهاتوون، کە لە کاروباری ژیان و کۆمەڵگە هیچ تێناگەن، تەنها لە خەمی هەوەس و ئارەزووە سەرشێتەکانی خۆیاندان، ناشتوانن لە قووڵاییە ڕۆحی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان تێبگەن کە چ کاریگەرییەکی ستراتیژییان لەسەر کۆمەڵگە دەبێت، بۆیە دەکرێنە هۆی بازرگانیی ئارەزووپەرستی و بەرژەوەندییە تاکەکان، تا حەزە ئاژەڵییەکان تەشەنە بکات، ئەمەش بۆ داڕووخانی کۆمەڵگە و لێکترازانی ئەندامەکانی سەردەکێشێت و بەهاو ئاکاری کۆمەڵگە لەناو دەبات. خۆ ئەگەر ئەمە لە کۆمەڵگەی مادديدا قبوڵبکرێت، کە زۆرینە تیایدا رادەکێشرێت بۆ بەدیهێنانی یەرژەوەندییە تایبەتە ناوچەییە تەسکەکان، ئەوا هەرگیز لە کۆمەڵگەی ئیسلامیی خاوەن ڕەوشت و ڕۆحیەت بەرزدا هەرگیز جێگەی نابێتەوە.

بۆیە سروشتی سیستمی شارستانی مرۆیی ئیسلامی وا دەخوازێت کە تەمەنێکی گونجاو بۆ دەنگدان دیاری بکرێت، دیاریکردنەکەش لەسەر بنەمای هۆشیاریەك دەبێت، کە بتوانێت بە ئامڕازە دروستە داڕێژراوەکان چەند بەرژەوەندی تێدایە لەوەندەدا ئەنجام بدرێت، هەموو لایەنەکانی ژیانی

کۆمەڵایەتی ئیسلامییش ڕەچاو بکرێت، وەك مانای کۆمەڵگە، مانای خێزان، پاراستنی ئەخلاقی خێزان و منداڵ، پاراستنی مافی ئافرەت، ڕێگرتن لە بەدڕەوشتی و دەستدرێژیەك کە بەدڕەوشتی بڵاودەکاتەوە، ئەخلاق تێکدەدات و خێزان دەڕوەخێنێتو پەیوەندییەکان کز دەکات و بناغەکانی کۆمەڵەکە دەڕووخێنێت.

جا بۆ ئەوەی لاوازیی هۆشیاری و زاڵبوونی ئارەزووی ڕاگەیاندنە بازاڕییەکان و بەرژەوەندییە مادییەکان زاڵنەبن، پێویستە واقیعی بین، چونکە لە سایەی ئەم ژیانە نوێیەدا دەبینین نەوەی تازە پێگەیشتوو بە خوێندنەوە لە بیستو یەك ساڵ تێدەپەڕێت هێشتا نەچووەتە بازاڕی کار و هاوسەرگیریی ئەنجامنەداوە، هێشتا خەریکی خوێندنە، واتە لە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نەگەیشتووە، بۆیە دابەزاندنی تەمەنی دەنگدانی سیاسیی لە بیستو یەك ساڵییەوە بۆ هەژدە ساڵی، بێگومان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەدا نییە بە گشتیی، بەڵکو لە بەرژەوەندی ئەوانەدایە تەمەنی هەرزەکاریی و نەوجەوانی دەقۆزنەوە بۆ تێکدان و سەرلێشواندن و بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و بازاڕی بازرگانی خراپی خۆیان گەرمدەکەن، تا سەرکردایەتی نەشیاو و پێنەگەیشتوو بەناوی جەماوەرەوە هەڵبژێرن، بە بێ هۆشیاری ئەوەی کە ئەوان تەنها بۆ خزمەتی بەرژەوەندی خۆیان و بازرگانییکردنە نامەشرووعەکانیان و خۆشکردنی ئاگری شەڕی ناو میللەتان ئەم بەرنامەیەیان داڕشتووە.

بێگومان سروشتی کۆمەڵگەی موسڵمان و سروشتی ئامانجەکانی، پێویست دەکەن کە خزمەتی نەوجوان و هەرزەکاران لە لایەنی ماددی و

مەعنەوییەوە بکرێت تا پێدەگەن و بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و شارستانییە ئاوەدانخوازییەکەیان هەست پێدەکەن، ئەمەش بە بۆچوونی من لە زۆربەی کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا نایەتەدی، تا لاوان تەمەنیان دەگاتە بیستەکان، کەوا دەزانم تەمەنی بیستو پێنج ساڵی نزمترین و گونجاوترین تەمەنەو لەگەڵ سروشتی سیستمی شارستانیی ئیسلامیی و ئامانجەکانی پێکدێتەوە، تا ئەو لاوانە شایستەی دەنگدانبن لە کاروباری گشتییدا، مەگەر بە شێوەیەکی زانستی لەناو سیستمی ئیسلامییدا تەمەنێکی دیکە بسەلمێنرێت، چونکە ئەم تەمەنەی لاوان ئەگەر هاوسەرگیریشیان ئەنجام نەدابێت و خێزانیشیان پێکەوە نەنابێت، بەڵام دەیگەیەنێتە بازاڕی کار و هەست بە بەرپرسیارێتی کردن و تێگەیشتن لە بوارە جیاوازەکان، دەشبێت دیاریکردنی تەمەن و دەنگدان لە سیستمی سیاسیی ئیسلامییدا لەبەر هەستیاری رو هەستیاریی دەرەنجامەکانی، تەنها چاولێکەری سیستمە سیاسییەکان نەبێت لە شارستانییەکانی دیکە، چونکە سروشتی سیستمەکانی دیکە جیاوازە لە سروشتی سیستمی ئیسلامیی، هەروەها بەرپرسیارێتی و بایەخ پێدراوەکانی جیاوازە لە سیستمەکانی دیکە، بۆیە دەبێت تەمەن دیاریکردن جێگەی لێکۆڵینەوە و وردکردنەوە و هەڵسەنگاندنی جیددی بێت لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا، بۆ ئەوەی دڵنیابین کە بڕیارەکە بە ئەنجامی بەشداربوونێکی پێگەیشتوو و هۆشیارانەمان دەگەیەنێت لە دروستکردنی بڕیاری سیاسییو کۆمەڵایەتی ئیسلامییدا، بە شێوەیەك کە لە دەرەوە و ناوەوە خزمەت بە میللەت و کۆمەڵ و خێزان و تاکەکانیش بکات، لە دیدگایەکی دادپەروەرانەو پێکەوەبوونی نێوان تاکەکانی میللەت و

مرۆڤایەتیش بە گشتیی. بۆیە ڕێگە نادرێ بە دەستدرێژیکردنە سەر مافی خەڵکانی بێ دەسەڵات و هەر مرۆڤێکی تر هەروەك ڕێش نادرێ بە ئاژاوەگێڕی و پلانی لادەرانە کە ئوممەت گومڕا دەکەن بۆ ئەوەی لە بێئاگاییدا سەرجەم بنەما و پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و ئاکاریەکانی کۆمەڵگە لەناو بچێت.

## لەکوێوە دەست پێ بکەین: بەرپرسیارێتی بیریار و پەروەردەکاران:

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، پرسیارەکەش ئەوەیە: میللەت لە کوێوە ئەم پرۆسە چاکسازییە دەستپێبکات؟ کادرانی چاکسازیی ئیسلامیی ئەم پرۆسەی ڕابوون و چاکسازی بونیاتیانە لە کوێوە هەنگاو بۆ بهاوێژن؟ چۆن چۆنی دیکتاتۆریەت و گەندەڵی لە یەکئالاو لە بیر و ناخی میللەتدا قەڵاچۆ دەکرێت؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەو بابەتانەی باسمانکرد، وەڵامەکە ئەوەیە: یەکەم هەنگاو لە لایەن بیریار و پەروەردکارانەوە دەستپێدەکات، بەوەی جیهانبینی و دیدی گەردوونی و شارستانی ئیسلامیی روونبکەنەوەو بە تەواوی نیشانیانبدەن، تا لە بیروهۆشی میللەتی موسڵمانەکاندا ئەمە دەچەسپێت و بە هەڵێنجراوێکی قورئانی دەزانن، تێشدەگەن لە سروشتی جێنشینی سەرزەویی مرۆڤ و ئەرکی ئاوەدانکردنەوە و ژێربارخستنی، هەموو وزەکان بە خەرج دەدەن لە پێناوی ئاوەدانکردنەوەکەدا. چونکە ئەم دیدە قورئانییە لە راستیدا بەرجەستەکردنێکی (مانای مرۆڤە) و دەرککردنە بە حەقیقەتی سروشت و وزە و تواناکانی مرۆڤ، هەروەها تێگەیشتنە لە ئامانج و بوونی مرۆڤ و ئەرك و ڕۆڵی لەم گەردوونەدا.

ئەم دیدە گشتگیرە قورئانییەش بە هیچ شێوەیەك زۆركاریی و كۆڵێك نییە كە لە سروشتی چاكەخوازی مرۆڤ و یاساییبوونەوە دووربن، واتە دیدی ئیسلامیی بۆ مرۆڤ و بوونەوەر و ژیان كە لە راستییدا خۆدۆزینەوە و ژیان فێربوونی هەردوو دنیایە.

بێگومان دەرخستنی ئەم دید و جیهانبینیە ئیسلامییەو و ماڵینی تەپوتۆزێك كە ڕووخساری ئەم جیهانبینیەی داپۆشیوە، پێویستی بە چاكسازیی بەرنامە و شێوازی پەرورده و پاڵفتەكردنی كەلتوورە.

ئەم سەرەتای داڕشتن و پتەوكردنەی پایەی دید و هۆشیاری و چاكسازییە لە باوەڕ و زانست و پەروەردەدا، كە میللەت بەخۆبەخشانە پشتیوانی ماددی و مەعنەوی دەكات، ئەمە ئەركی بیریار و پەروەردەكارانە، هەروەها ئەركی هەموو توێژە چاكەخوازەكانە كە خۆیان بە پشتیوانی بزووتنەوەی چاكسازیی ئەو بوارانە دەزانن، ئەم دیدە بگەیەننە جەماوەر، هەر لە خێزان و باوك و دایكەوە كە بە سروشتی خۆیان زیاتر خەمخۆری ڕۆڵەكانیانن و بەردی بناغەی دەستپێشخەری گۆڕان و چاكسازین، تا دەگاتە قوتابخانە، مامۆستا، پێشنوێژ و وتارخوێنانی مزگەوت، هەروەها كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و فێركردن بە هەموو لق و پۆپەكانیەوە.

بەو شێوەیە لە هەموو بوارەكانی فیكری و كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی و ئاوەدانكردنەوەدا، بنكەیەكی بەهێز دروست دەبێت بۆ بەرەو پێشبردنی بزووتنەوەی چاكسازیی و گۆڕانكاریی و دامەزراوەیی گشتگیر و تێروتەسەل، چونكە ئەگەر خەڵكەكە دەركیان بە ناوەرۆكی كەموكورتییەكە كرد و ڕێگەی چاكسازیشیان دۆزیەوە، لە ئامرازەكان گەیشتن بەدیلیشیان

دەستكەوت، خێزان و مامۆستایان و ڕاگەیاندنكاران (واتە كادرانی جەماوەر) بە تەواوی لەو هاوكێشانە حاڵیبوون، ئەوكاتە گۆڕانكاری و چاكسازی و ڕاستەرێگرتنەبەری كاروان دەستپێدەكات و دەبێتە سەرەتایەكی مسۆگەر و ئەنجامەكەشی هەر مسۆگەر دەبێت (لا یغیر الله ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم) (من شب علی شئ شاب علیه) (كما تكونوا یولّ علیكم).

بەراستی بەبێ هەوڵی بیریار و پەروەردەكار و چاكسازەكان و خەمی باوك و دایكان، هەرگیز میللەت و جەماوەر رێگە دەرناكات و توانای پێگەشتنیشیان نییە، چونكە پشتبەستن لە پێگەیاندندا بە سیستمە دیكتاتۆرە گەندەڵە فەرمی و نافەرمیەكان بۆ چاكسازی و گۆڕانكاری، كەڵكێك نابەخشێت، چونكە ئەم دەزگایانەی پێگەیاندن لە هەموو دەسەڵاتێكدا هەوڵی هێشتنەوە و بەهێزكردنی ئەو حاڵەتە چەسپاوە دەدەن كە هەیە، نەك گۆڕینی. ئەو دەزگایانەش هەر گۆڕانكارییەك ئەنجامدەن بۆ بەهێزكردنی ئەو رژێمە و حاڵەتە چەسپاوەكەیەتی نەك گۆڕینی، كەواتە تەنها بیریار و پەروەردەكار و چاكساز و باوك و دایكانن دەتوانن كلیلی دینەمۆكە ئیش پێبكەنو بزووتنەوەی گۆڕانكاری لەناو كۆمەڵگەدا دەستپێبكەن دەتوانن كاروانەكە ڕێنموونی بكەن، دید و جیهانبینی و ڕێبازی بیر و پەروەردەكردن سەرلەنوێ بنیاتبنێنەوەو پاڵفتەی كەلتوور بكەنەوە.

دوای ئەو كارەیان دەزگاكان و شێوەی ژیانی راست و دروست لە دەرەوە و ناوەوە دابمەزرێننەوە، هەنگاوی دووهەمیش بە گۆڕینی كادرانی سیستمەكان و ناوەرۆكی دەزگاكان دەبێت، تا گەیشتن بە ئامانجەكانی

میللەت، بە ورە بەرزکردنەوە و گەشەپێدانی وزەی رۆڵەکانی، ئەوکاتە میللەت ڕۆڵی شارستانی و چاکخوازیی خۆی بەدەست دەهێنێتەوە.

کەواتە دەستپێکردن لە چاکسازی دید و بیر و ویژدان و پاڵفتەکردنی کەلتوورەوە دەستپێدەکات، بە چاکبوونی ئەو دیدە و تەندروستبوونی بیر و پاڵفتەی کەلتوورەوە، کاروانەکە دەکەوێتەڕێ و رەوڕەوەی ژیان دەگۆڕێت، ئەوکاتەیش ئامانجەکانی میللەت لە برایەتی و یەکسانی و دادپەروەری و بانگەوازی خێر و ئاشتی بە دیدێن و ڕێگاکانی خۆشگوزەرانی و هاوکاری لە پێناوی بنیاتنان و ئاوەدانکاری و داهێناندا زۆر دەبن.

## پێشەکی:

هەموومان دەزانین کە ڕابوونی ئوممەتان وگەلان و تواناکانیان بە پلەی یەکەم پشت بەتواناو دڵسۆزی و زانست و سووربوون و بەردەوامی و چاکەکاری ڕۆڵەکانی دەبەستێ، وە هەر چاکسازی و ڕابوونێك مرۆڤ وا لێ نەکات کە ئامانجەکەی بریتی بێ لە جۆری ڕۆشنبیرییەکەی و پڕۆگرامی بیر و پەروەردەی ویژدانی و گەشەپێدانی تواناکانی، ئەوا بێگومان هەوڵ و کۆششەکەی بەفیڕۆ دەڕوات. ئاستەنگی دڵسۆزی و کۆشش، وە ئاستەنگی زانست و توانا و کار و جوانی مرۆییانە، تەنها لەناو چەندێتی دا نەشاراوەتەوە، بەڵکو بە پلەی یەکەم لە جۆرایەتیەکەیدایە، وە ئایا کۆششکردن و ڕەنجی بەڕێکراو لە ڕاستیدا کۆششێکی خێرییانەیە بەرە و گیان و ڕۆشنایی؟ واتا ئایا بە ئاڕاستەی خێرو هەق و دادپەروەری و گرتنەخۆ و میهرەبانی و ئاشتییە؟ یان کۆششێکی شەڕخوازانەیە لەپێناوی شەوەزەنگ و تاریکی دا؟ واتا لەپێناوی ستەم و دڵڕەقی و زاڵبوون و دوژمنایەتیدایە؟

ڕابوونی ئوممەتی ئیسلامی و دووبارە ڕۆڵپێدانەوەی لە مێژوودا پێویستە، بۆ ئەوەی ببێتە ئوممەتێکی بە توانای باوەڕدار، بانگخواز بۆ ڕێگەی خێر، کۆششکار بۆ دادپەروەری و هەوڵدان، سەرخەری هێزەکانی گیان و ڕۆشنایی بێت لە بنیاتنانی ناخ و دەروونی مرۆڤەکاندا، لە ڕووبەڕووبوونەوەی حەزە ئاژەڵیە ماددیە قوڕینەکەدا، کە بووەتە مایەی ستەم و دەماریگری و خۆپەرستی و سیاسەتی ژێر چەپۆکنان و داڕماندنی بەشێکی زۆری ڕەوشتە کۆمەڵایەتیی و خێزانییەکان لەدەروونی مرۆڤەکاندا.

لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە وردەکار بین لەوەدا کە پڕۆژەی ڕابوونی ئوممەت پڕۆژەیەکی چاکسازییانەی مەرجدارە بەوەی کە دەبێ مرۆڤ ڕاگرە بنەڕەتیەکەی بێت و دەبێ گۆڕانکاری و چاکسازی لەکەسێتی مرۆڤی موسڵمانەوە –خۆی– دەست پێبکات، هەروەها چاککردنی هەر شتێککە ئەم کەسێتیەی لەسەر بەندەو لابردنی هەموو لایەنە دزێوو ناهەموارەکان تیایدا، چونکە ئەگەر تێڕوانینی ئەم مرۆڤە گەردوونییە شارستانییە ڕاستکرایەوە، وە پڕۆگرامی هزر و ڕۆشنبیریەکەی ڕاست کرایەوە و شێوازەکانی پەروەردەکردنی چاك و ڕاستکران لەسەر بنەمایەکی تۆکمەی زانستییانەو هاوگونجا و لەگەڵ یاسا گەردوونیە خوداییەکان، بە گیانێکی دادپەروەری و هەقخوازانەوە، وە بە گیانێکی پڕ لە کۆشش و خۆشەویستی، وە بەسەر ڕشتەکردنێکی وردو بژارکراو لە هەموو بەڵایەکی نەفامی و لەخۆباییبوون، وە هەموو بەڵایەکی خورافەو ئەفسانە و فرت و فێڵ وجادوو خراپ تێگەیشتن، ئیتر ئەوسا ئوممەت دەچێتەوە سەر شاڕێگەی دادو چاکسازی، وە تەنها هەر بەوانە کۆششی ماندووبوون و گۆڕانکاری و سەرکەوتن لە ڕابوونی ئوممەتدا دێتە دی و ڕۆڵە پێشەنگیە چاکسازییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە و مرۆڤ دەگاتەوە بە ئاوات و ئامانجە گرنگەکەی و ڕۆڵی بنیاتنەرانەی لە ئیسلامخوازی و کاری چاکەدا لەسەر زەوی.

بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەش، ئەوا یەکەمین ڕێگە کە دەبێ بیگرینە بەر ئەوەیە کە لە بیرمەندان و هەوڵە بیرخوازیەکانیانەوە دەست پێ بکەین بۆ دووبارە گێڕانەوەی تێڕوانینی ڕاستەقینە بۆ ڕوون بینی دەربڕینی عەقیدەی ئیسلامی وەك بنیاتنەرێکی شارستانیەت و کاراکردنی وتارەکەی لە پانتایی

گۆڕەپانی چاکسازی پرۆگرامی هزری موسڵمان و بیرکردنەوەکانیدا، وە لە پاکژکردنی ڕۆشنبیری و ڕاستکردنەوەی شێوازەکانی پەروەردەدا.

ئەوەی باسمان کرد، وامان لێ دەکات کە بزانین ڕۆڵی زانکۆکان و دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا و مامۆستایانی زانکۆ زۆر گەورەیە لە پێگەیاندنی کادری پێویست، وە زانکۆ ڕۆڵێکی بنچینەیی هەیەو خاڵی دەست پێکردنی بنەڕەتییە لەچاکسازیدا، وە لەگۆڕانکاری جۆرایەتیدا، چونکە زانکۆ و مامۆستایانی زانکۆ، ئەودوو بنەما گرنگەن کە بەردی بناغە دادەنێن لەسەر ئاستی ئوممەت، بەوەی کە کادری کارو سەر ڕشتەی جەماوەری بەرهەم دێنن، چونکە هەر ئەو دوانەن کە دەتوانن تێڕوانینی بیرمەندە چاکسازەکان دروست بکەن لەسەر ڕووپەڕی پرۆگرامە زانستیە ئەکادیمیەکان بۆ پێگەیاندنی کادری کۆمەڵایەتیانە لەناو ئوممەتداو فێرکردن و ڕاهێنانیان، هەر ئەم کادرانەشن کە لە ڕێی خۆیان و ئەرکەکانیانەوە لەناوجەرگەی کۆمەڵدا و لەناو دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان دا بەرپرسیارێتی لەئەستۆ بگرن، ئەمەش لەسەر ئاستی ئوممەت و جەماوەر و دامودەزگاکانیان، جا ڕاستەوخۆ بێ یان نا ڕاستەوخۆ، ئەمانەن کە تێڕوانینی گەردونیانەی کۆمەڵگە ڕاست دەکەنەوەو باربۆی دەکەن بە ئامێرو هۆکاری کرداریانە، وە ئەدەبیاتی پەروەردەی ڕاست و دروست دادەڕێژن، کە ئەمەش زۆر گرنگە بۆ دایکان و باوکان و ئەوانیش ڕادەهێنن و ئامادەیان دەکەن بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانیان لە پەروەردەکردنێکی ڕاست و دروستی نەوەکانیاندا، بە جۆرێکی ئەوتۆ گۆڕانکاری و گواستنەوە لە جۆرایەتی ویستراودا بەرپا بکات، بە دووبارە پێکهێنانەوەی تێڕوانینی گەردوونی لە نەوەکانی دوارۆژداو

هەڵسەنگاندن و دانانی پرۆگرامی بیرکردنەوە بۆیان و دیاری کردنی دەرچە ڕۆشنبیریەکانیان و چاککردنی بونیادی ویژدانیان و خواست و ئاواتە بەرز و پاکەکانیان. کاتێك پرۆژەی ئیسلامی چاکسازیکردنی پێگەیاندنی نەوەکانمان تەواو کرد، لەڕووی تێڕوانینی هزری و ڕۆشنبیری وزانستی و ویژدانیەوە، ئەوا ئەو پرۆژەیە دەبێتە بناغەی بنەڕەتی بۆ بنەما ویستراوەکەی بوتیاتنانەوەی مرۆڤی موسڵمان، وە کۆمەڵگەی موسڵمان، وە خستنە سەر ڕاستە ڕێگەی ئوممەت بۆ بەکارخستنی توانای شارستانییانەی پڕ لە خێرو بێری ئەوتۆ کە کۆشش بکات بۆ تازەکردنەوەی شارستانێتی مرۆڤایەتی و چاکسازی کاروانەکەی و ئاڕاستەی ڕەوتەکەی.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەم بەشەی باسەکەمان دەچێتە ناو تاوتوێکردنی ڕۆڵی خوێندنی باڵا لە بنیاتنانی ڕێگەی کاروانی پرۆژە چاکسازییە ئیسلامییەکە، وە ئەو شتانە دەخاتەڕوو کە تەواوکران لە بواری پەرەپێدانی پلانی فێرکاری زانکۆیی و لەلایەکەوە گێڕانەوەی یەکانگیری مەعریفەی ئیسلامی و لەلایەکی تریشەوە بژارکردن و پوختەکردنی ڕۆشنبیری و ڕاست کردنەوەی ڕەوتی پەروەردەیی ویژدانی و ئامادەکردنی دایك و باوکان لەلای سێهەمەوە، ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا کە بەشێوەیەکی کارا و کردارییانە بونیادی نەوەی موسڵمان بنرێت، بە جۆرێکی وا چێژ وەربگرێ لە تێڕوانینە گەردوونییە بونیاتنەرە شارستانییەتە پاکژکراوەکە لەو نەخۆشیانەی ڕوویان کردووەتە پێناسەکەی و وای لێ کردووە کە هۆگربوون بە پابەندیەوە لاواز بکات بە وابەستە بوونی بە ئوممەتەکەیەوە و ڕەهەندە گشتییەکانی کەسێتی موسڵمان بزر بکات و دامەزراوە گشتیەکان دابڕمێنێت و گیانی خۆپەرستی

بڕوێنێ لە تاکەکاندا و وابکات کە بەردەوام ئەم کەسە بە درێژایی ژیانی تەنها چاو ببڕێتە تیکە نانی ژیان، لەو بارەشدا خودبینی لە وەرگرتن و گەلاڵەکردنی زانیاریدا -بە شێوە ڕاستەقینەکەی- هەڵبوەشێتەوەو مانای ڕاستەقینەی (خود) بسڕێتەوە، چونکە (خودبینی) نایەتەدی بەو هەوڵ و بەخشینە نەبێ کە تاکو زیاتر بێ بەهای (خود)یش زیاتر دەکات چ لە ڕووی واتاو چ لە ڕووی بەرژەوەندی و دەستکەوتیشەوە، وە لەبەرئەوەی مانای ڕاستەقینەی ژیان ئەوەیە کە بەردەوام بژین و بمێنین تاکو خێروبێر و هاوکاری ببەخشین و وا لە (خود)ی خۆمان بکەین کە ببینە کەسێکی بەنرخ و سودبەخش، دەلالەت و مانامان هەبێ، واتە (بون)مان ماناداربێ، ئەگەر بەو مانایە نەڕوانینە ژیان ئەوا دەژین تەنها بۆ ئەوەی گەدەمان پڕ بکەین و وەرگر و سوالکەر بین و ئینجاش تێر نابین، تا دواجار لەو بارەدا دەمرین، وەك مردنی هەر ئاژەڵێك، ئەوسا دەبینە خۆراکی کرم و مەگەزەکانی زەوی، بەخشین بەهاکەی زیاتر دەبێ تا زیاتر و زیاتر ببەخشین، بەلأم وەگرتن هیچ بەهاو مانایەکی نییە -لە ڕاستیدا- کە زیاتر لەوە بێ کە پێویستمانە بۆ بەڕێکردنی ژیان. چاکسازیکردن لە بونیاتنانی ژیریەکان و دەروونەکان و وروژاندنی پاڵنەرە گەردوونیە بنیاتنەرە ئاوەدانکاریە خێریەکان، دەبێ ئامانجی هەرە گەورەی هەوڵەکانمان بن بۆ چاکسازی کۆمەڵگەو ئوممەت، چونکە متی و سستی و خاوی لە ناوەڕۆکی ناخی ژیریەکاندان، بەر لەوەی لە ئامێر و هۆکارەکاندا بن.

دەستپێکردن بە ڕاستکردنەوەی تێڕوانین و پڕۆگرام وەك کەرەستە و بنەما بۆ بنیاتنانی ئەو کادرانەی کە دەست دەدەنە کرداری بونیاتنانی

نەوەكان لە بواری مەعریفی و ویژدانییەوە، كارە گرنگەكەیە وهۆكاری بنەڕەتیە بۆ ئەم دەستپێكردنە، ئەمەش مانای دەستكردن بە ئاڕاستەكردنی خێزان و پەروەردەكردنی و چاكسازی (فێربوون) بە گشتی و خوێندنی بالآ بە تایبەتی (تواناكان)، چونكە دەستەبەركردن و بەكارخستنی بەشەكانی تر بەندە بە پێگەیاندن و دابینكردنی كادرە دڵسۆزە بەتوانا و ئامادەكراوەكان —كە ئەمەیان ئەركی گشتی ئوممەتە— لەلایەكەوە بۆ دەستەبەركردنی مادەو بابەتەكانی مەعریفەو لەلایەكی تریشەوە ئامادەكردنی كارمەندانە لە بوارەكانی پەروەردە و فێركردن و ڕاگەیاندندا، وە هۆكارێكە بۆ بڵاوكردنەوەی ڕۆشنبیری و شێوازو ڕێكارەپەروەردەییە پێویستەكان بە مەبەستی بونیادنانی نەوەكانی ئایندە و لە بێخەوە گۆشكردنیان، تاكو بتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن لەداهێنان و بونیادنان و ئاوەدانكاری و بەخشیندا.

زانكۆی جیهانی ئیسلامی مالیزیا بەسەرەتایەكی گرنگەوە هاتە مەیدان، وە بەئەزموونێكی پێشەنگانەوە لەم بوارەدا دەستی پێكرد، ئەوە بوو كە سەرەتا لە چاكسازی و گۆڕانكاری پرۆگرامەكانەوە دەستی پێكرد، دواتر نەخشەی ئامادەكردن بۆ كادرانی ئوممەت، تاكو ئەمانە (ئەم كادرو خوێندكارانە) ببنە پێشەنگێك بۆ چاكسازی و گۆڕانكاری لەم ئوممەتەدا، وە بە ڕاستی لەم هەڵوێستەدا خۆیان ببیننەوە و وا بكەن كە جموجۆڵی گۆڕانكاریەكانیان و هەنگاوە چاكسازیەكانیان سود بە ئوممەت و سەركردەكانی بگەیەنێ و ئەم ئەزموونە پەرە بسەنێ و گەشە بكات و ئامێرو كەرەسەكانی تێر و تەسەل تر بكرێن، بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەكانی لەسەر بنەمای دەرچەكانی، وە سوودەكەیشی بەكاربهێنرێ بۆ گشتاندن لە

ئاڕاستەی چاکسازی ئیسلامی سەراسەریدا، بۆ ڕابوونی ئوممەت و گێڕانەوەی ڕۆڵی پێشەنگی بۆی و ڕێنمایی کردنی هەوڵەکانی مرۆڤ و سوودمەندبوون لەو هەوڵ و کۆششانەی دەیدات و درێژەدان بە پشتیوانی کردن و بەردەوام بوون لە ئاوەدانکردنەوەو بونیاتنانەوەی شارستانێتی مرۆڤایەتیدا، بەڕاستی هەر خودا ڕێنماکارە بۆ بەرەو ڕاستەڕێ بردن و هەر ئەویش باشترین پشتیوانە بۆ سەرکەوتنەکان.

## دۆزەکە ـ القضية:

زۆربەی جار هۆکاری نەدۆزینەوەی چارەسەر، یان بەکارهێنانی هەڵە لە چارەسەرکردندا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵە لەدەستنیشانکردنی نەخۆشیەکەدا یان لە هەڵە شیکارییەکانیدا، بەڵام ئەم ڕێسایە ڕاست نییە بۆ سەپاندنی بەسەر دەستنیشانکردنی کەمتەرخەمیانەی نەخۆشی (دواکەوتن) لە ئوممەتی ئیسلامیدا، کە ڕاسپاردەکانی لە چەندین سەدەو چاخەوە لەکاردا بوون و لە ڕوکەشدا وا دەرکەوتووە کە گوایە چارەسەرکردنەکەی ئەستەمە، بەڵام وا نیە، ئەوەتا هەر زوو ئەبو حامیدی غەزالی (٥٠٥ك/١١١١ز) هاواری خۆی بەرزکردووەتەوە لە کتێبەکەیدا بەناوی (تهافت الفلاسفه)دا هەروەها بانگەوازی خۆی ڕاگەیاندووە لە کتێبەکەیدا (احياء علوم الدين)، وە لەوانەیە گەورەترین هۆکاری شکستهێنان لەدیاریکردنی دەردی ئەم ئوممەتەو چارەسەرکردنیدا لە قەیرانەکانی ئەم چاخانەی دوایی دا بریتیبوو بێ لە سەر کێڵیانە تەماشاکردنی دەقەکان و بەئامانجگرتنی ڕوکەشیەکان بوو بێ، ئەمە سەرەڕای ئەو شێواوییەی کە ڕووی کردبووە ڕوانگە شارستانیەتەکەی،

بەهۆی ئەوەی پرۆگرامەکەی کەمتەرخەم بووە لەڕووی بەشەکی (جزئی)یەوە بۆ قووڵنەبوونەوە بۆ ناو ناخی هۆکارەکان.

سکاڵای ئوممەت لە چاخە دواییەکاندا، بگرە تا ئێستاش، سکاڵایە لەوەی کە ئوممەتێکی دواکەوتووە لەو ڕووەوە کە پاڵنەرەکانی لاوازن و کەمتەرخەمی کراوە لە بەجێهێنانە کرداریەکاندا، هاوکات سکاڵاشی هەبووە و گیرۆدەش بووە بە دابڕان و پارچە پارچە بوون و دەسەڵات سەپاندنەوە، کە ئەمەش هاوکات سکاڵاکردنە لە دەست ستەم و نادادی و دەسەڵات سەپاندنەوە، کە ئەمەش هاوکات سکاڵا کردنە لە دەست ستەم و نادادی و هەژاری و نەفامی و نەخۆشی، ئوممەت –تا ئێستاش– لەو چاخە دێرینانەوە دەڕوات بەرەو هێز و یەکبوون و دادپەروەری، کەچی لە ڕاستیدا ئەم ڕۆیشتن و ئاواتانە هەر لە دۆخی تراویلکە (سراب)و خەیاڵدان و هیچ شتێکی وایان لێ نەهاتووەتە دی کە لەسەر ئاستێکی بەرچاوی سەردەم بێت، هەر لە ئاواتەکانی گەشەپێدانی سیاسی و ئابووری و زانستی و تەکنۆلۆژی، وە گەیشتن بە ئامانجەکان بەستراوەتەوە بە تینی ئەژنۆکانەوە بۆ گەیشتن بە دەستەبەرکردنی ئاستێکی مرۆییانەی شایستە لە ڕووی گوزەران و فێربوون و تەندروستییەوە وەك خواستەکانی گەلانی ناو ئەم ئوممەتە، بۆیە کەمتەرخەم بووە بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی گەلانی سەرزەویدا لە هێنانەدی ئەو خواستانەدا.

خۆ ئەگەر ئێمە هاوڕاش بین لەگەڵ هەموو چاکسازەکاندا، لەوەدا کە هەموو ڕووکارەکانی ئەم چاکسازیە گرنگ و پێویستن وە پێشکەوتن و ڕابوونی ئوممەت نایەتەدی و ناتوانێ پەیامی خۆی بگەیەنێ تاکو ئەو

چاکسازیە هەمە لایەنە نەکات، بەتایبەتیش چاکسازی لە بواری فێربوون و فێرخوازیدا، بەڵام هەر بۆمان دەردەکەوێ کە زۆربەی ئەم چاکسازییانە ئەوانەن کە بەرکەوتنیان هەیە لەگەڵ نیشانەی زیاتر و هۆکاری قووڵتر و دوورتر، کە ناکرێت خۆمانی لێ بشارینەوەو دەبێ بە چاوێکی ڕەخنەگرانەی بوێرانەوە دەست بخەینە سەریان، خۆ ئەگەر بمانەوێ واش بکەین ئەوا دەبێ خۆمان پڕ و باربۆ بکەین بە هۆکارە مەعریفییە ڕاست و دروست و پێویستەکان بۆ دۆزینەوە و ناسینی ئەم هۆکارانە، ئەگەر واش نەکەین ئەوا هەر بەردەوام دەبین لەسەر کوێری و دەستەوستانیمان لەدۆزینەوەو دیاریکردنی ئەو هۆکارە ڕیشەییانە و ناگەینە خۆ پڕ وزە کردنمان بە وزەیەکی ڕاستەقینە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هۆکارانە و زاڵ بوون بەسەریاندا و هێنانەدی ئامانجە خواستەکان و چاکسازییە ژیاندارییە شارستانییە ڕەواکەی ئوممەتەکەمان.

شێوەکانی دواکەوتن لەمێژووی ئەم ئوممەتەدا، لە ڕاستیدا مانای هەبوونی دەردێکی کوشندەیە، کە دەردی کەمتەرخەمییە لە جێبەجێکردن و خستنەکاری ڕەهەندەکانی ئەم ئیسلامە و دەشگەڕێتەوە  بۆ لاوازی هاندانی دەروونیمان و ئەمەش لەلای خۆیەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەردی شێواندنی تێڕوانینی گەردونیمان کە لە کەمتەرخەمی چالاکنەکردنی پڕۆگرامی بیرکردنەوەماندایەو شێواندوومانە، واتا هۆکارەکە پێش هەمووشتێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێواندنەی لە پێکهاتەی مەعریفی و دەروونی و ویژدانی ئەم ئوممەتەماندا هەیە، کە ناتوانرێ چارەسەر بکرێن تاکو بە تەواوەتی نەیناسین و نەیخەینە ناوجەرگەی هۆشیاریمانەوە لە کارو هەوڵدانماندا بۆ

چاكسازی كردن، تاكو بەوە بتوانین ئوممەت ڕزگار بكەین لە لێڵبینی و لاوازی هاندەرەكان وكەمتەرخەمی بەجێهێنانی كردارییانەمان، كە لە پشتی دیاردەی كەمتەرخەمی و دواكەوتن و لەت لەت بوونی ئەم ئوممەتە و ژیانەماندان، لە هەموو بوارەكانی سیاسی و ئابوری و زانستی و تەكنۆلۆژیەوە.

**پرسیارە گرنگەكە لێرەدا ئەمەیە:** چۆن و بۆچی ئوممەتی ئیسلامی ڕۆژی بەم ڕۆژە گەیشتووە، لە كاتێكدا لە ئێستادا پێنج یەكی هەموو مرۆڤەكانی سەرزەوی پێكدێنێ، لە یەك بلیۆن كەس پتر(١٢٠٠ملیۆن)، لە زەریای ئەتڵەسییەوە تا زەریای ئارام خاكەكەی درێژ بووەتەوە، داهاتەكەی نزیكەی هەزار و سەد بلیۆن دۆلاری ئەمریكییە، واتا كەمترە لە ئاستی بەهای بەرهەمهێنانی تەنها وڵاتێكی وەكو فەڕەنسا، وە كەمترە لە نیوەی بەهای بەرهەمهێنانی ئەڵمانیا، وە كەمترە لە یەك لەسەر دەی بەهای بەرهەمهێنانی یابان، لە كاتێكدا وڵاتی یابان تەنها چەند دوورگەیەكی هەژاری هەیە لە بەرهەمهێنان وداهاتی سروشتی دا و سێ لەسەر چواری خاكەكەی شاخی پڕ لە گڕكانە و بەردەوام لەژێر هەڕەشەی بوومەلەرزەدان وژمارەی هاوڵاتیانیشی لەسەدو بیست ملیۆن كەس تێپەڕ ناكات؟

به هیچ شتێ ڕاڤەی ئەم دۆخە لێك نادرێتەوە، مەگەر هەر بەوەی كە هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ دەردی كەمتەرخەمی لە بەجێهێنانی كرداریدا، چونكە گەلانی ئەم ئوممەتە ئاوڕێك نادەنەوە لەو دۆخەی ئەم ئوممەتەی تێدایە، مەگەر هەر تەنها بۆ مانەوە لەم بارە چەقبەستووەو درێژەدان بەژیان بە كەمترین خۆماندوو كردن، لە ڕاستیدا نەخواست و نە ئاواتێك ماوە كە ئەم

ئوممەتە خوازیاری بێت –بە شێوەیەکی ڕاستەقینە– بەڵکو تەنها بەوە وازی هێناوە کە ئەم ئوممەتە پشت ببەستێ بە داهاتی مادەی خاوی ژێر زەوی لەڕێی بەکارهێنانی ئامێرە کلاسیکییەکان لەژێر چاودێری پسپۆڕانی بیانی لە بواری تەکنۆلۆژیادا، لە پیشەسازی پێکهێنان و دەرهێنان وبەکاربردندا، هاوکات هەر ئەم مادە خاوانە دەبرێنە وڵاتە بیانیەکان ودەکرێن بە کەرەسەو ئامێرو بە هەزاران تەن کەرەسەیان لێ دروست دەکرێ و چەند هێندی نرخەکەی خۆی بە دۆلار پێدەدەن و لێیان دەکڕنەوە، جیاوازیش لەنێوان مرۆڤی ئەم ئوممەتە و ئەواندا تەنها بریتیە لەوەی کە ئەو مرۆڤە، وە کارو چالاکییەکانی مرۆڤانەیە، وە توانای مرۆیی هەیە، وە هزرو بیریشی هەر هی مرۆڤە...!

بەبێ گەڕانەوە بۆ قوڵایی ناخی خۆمان و قوڵایی مێژوومان دەسکردن بە خستنەگەڕی تواناو هێزی کارمان، لەکاتێکدا هێشتا نازانین کە خۆمان چەندە گیرۆدەین بە دەست ئەو دەردانەی تووشی ژیری و دەروونی خۆمان بووە لە شێواندنی مەعریفی و دەروونی ـ جگە لەمەش، ئێمە نەوەی سەردەمی پەیام وشارستانێتی ئیسلامین، کە ئەوان هیچ کەمایەتیەکیان نییە لە سەرچاوە سروشتییەکان، زەوی خودا فراوانە و دەوڵەمەندە، وە ئەوان هیچیان کەم نییە لە بنەما و بەها و ئامانجی بەرز کە ئیسلام لەو بوارانەدا دەستێکی باڵای هەیە ـ لەبەرئەوە ناکرێت تێبگەین لەوەی کە بەسەرمان هاتووە لە دواکەوتوویی وپاشکۆییمانەوە تا دەگات بە سستی و بێهێزیمان مەگەر هەر بەوەی بزانین و دڵنیابین لەوەی کە هۆکاری شێواویەکەمان و

دواکەوتنەکەمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەدووچاری خودی خۆمان و ژیری و پرۆگرامی ژیریمان بووە، کێشەکە لە کۆتاییدا لەناو کرۆکی بونیاتنانی هزریماندایە و کاریگەریەکانیشی گەیشتووەتە دەروونمان و بووەتە هۆکاری دروستبوونی دەردی شێواندنی تێڕوانینە گەردوونیە شارستانیەتەکەمان لە ڕووی تێڕوانینمان بۆ مانای ژیانی مرۆڤایەتی و بوونی مرۆڤ لەم سەرزەویەدا وەك جێنشینێك بۆ ئاوەدان کردنەوە و ئامانجەکانی تری ژیان، ئەمەش لەلایەن خۆیەوە بوەتە هۆی لاوازبوونی هێزە پاڵنەرەکانمان لە بەرپاکردنی ئەو کەمتەرخەمییەمان کە هەمانە لە جێبەجێکردن و کار ڕاپی کردنماندا، ئەمەش دەردێکە هەموو ئەو گەل و میللەتانەی پێ تاقیکراوەتەوە کە لەسەر زەویدان لە ئێستاو ڕابوردوودا، ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین کە لاوازبوونی پاڵنەرەکان و سستی خۆمان لە بەجێهێنانی کرداردا سستمی گشتی کۆمەڵگەو ئوممەتەکەمانی گرتووەتەوە، لە بەرهەممماندا، لە پەروەردەو فێربوونماندا، لە تەکنۆلۆژیاماندا، لە پاراستن و بەرگری کردنماندا لەو وڵاتانەی لە چوارچێوەی ئەم ئوممەتەدا دەژین، وە ئەمەش هیچ ڕێگە چارەیەکی نیە، جگە لەوەی کەدەبێ گۆڕانکاری بەسەر خودی خۆماندا بهێنین و چاکسازی لە ژیری و دەروونی خۆماندا بکەین، هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت: [لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ] (الرعد:١١).

**پەروەردە و فێرکردن:**

لەو باسەی پێشووەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئاڕاستەکارییەکانی چاکسازان دروست و بەجێیە کاتێك بانگەشە دەکەن بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە پڕۆگرامەکانی فێرکردندا، لەو ڕوانگەیەوە کە یەکێکە لە بنەماکانی ئەو چاکسازیەی بونیاتنانی ئوممەتی لەسەر دادەمەزرێ، بەڵام بەداخەوە کە زۆربەی بانگخوازانی چاکسازی لەم ڕووەوە، ئاڕاستە کردنەکەیان بۆ سەر لایەنی چەندێتییە و بەزۆری کاریان بۆ چاکسازی ڕووکارە دیارەکەیە، کە پەیوەستە بە دیاردەکانی دەردەکە و درێژە کێشانی و لەسەر سەنگ و پێوانەی کلاسیکیانەی گەل و ئوملەتەکانی تر بەراورد دەکەن و بەمەش ئوممەت توانا و وزەکانی بە ئاڕاستەی چاکسازیەکی کلاسیکیانەی پاشکۆییانەدا دەبات، کە ئەمەش تێڕوانینێکی هەڵە و سەرکێڵانەیە و دەبێتە هۆی کەوتن و خلیسکان لە هەنگاونانیداو گەلێك کوێرە ڕێگەی دێتە بەردەم و تووشی شۆك و واق وڕمان و بەفیڕۆچوونی وزە و هەوڵەکانی دەبێت.

لەکاتێکدا ئێمە هیچ گومانێکمان لەوەدا نییە کە پەروەردەو فێرکردنی ڕاست و دروست بناغەی بونیاتنانن و دوو کۆڵەکەی ڕاگری وزە جووڵەی مرۆڤەکانن و بەبێ ئەودووانە هیچ بوارێك نیە بۆ بەگەڕخستنی توانا و بەخشش و داهێنان، بەڵام هەرگیز کارەکەمان بەرهەمێکی شیاوی نابێت، چونکە ناوەڕۆکی پەروەردەو فێرکردنەکەمان هەر دەبێتەوە بەلاسایی کردنەوەیەکی کلاسیکییانەی چاکسازیە ڕووکەشیەکانی تر وەکو دروستکردنی کۆشك و خانوو شەقام و ڕێگا، وە زیاتر چاو دەخرێتە سەر

چەندێتی و هۆکارەکان و ئامێرەکان، بگرە بیر لەوە دەکرێتەوە کە لقی زانکۆ بیانیەکان لە وڵاتدا بکەنەوە بۆیە ئەگەر تەماشایەکی دۆخی پەروەردەو فێرکردنی زۆربەی وڵاتانمان بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە زیاتر بایەخ بە (شارستانیەت و تەکنۆلۆژیا) دەدەن و زێدەڕەویش دەکەن لەو بانگەشە زۆرانەی لەو وڵاتانەوە ڕادەگەیەنرێن بۆ زۆربەی تواناو داهاتی ئەم وڵاتانەی خۆشمان بەکاردەهێنرێ بۆ کڕین وهێنانی ئامێرو دەزگاو سستمەکان وکۆتاییەکەیشی دەگات بە (تێکەڵبوون وهەڵبەستن) و هیچ ڕێنماییەکیشی لێ بەرهەم نایەت جگە لە (لاساییکردنەوە)، ئەمەش لە ناوەڕۆکدا هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو عەقڵیەتی لاسایی کردنەوەیەی کە دەکرێت لە ڕووی (عەقیدەیی و شەرعییە)یەوە لە ڕووی نقوم بوونی لەلاساییکردنەوە مێژووییە نەزۆکەکە، کە بێ سوودە و تەنها دووبارە کردنەوەیەکی ڕوکەشانەو وتنەوەی شتە دووبارەکانە.

ئایا جێگەی سەرسامی نییە کە بەرهەمی چاکسازی ئەم ئوممەتە بە درێژایی چاخەکانی کۆتا، نەیتوانیوە کە پەیامەکەی بگەیەنێتە ئامانجەکەی؟ وە هیچ ئامانجێکیشی بۆ نەهێنابێتە دی؟ وە خەڵکەکەش سەرسام مابن لە درز و کەلەبەرێکدا کە کەوتووەتە نێوان خەیاڵ و واقیعەوە؟ وە لەنێوان بانگخوازی و بەرهەمەکانیدا؟

ئەگەر ئێمە هاودەنگ بین لەسەر ئەوەی کە کڕۆکی چاکسازی لەناو ناخی چاکسازی پەروەردەو فێرکردندا شاراوەتەوە، ئەوا ئیتر لە سنووری هۆکارەکان و چەندێتی وهێنانە ناوەوەی (استیراد) نەخشەو ئامێر و دەزگاکاندا ناوەستینەوە، بێگومان زۆر لەمانەشمان پێویست دەبن، بەڵام

دەبێ یەکەمجار گرنگی بدەین بە قوڵبوونەوەمان بۆ ناو جەوهەری بونیادنانی مرۆڤ بە ڕوانگەیەکی شارستانیانەوە، وەك ئەوەی کە خودی مرۆڤ بۆ خۆی ئەو خەسڵەتەی تێدایە، وە وردبینەوە لە مرۆڤ وەك ڕووە پرۆگرامی و مەعریفی و هزری و زانستیەکەی، وە بونیادە دەروونیە کارا هەموارەکەی، قوڵبینەوە لە سەرچاوەی تواناکانی لە تێڕوانینی مرۆڤ و بونیادنانی عەقڵ و ویژدانی و بە تەوزیفکردن وخستنەکاری هۆکارەکان کۆتایی پێ بهێنین، لەگەڵ بەرهەمهێنانی بڕێکی پەسەند و باش و دەستەبەرکردنی توانای پێویست بۆ جێبەجێکردنێکی بەتواناییانەی بەجێ بە مەبەستی گەیشتن بەئامانج وخواستەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان و بەدەستهێنانی چاکسازی و پێشکەوتن لەبوارەکانی سیاسەت و ئابوری و تەکنۆلۆژیادا و سەرکەوتن لە گۆڕەپانی پێشبڕکێی شارستانێتی و ڕاگەیاندنی پەیامدا.

### لێرەوە دەست پێدەکەین:

لەم ئاستەدا، ئیتر دەبێ ئەم پرسیارە گرنگە بپرسین: لە کوێوە دەست پێبکەین؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گرنگە، هەروەکو ڕوونە، ئەوەیە کە پێویستە لەسەرمان کە لە چاکسازی خودی خۆمانەوە دەست پێ بکەین، چونکە سەرەتای چاکسازی ئیسلامی هاوچەرخ سەرەتا لە ناخی خودی موسڵماندا شاراوەتەوە، واتە چاکسازی ناخی دەروون، ئەمەش بەوە دەبێ کە چاکسازی بکەین لەچاککردنەوەی هەر شتێ کە بنەچەی تێڕوانینی ئەو دەروونەی پێکاوە و تووش کردووە، هەروەها چاکسازی و چاککردنەوەی هاندەرە شارستانیەتەکان و پرۆگرامە هزری و ڕۆشنبیرییە کۆمەڵایەتی و

وتارە پەروەردەییەکەی لە هەر دەردو نەخۆشی و لەکەیەك پێوەنوساوە بە هۆی تێکەڵاوبوونی کاروان و ڕەوتی ئەم ئوممەتە لەگەڵ گوشراوەی ڕووداوە سەردەمیەکان و پاشماوە و میراتی گەل و ئوممەتەکان، کە بووەتە هۆی شێواندنی ئەو دەروونە، هەریەکە لەوانە وەکو بەردێك وان کە هاتوونەتە بن پێچکەی ڕەوڕەوەی پاڵپێوەنانی شارستانێتی ئیسلامی هەڵقوڵاو لە پەیامی ئیسلام و چاخی ئەو پەیامەوە و وای لێ کردووە کە ڕۆیشتنەکەی خاو بکاتەوە و وزەی پاڵنانی کەم بکاتەوە تا ئاستی ڕاوەستاندنی، بەڵێ ئەم شێواندنانەی ئیسلام جوڵەی شارستانیەتەکەیان ڕاگرت، وە ئوممەتی ئیسلامیش نەیزانیوە چۆن بە درێژایی ئەو سەردەمانە ئەو هەموو شەخەڵەیان لەسەر ئیسلام و شارستانیەتەکەی کەڵەکە کردووە و بووەتە هۆی داڕماندنی بیناو ئاوەدانیەکانی و لە ئێستا بووەتە لاشەیەکی نیمچە مردوو و چەندێتییەکی فەرامۆشکراو لەناو گوشگۆڕەپان (حلبە)ی ململانێ و بۆکسێنەکانی ئوممەتانی ترداو بەرانبەر وەستانەوەی ڕووبەڕووی لەگەڵ شارستانیەتەکانی تردا، تا بیخەن و بیکەن بە نێچیری دوژمنەکانی، زامەکانی دەکولێنەوە، بەختی یاوەری نابێ، قەیرانەکانی بەرۆکی بەرنادەن، لە تاریکستانی خۆیدا جەنگڵ دەداو ڕێ دەرناکا.

ئەی ئەمە چۆن ڕوویدا؟ وە چۆن دەستی پێکرد؟ ڕەگ و ڕیشەی ئەمە وەك دەزانین ئەو کاتە دەستی پێکرد کە چاخی پەیام و جێنشینە راشیدینەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر) کۆتایی هات لەسەدەیەکدا کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا ململانێیەکی خوێناوی بەخۆوە بینی و بەجێهێنان و پەروەردەی ئیسلامی لاواز کرا، دەمارگیری و میللەتگەرایی

باوی سەند و پاشماوەکانی سەردەمی نەفامی هۆزو تیرە و گەلان هێنرانەوە ناو کایەی ململانێکان و بەوەش کۆتایی هات کە کەسە کارا و چالاك و زاناکانی چاخی پەیام لە گۆڕەپانی فەرمانڕەوایی و سیاسەت و ژیانی گشتی دوورخرانەوە و خزێنرانە ناو چوار دیواری قوتابخانەو حوجرەکانەوەو لەوێدا خرانە سەر کار، دواتر ئەوەی بۆیان مایەوە تەنها بریتی بوو لە فەتوادان و مامەڵەی تاکە کەسی تایبەت بە باری کەسێتی و مارەکردن و جیابوونەوە پێشنوێژیکردن لە مزگەوتەکان و وتاری هەینی و هاندانی خەڵکی بۆ نوێژ کردن، وە هاندان لەسەر بەردەوامبوونی خەڵکی لەسەر گەورەیی خواپەرستی و ڕەوشتبەرزی.

ئەم هەڵپەساردن و لەسەر کار لادان و دابڕانە بۆ هەڵگرانی زانست و کارایانی پێشەنگی ئیسلامی کاریگەری خراپی بەدوای خۆیدا هێنا، چونکە ئەم جۆرە کەسانە سەرچاوەی وزەی جووڵەی ئەم ئوممەتە بوون، تا دەهات زیاتر دوور دەخرانەوە و زیاتر چارەنووسی تێڕوانینی ئیسلامی بە شێوە گشتییەکەی دەشێوێنرا، دواجار بووە هۆی تێکدانی دامەزراوە سەرکردایەتیەکانی ئەو شێرە کەسانە، کە سەرکردەی ئەم ئوممەتە بوون، وە پێشەنگی چارەنووسی ئوممەت و ڕۆشنبیری و فێرکردن بوون، بووە هۆی ڕووخاندنی پرۆگرامی پەروەردەی نەوجەوانان، کە لە دوارۆژگارەکانی ئەو چاخەدا ئەوەش کرا.

ئەو تێڕوانینە تۆکمە شارستانیەتە گشتییە ئیسلامییەی کە عەقیدەی یەکتاپەرستی و جێنشینی زەوی و ئاوەدانکردنەوە و خستنەکاری چاکە خوازییە و عەقیدەی باوەڕهێنانە بە خودا و ڕۆژی دوایی شێوێنرا، لە کاتێکدا

ئەم عەقیدە ڕاست و دروستە بە باری هەمواردا ڕەنگدانەوەی واقیعی نەژادی مرۆڤایەتییە و ئامانجی کاراکردنی وزەیەکە کە مەبەستەکەی چاکەکاری و چاکسازی ئەم دنیایە تا دەگات بە هەڵگرتنی سپاردەی پەیامی خودایی و باش پەیڕەوکردنی بە ئاڕاستەی خێرو هەق و دادپەروەری، وەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (کار وا بۆ دنیات بکە کە بۆ هەتا هەتایە دەژیت، وە وا کار بۆ دواڕۆژت بکە کە سبەینێ دەمریت) وە ئەم عەقیدەیە هاتووە بۆ ئەوەی کە ژیانی موسڵمان –بە هەموو ڕەهەند و بوارەکانەوە– بکاتە بەندایەتی و خوداپەرستی، واتا بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خودای تاك و ڕاستەقینە.

لەبەرئەوە تێڕوانینی عەقیدەی ئیسلامی، ویژدانی ئەو ئوممەتەیە کە عەقیدەکە هانی دەدات بۆ کارکردن و ئاوەدانکردنەوەیەکی باش و پڕ لە سوود بۆ ژیانی ئەم دنیایەو بگرە ژیانی دنیاکەی تریش بەرهەم و بەرەنجامی ئەم ژیانەیە، وەکو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێ: (ئەگەر چاك بوو کرداری کەسێك لەم دنیایەدا، ئەوا لەولاش پاداشتی چاك دەبێ، وە ئەگەر خراپ بوو ئەوا لەولاش پاداشتی خراپ دەبێ). وە وا لە مرۆڤ دەکات کە هەمیشە لە خەمی خۆیدا بێ لەنێوان یادی خوداو کۆشش کردندا، کە بەپێی ئەم عەقیدە بێگەردە یادی خودا هاندەرێکە بۆ کاری چاك واتە هاندەرە بۆ کۆشش کردن و خودا لە خۆڕازی کردن، ئەمەش مانای (جهاد)ە بە هەموو جۆرەکانیەوە هەر لە زانستەوە تا کردار، وە لە ئاشتییەوە تا جەنگ، واتا هاندەرێکە بۆ پاراستنی پاکیزەیی دەروون و گیان، وە جیهادی داواکردنی ڕۆزی و جیهادی گەڕان بە دوای زانست و جیهادی هەوڵدان بۆ

چاکسازی و جیهادی دابینکردنی پێویستیەکان بۆ هەژارو داماوان، وە جیهادی بانگخوازی و جیهادی بەرگریکردن لە ئاین و لە خود و لە سەروماڵ و لە نیشتمان و بەرگریکردن لە لاواز و بێهێزو بێدەسەلاتان.

ئەمە مانای ئەوەیە کە ژیانی مرۆڤی موسڵمان هەمووی هەر لە (جهاد)دایە، جیهادی جێنشینی کردنی زەوی و ئاوەدانکردنەوە و بەجێهێنانی سپاردەی خودایی و هەڵبژاردنی پەسەندو چاك، جا ئەوە بۆ تاکە کەس بێ یان بۆ کۆی گشتی، جیهادەکە بۆ پێویستی تاکە کەس بێ، یان بۆ کۆمەڵێك، وە مرۆڤی موسڵمان پشت بەمانە دەبەستێ و هەموویشی بە یادکردنەوەی خودا بۆی دەنوسرێ کە ئەو خودایەش هەق و دادپەروەر و میهرەبانی و ئاشتی یە —لە تەسبیحات و قورئان خوێندنیدا، لە نوێژ، ڕۆژوو، زەکاتدان، حەجکردن، بە گەورە گرتنی دروشمەکانداو هەبوونی چاوی خودا بە سەریەوە لە دیار و نادیاردا، بە نهێنی و ئاشکرا، لەهەموو ئەمانەدا مرۆڤی موسوڵمان بە ڕێنمایی ئەو خودایە بەڕێوە دەچێ و پشت هەر بەو دەبەستێ لە گەیاندنی سپاردە پڕ لە خێرو بێرەکەی دا، وەکو خودا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ] (النور: ٥٥)، [قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ] (الأنعام:١٦٢)، [وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ] (العنكبوت:٦٩)، [ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ

ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٥).

بەڵام ئەو تێڕوانینە دابڕانە قوتابخانەییەی سەپێنراو خەڵکە زانستخوازەکەی ئەم ئوممەتەی بە کۆتا هێنا، بە حوکمی ئەو واقعەی پیایدا تێپەڕی و ئەو گۆشە نیگایەی تا ئێستاش دەبینرێ و پەیڕەو دەکرێ، بێگومان هەر ڕۆژێك بێکۆتاییەکەی بەوە دێ کە تێڕوانینەکە بەگشتی هەمووان بگرێتەوەو سەرجەمی موسوڵمانان پەراوێز بخرێن، بە تایبەتی لە ڕووی دەسەڵاتی سیاسییەوە، وە لە ڕووی دادپەروەری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕاپەڕاندن و گرتنە ئەستۆی کاروباری گشتییەوە، وە کاروباری فەرمانگە و دام و دەزگاکانەوە، وە ڕۆژێك دێت هەمان تەکتیك بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی ئەو موسڵمانانە نەتوانن یادی خوا بکەنەوە و دروشمە ئیسلامییەکان بە ئاشکرا پەیڕەو بکەن، بەمەش هەوڵی جیهادیانەی ژیان و ئاوەدانکاری بزر دەبێت، وە وای لێ دێ کە باسکردنی ڕۆشنبیری ئەم ئوممەتەش بە بەندایەتی لە قەڵەمی دەدەن، کە لە ڕاستیدا هەموو کارێکی باش هەر خوداپەرستییە، خۆشمان دەزانین کە ژیانی موسڵمان (بە زمانی قورئانی)و کارو کردەوەکانی هەمووی هەر بە (خواپەرستی و بەندایەتی) بۆ ئەژمار دەکرێ[١] جا ئەوە یادی خودا بێ، یان کارو کۆشش و جیهاد بێ،

---

[١] چەمکی بەندایەتی و خواپەرستی لە ئیسلامدا لە (تعبید)ەوە وەرگیراوە نەك لە (استعباد) تاکو مرۆڤ بە خواستی ئازادانەی خۆی هەق و ڕاستی هەڵبژێرێ، ئەوەش مانای شانازی و هێزە بۆ ئەم عەقیدەیە ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (المنافقون:٨).

بەداخەوە تێڕوانینی قوتابخانەییانەی دابڕان کەوتەکار، بەڵام هەر دەبێ بڕەوێتەوە، گەرچی ڕۆڵی هەبوو لە دواخستنی زەوی لە ڕووی چاکسازی بەرەو پێشچوونەوە –جا بە مەبەست بوو بێ یان بێمەبەست– تا دواجار وا دایبڕی کە تەنها لە باری کەسێتی و مامەڵاتدا بچووك کرایەوەو ئێستا بووەتە خانەیەکی فیقهی و یاسایی بۆ گرێبەستەکان و مامەڵەی ناوخۆیی کەسەکان لە بابەتی زەکات و مارەبڕین و تەڵاقدان و...هتد.

ئەم شێواندنەی بەرپا کرا لەو تێڕوانینە گشتییەی کە بووە هۆی دابڕانی ئەو پێشەنگە هزریە (دەستەی زانایان) بە پلەی یەکەم بەرپرسە لە ڕووی دەروونیەوە لەو دۆخە خراپەی دووچاری ئومەت بووەتەوە، لە ڕووی کەسێتی ئەم ئوممەتە و مەبەست و ئامانجە ئاوەدانکاری و ژیانداری ئەرکی بە کۆمەڵ و ئەو سەلبیاتەی هاتووەتە ئاراوە بەرانبەر بە ژیان و ئامانجە چاکسازییەکانی، لە کاتێکدا کە هەرگیز ئەمە تێڕوانینە ئیسلامییە ڕەسەنەکە نیە بۆ تێڕوانینە ئیجابییە شارستانیەتە ئاوەدانکاریەکە، کە تایبەت بێ بە تۆو چاندن و کشتوکاڵ و کارکردن تەنانەت ئەگەر بۆ جوتیارو کشتیارانیش نەبێ وە ئەگەر دونیا لە کۆتا ساتەکانیشیدابێ، ئەوا کەمێك لەتەمەن هەر لەڕێدا ماوە تا بەروبووم بچنی و بڕنیتەوە، بەم جۆرە تا شایستەی وەرگرتنی پاداشتی خودایی بێ لە بەرانبەر ئەو چاندن و ڕاواندنەدا.

ئـــەم شـــێواندنەی تێـــڕوانین لـــە بنەڕەتـــدا بەرپرســـە لـــە بزربـــوونی هۆشـــیاری و کۆششـــی ڕاســـتەقینەی ئوممـــەت و داهێنانەکـــەی لـــە ژیـــانی ئوممـــەت دا، هاوکـــات بەرپرسیشـــە لـــە گەنـــدەڵی ژیـــانی گشـــتیانەی و دادڕینـــی ولەتوپـــەتکردنی و ناهـــەموارێتی ئـــەم ئوممەتـــە و لاوازبـــوونی

پاڵنـــــــەرە دەروونیـــــــەکانی و کەمتەرخـــــــەمی بەجێهێنانـــــــە شارســـتانییەتەکەی و دارمـــانی دامودەزگـــاو دامـــەزراوە گشـــتیەکانی و بڵاوبوونـــەوەی نەخۆشـــیە سیاســـی و کۆمەڵایەتییـــەکانی گـــەلان و وڵاتـــانی ناو ئەم ئوممەتە.

ئەم دابڕین و دابڕانە قوتابخانەییەی کە زانا و بیرمەندانی زانست و مەعریفەی گەمارۆ داوە، هەر ئەوانیش بوون کە ئەزموونی مەعریفەی مرۆڤایەتی و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیان لێ دوورخرایەوە (واتا زانستە کۆمەڵایەتیەکان) تاکو وا لە مەعریفە بکەن کە تەنها لەناو چوارچێوەیەکی دەق و زمانەوانیدا بمێنێتەوە و دواجار لەگەڵ خۆیدا تواناکانی نوێکردنەوە و ڕادۆزی (إجتهاد) لاواز بکات و لاساییکردنەوە و خۆدەرخستن شوێنی بگرێتەوە و سستی هزری بەرانبەر بە پیرۆزی دەقەکان سەر هەڵبدات بەپێی کات و شوێنەکان لە زۆربەی جارەکاندا وای لێ بەسەر بێت و لە قینی ویستی ئوممەتدا دەربکەوێ و ملکەچی بکات –بەبێ گوێدانە نیازەکان– بۆ پەراوەی زۆربەی تاریکیەکانی نەفامی و خۆدەرخستنی زۆربەی نەفام ونیاز گڵاوو نەخۆشەکان و وا بکەن کە ڕۆشنبیری و زانست و مەعریفەی مرۆیی بگەڕێتەوە چەرخی کلاسیکی و تێداچوون، وە کەمتەرخەمی تیایدا سەرهەڵبدات لە بەرانبەر فێرکردنی کۆی ئوممەت بە گشتی و فێرکردنی نەوجەوانەکانی بەتایبەتی، وە وایان لێ بکەن کە ڕازی بن بەوەی ببنە چەند دەستەو گروپێکی سادە بۆ فێربوونی کەمێك لە قورئان بنەماکانی ژمێرەو بیرکاری، کە ئەمانە کەمترین بنەمای پێویستییە ڕۆژانەکانە، ئەمەش بە شێوازێکی پەروەردەیی و فێرکارییانەی خراپ و نەشیاوی ئەوتۆ کە پڕ بێ لە

ستەم و توندوتیژی و سەپاندن و سزادان، دایك و باوكانیش ناچار بن منداڵەكانیان بخەنە بەردەستی ئەو مامۆستا تووڕەو نائومێدانەی كە هیچ پیشەیەكی وایان دەست نەكەوتووە كە باشتر بێت لەوەی (مامۆستای منداڵان) بن.

ئەوە جۆرە فێركردن و پەروەردەیەك بوو، كە جێگەی ڕەخنەو ناڕەزایی بوو، چونكە پڕ بوو لە توندوتیژی و بریندارکردنی هەست و كەسێتی، لەلایەن زانایان و خاوەن هزر و بیرمەندانەوە ڕەت كرایەوە، چونكە زۆر جیاوازە لە شێوازی رۆشنبیری منداڵانی چینی تایبەتی كۆمەڵگە كە ئاستی جیاوازە و هەندێك لە زانستە ئیسلامییەكان و ئادابی تێدایە. بەجوانی مامەڵە لەگەڵ قوتابیدا دەكات و رێزی دەپارێزێت. وەلەم شێوازەی فێركردنەدا رێنومایی و راسپاردەی كەسانی تایبەت و دەسەڵاتداران لەخۆ دەگرێت كە دەیدەنە پەروەردەكارانی منداڵان لە ماڵەكانیاندا. جگە لەم دوو جۆرە سستەمەی پەروەردە و فێركردن و ڕۆشنبیری كە پێچەوانەی یەكترین، هیچ سیستمێكی تری باو نییە جگە لەهەندێك لەو قوتابخانانەی كە بە پلەی یەكەم كار بكات بۆ پێگەیاندنی (كادر)ی ئیمامەتكار و ڕێنماكار و دادوەر و موفتی.

وە بە شێواندنی دیدگەی عەقیدەیی گشتگیرانە یەك جەمسەرێتی مەعریفە و نەزۆكی پرۆگرامی مەعریفی و توندی وتاری ئاینی و ستەمی دەستەی سیاسیەكان و بڵاوبوونەوەی خورافیات و جادوو و تەڵەكە و چاوبەست بە هەموو جۆرەكانیانەوە لەناو چین و توێژەكانی كۆمەڵگەدا بە گشتی و زۆرێكیش لە خەڵكانی تایبەت، جووڵەی ڕەوڕەوەی گیانی شارستانیەتی ئیسلامی خاو دەبێتەوە و ئوممەت دام و دەزگا و

دامەزراوەکانی بەرەو دارمان دەچن و دەروونی گەلانی ناو ئەم ئوممەتەش بەرەو ناهەمواری و بێزاری دەچێت و کاری ڕۆڵەکانی بەرە و کەمتەرخەمی هەنگاو دەنێت و وزەش کپ دەبێتەوە و پاڵنەرە دەروونیەکانی کارجوانی لاواز دەبن، چونکە ئەو کەسەی بە حەز و خواستی خۆی کارێك دەکات، بەرگەی ماندووبوونەکەی خۆی دەگرێ لەپێناوی گەیشتن بە خواستەکەیدا، بەڵام کەسە ترساوە دوو دڵە خۆپەرستەکەی کە جگە لە وەرگرتن (أخذ) هیچ شتێکی تر نازانێ و ناشزانێ چۆن بوونی خۆی بسەلمێنێ و خۆی بەدی بهێنێ یان ئامانج و مەبەستەکەی لە کارەکەیدا بدۆزێتەوە یان ببەخشێت، ئەو جۆرە کەسە، کەسێکی ناهەموار و نەشیاوە و بووەتە بار بەسەر ژیانەوە، کەسی لەم جۆرەش تەنها کاری کەم و لانیکەمی کار دەکات.

لاوازی هاندان و پاڵنەر و سستی و کەمتەرخەمی لە ڕاپەڕاندنی کاردا وەك کۆسپێك دەمێنێتەوە لەبەردەم هەموو ئەو هەوڵە چاکسازیانەی کە هەر دەبێ ئوممەت بیانخاتە گەڕ، لە سەرەتاشەوە دەبێ لەم شتە ناهەموارانە و هۆکارەکانیان خۆی دەرباز بکات، تاکو بتوانێت ئەم ئوممەتە ببوژێنێتەوە و ڕاپەڕێنێ و پرۆژە ئیسلامییەکانی تێدا سەرکەوتوو بکات و بگات بە کۆکردنەوەی ئەو بەروبوومەی کە پێشتر چاندوویەتی و چاوەڕوانیەتی و ئەو خواستە شارستانیەتە بهێنێتە دی لە چاخی زانست و تەکنەلۆژیاکاندا بۆ بەردەستخستنی وزەکان لەقوڵایی دەریاکان و ئاسۆی ئاسمانەکاندا.

## پێگەی خوێندنی باڵا لە چاکسازی شارستانییانەی ئیسلامیدا :

پرسیاری ئێستامان: ئایا کامەیە پێگەی خوێندنی باڵا لەناو پڕۆژەی چاکسازی شارستانییانەی ئیسلامیدا؟ وە چۆن کارای بکەین تاکو ئەو ڕۆڵەی پێی دراوە بۆی بگێڕینەوە بە مەبەستی ڕاستکردنەوەی ڕوانگە و گێڕانەوەی هێزی پاڵنەر لە بڵاوکردنەوەی زانست و ڕۆشنبیری و هێنانە کایەی مەعریفە و پێگەیاندنی (کادری) کارا یەکێکە لەگرنگترین کارەکانی خوێندنی باڵا، ئەم ئەرك و کار و مەبەستانە پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە لە ڕووی مادی و کارگێڕی و پێکهاتەی ئەکادیمیانەی خوێندن و ئەو پلانانەی پشت دەبەستن بە هێنان و هاوردەکردن (استیراد) و بەرکەوتن لەگەڵ سستمە مەعریفی و پەروەردەیی و فێرکارییەکاندا ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە کە هەموو کەسێتییەکی شارستانی دەرچە و مەبەست و بەهاو کلیلی بەگەڕخستنی وزە شاراوەکانی خۆی هەیە، وە هەر هەوڵ و کۆششێك لەم خەسڵەتانە بێئاگا بێ و وزە شاراوەکەی ناخی کەسێتییە شارستانییەکەی ئوممەت نەدوێنێ، ئەوا مانای ویژدان و خواستی ئەم ئومەتەی نەجوڵاندووەو پاڵی پێوە نەناوە بە ئاڕاستەی وەڵامدانەوەی و کارجوانی جێبەجێ کردن، لەبەرئەوە ئەم ئوممەتە ناتوانێت لەناو ئوممەتانی تردا پێگەیەکی شایستەی خۆی هەبێ، ئەگەر چاکسازی لە خوێندنی باڵای دا نەکات لە چوارچێوەی سستمی پەروەردە و فێرکاری خۆیدا، وە کاراکردنی و خۆڕزگارکردن لەو پەتاو ئافاتانەی ڕووی تێکردووە، تاکو ئامانجەکان و ئەرکە بنەڕەتییەکان بێنێتە دی.

## دەردەکانی خوێندنی باڵا لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا :

دەردی یەکەم: بریتیە لە ئافەتی لاساییکردنەوە، وەك دەبینین زۆربەی ڕێکخراوەکانی خوێندنی باڵا لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا و فەلسەفەکانیان، نامۆیە بە ویژدانی ئوممەت و ئامانجە شارستانیەکانی و دەرچووی بیانین، بەندن بە لاساییکردنەوەی کلاسیکییانەی ئەوانەوە، هەرگیز ئەوە بە هەند وەرناگرن کە سروشتی کەسێتی شارستانێتی ئیسلامی و دەرچە و بەهاکانی تایبەتی و جیاوازن، وە بەندن لەسەر بنەماکانی یەکتاپەرستی و پەیوەست بوون بە مەبەستەکانی بوون و گەردوونەوە، وە گوێ نادەنە ئەوەی کە ئامانجەکانی شارستانێتی ئیسلامی یەك سەرچاوەی هەیە و ڕەهەندی ماددی و ڕۆحی و ڕەوشتی و دنیایی و قیامەتییەکەی هەر یەك سەرچاوەی سەرەکییەو لەم سەرچاوەیەدا ئامانج و مەبەست و کار بریتین لە ئاوەدانکردنەوەی هەردوودنیا، وە کارکردن بۆ ئەم دنیایەش مەبەست و ئامانجی گوزەرانی ئەم دنیایەیەیو هۆکارە بۆ بژێوی هاوکات هۆکاریو ئامانجی ڕۆحیشی لە پشتەوەیە. کە گەورەترە لەم ژیانە، کە بریتیە لە هێنانەدی بنەمای دادپەروەری و گەشە بەخۆدان لەم ژیانەدا، وە لە ژیانە ڕۆحییە هەمیشەییە نەبڕاوەکەی دواڕۆژدا بەوپەڕی کار وردی چاککاریەوە، وەك دەربڕینێکی خۆشەویستی بۆ خود و بەندایەتی کردن بۆ خودا لێك دەدرێتەوە، ئەمەش بە ئاڕاستەی ئەو خودا میهرەبانەی کە بۆ خۆی هەق و دادپەروەر و ئاشتی و بەزەییە و دوورە لە خواستی شەڕ وستەم ودڵڕەقی و دوژمنایەتی، کە ئەمانە لە ئارەزووەکانی مرۆڤدا بوونیان هەیە.

دەردی دووەم: شێواوێتی تێڕوانینی گشتی انەی ئیسلامی و ئەو تێکەڵبوونە خراپەی کە تێکەڵ بووە لەگەڵ دەردەکانی خورافیات و جادووە بووەتە هۆی ڕاگرتنی ڕەوڕەوەی شارستانێتی ئیسلامی و ئاوەدانیەکەی لێ دارماندون و ژێری شێواندون، مەعریفەیان تێکداون، پرۆگرامیان گەندەڵ کردوون، پەراوەی ژیانیان لێ گۆڕیون، شێوازی پەروەردەیان هەڵە و گێڕکردونەتەوە، دووریان خستوونەتەوە لەو شێوازە جوانەی کە لەسەری بوون لە متمانەو پشتبەستن بەو خودا تاك و تەنهایە و پێوە پابەندبوونی ئەو خەڵکە بە پەیامی خودا و چاککاری و کاروردی، کە بەندن بە بنەماکانی یاسا خواییەکانەوە لە هەموو بارودۆخ و کارو کردارێکدا لە هەنگاوەکانی ژیانیاندا.

لەبەر ئەم هۆکار و دەردانە، فێربوون بە گشتی و خوێندنی باڵا بەتایبەتی نەیتوانیوە لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا —تا ئەمڕۆش— ڕۆڵی سەرکەوتووانەی خۆی ببینێ لە بوارەکانی مەعریفەدا، جا ئەو مەعریفەیە ئایینی و شەرعی بێت، یان شارستانی، یان مرۆیی یاخود تەکنۆلۆژی بێت، هەر لەبەرئەو هۆکارانە خوێندنی باڵا نەیتوانیوە سەرکەوتوو بێ لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و هێنانە کایەی مەعریفە و بەرهەمهێنانی کادری دەستگەرم و بەتوانا و کارا و داهێنەر، بەمەش ئومەت لە دەستەوستانی و سستی و دواکەوتوییدا خۆی بینیوەتەوە، کەرت و پەرت بووە، کەوتووەتە ناو تاریکاییەکی توندەوە، وە کەوتووەتە پەراوێزی کاروانی هاوچەرخی شارستانێتی و مرۆڤایەتیەوە.

چاکسازی خوێندنی باڵاو کاراکردنی بە دۆزێکی بنەڕەتی دادەنرێت، وە سەرەتا هەر دەبێ ئەو چاکسازیە بکرێت، بەمەبەستی چاکسازی ئوممەتی

ئیسلامی و ڕابوونی و سەرکەوتنی پڕۆژە شارستانی و پەیامە مرۆییە جیهانیەکەی، دەبێت ئەو چاکسازیە لە ڕیشەوە دەست پێبکات و ببێتە هۆی ڕیشەکێشکردنی هەر شتێ کە بووەتە هۆی ناشیرین کردن و شێواندنی و لە سەرەتاشەوە دەبێ لە (ئیسلامییەتی مەعریفە)ەوە دەست پێ بکرێت، لەگەڵ ڕەسەنایەتی دەرچەکانی و سەرچاوەکانی، کە مەبەست لێی چاکسازی پڕۆگرامی مەعریفە و یەکانگیر کردنەوەی سەرچاوە خودایی و مرۆییەکەیەتی، چونکە وەك دەزانین (وەحی) ڕەهەندی گشتی ڕۆحی و ڕەوشتی دابین دەکات بۆ بواری کارو کرداری مرۆیی و پێملکردنی (تسخیر) یاسا گەردونی و هۆکارە زانستی و تەکنۆلۆژیەکانی ئەم کارە، هەر بەمەش لەمپەرەکانی بەردەمی سستی و داماوی لادەبرێن و تواناکانی بیرکردنەوە و وانەخوێنی و توێژینەوە دەتەقنەوە لەناو سروشتی ناخی کەسەکان و مەیدانی واقیعی ژیاندا لەسەر بنەماکانی ژێری یاسا گەردوونیەکان و ڕێنماییەکانی (وەحی).

(ئیسلامییەتی مەعریفە) ئامانجی ڕاستکردنەوەی تێڕوانینی گەردوونیە و دەیەوێت سەرلەنوێ یەکانگیری سەرچاوەی مەعریفەی ئیسلامی بێنێتەوە کایەو خەڵکی پابەند بکرێنەوە بە پڕۆگرامی یاسا گەردوونیەکان لە کارو پەڕاوە و بەکارهێناندا، لە پێناوی ئەوەدا کە ژێری موسوڵمان ڕۆشن بێتەوە و پاڵ بە مرۆڤەوە بنێ تاکو لە پانتایی دەریای مەعریفەدا بە ئازادی بێت و بڕوات و هیچ جادوو و خورافاتێك نەبێتە کۆسپی سەر ڕێگایەکەی و نەیخاتە قوڵایی ناکۆکی و جیاوازی و ئەندێشە خراپ و گومڕاییەکانەوە.

ئامانجی (ئیسلامییەتی مەعریفە) ئەوەیە کە کار بکات لەسەر ئازادکردنی ژیری موسڵمان لەو ئافات و خورافیاتانەی کە بوونەتە هۆی دابڕان و ناکۆکی، بۆ ئەوەی لەگۆڕەپانی تێکۆشانی مەعریفەو زانست لەوپەڕی بوێری ومتمانە بەخۆبوون و دەستپێشخەریدا، داواکاری چاکسازی بێت و هەروەها بەکارهێن و وردەکارو داهێنەر بێ، بەمەش ببێتە خاوەنی توانایەکی پتەوو سپاردە پارێز لەڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنێکی ڕاستەقینەی ئەرکەکانیدا لە ڕووی ڕەوشتی و بەرەنگاربوونەوەکانی و چارەسەرکردنی کێشەکان و گەیشتنە ئامانج و هێنانەدی مەبەستەکان.

چاکسازی لە تێڕوانینی ئیسلامی و سەلامەتی پرۆگرامی هزری و گێڕانەوەی وێنە قورئانیە گەردوونیە بنەڕەتیە گشتگیریەکەی مەرجی بنەڕەتیە بۆ بژارکردنی ڕۆشنبیری و چاکسازیکردن لە پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن، کە ئەمیش دیسان لەلای خۆیەوە دەبێتەوە بە مەرج بۆ چاکسازی بینای مەعریفی و ویژدانی لە دەروونی مرۆڤەکاندا و باربۆی دەکات بە دەلیلی جووڵەو هاندانی جێبەجێکردن، هەرکات دەلیلی جوڵە و هاندانی جێبەجێکردنیش لای کارمەندان پەیڕەوکراو پارێزرا، ئەوا خستنەکاری هۆکارو ئامێرەکان –تەنها بەوە– چالاك و پڕ حیکمەت دەبن و دەبنە هۆی ڕووبەڕووبوونەوە سەختەکان و ئەنجامدانی کاری گرنگ و داهێنانی ورد و دەستەبەرکردنی پێویستییەکان و دەربازکردنی ڕەوڕەوەی جووڵەی ئەم ئوممەتە و دەرپەڕاندن و بەگەڕخستنی وزە بەرهەمهێنە ڕەوشتییە داهێنەرانەکەی وەك جێنشینێك لەسەر ئەم زەوییەدا بۆ بونیادنانی شارستانیەتێکی پڕ لە خێروبێر.

بەم جۆرە ئەگەر ئێمە ویستمان کاروانی چاکسازی لەسەر ئاڕاستەیەکی ڕاست و دروست دابنێین، دوای چەندین سەدە لە سەرگەردانی و بێبەرنامەیی، ئەوا پێویستە کە کارە گرنگەکانمان لە پلانی چاکسازی پەروەردە و فێرکردنماندا ڕەنگ بداتەوە و چۆنیەتی پێش بخەین بەسەر چەندییەتیدا، واتاکانیش بەسەر چوارچێوە و بونیادەکاندا، پرۆگرامەکانمان لاگرنگتربێت لە هۆکارەکان، بەبێ ئەوەی ماف هیچلایەکیان کەمتەرخەمی تیا بکرێت. وە ئو ئەندازەیەی کە رۆڵی هەیە و خزمەتی ئامانجەکەی دەکات بەبێ ناتەبایی و کەمتەرخەمی.

ئەم هاوسەنگییە لەنێوان (چەندێتی و چۆنیەتی)دا وە لەنێوان (بینا و مانا) دا دۆخی ئەو ئومەتەیە کە چێژ لە توانای جێبەجێکردن دەبینێ و ئەو توانایەیشی هەیە، کە دەربڕینێکە بۆ ڕۆشنبیری و پەروەردەو فێرکردن لە کەسێتی و دەرچە شارستانیەتەکەیدا، وە دەست دەکات بە بەگەڕخستنی توانا شاراوەکانی ناخی خۆی و پاڵنەرەکانی جێبەجێکردن لە خودی قەوارەکەی خۆی دا، کەوا دەکات کاروباری ڕۆشنبیری وپەروەردەو فێرکردن و ئامادەکردنی مرۆڤ لە چوارچێوەی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەکەی دا بێت، وە توانا داهێنەرانەکانی بتەقێنێتەوە لەسەر پلەی یەکەمی پەیژەی سەرکەوتنەکەی دایبنێ، هەموو پێویستییەکانی لەبەردەست دەبێت، ئیتر لێرەدایە کە دەتوانێت ئامێرو کەرەسەکان بەکاربێنێ لە هێنانەدی ئامانج و مەبەستەکانیدا، وە ئەم دام و دەزگایانەش دەبنە خاکێکی تۆکمە و بەپیت بۆ بونیادنانی کەسێتی ئەم ئوممەتەو پەرەپێدانی وزەو تواناکانی.

بەڵام ئوممەتە دواکەوتوەکان لاساییکردنەوە بۆتە پیشەیان، دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکاریەکانیان ڕەنگدانەوەی دەرچەو تایبەتمەندێتی یە شارستانیەتەکەیان نین، بەڵکو کۆمەڵێ دامەزراوە و دەزگای تێکەڵن لە تێڕوانینێکی دەست هەڵبەست و دروست کراو، ئەمەش لە تێڕوانین و ئاڕاستەکارییەکاندا دیارە، وە پێویستییە پەروەردەیی وفێرکاری و ڕاهێنانکاریەکانیان لە پاشکۆی لیستی گرنگی پێدانەکانی ئەم ئوممەتە دواکەوتووانەدان، هەر بۆیە ئەم بواری پەروەردە و فێرکردنە یەکەمین شتن کە لە کاتی قەیرانەکاندا زۆرترین زیانیان بەردەکەوێ و سستی داماوی دایاندەپۆشێ، دەناڵێنن بە دەست گرفتەکانیانەوە، ئێمەش زۆر لەوە دڵنیاین کە هەرکات تازەکردنەوەی وزەکان گەمارۆدراو چاککاری جێبەجێ کردن گەمارۆ درا –یان لاواز بوون– ئەوا هۆکارەکەی بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ جۆری ئەو ڕۆشنبیری و گەشەپێدانە پرۆگرامییەی لە پەروەردە و فێرکردندا هەیە و نەیتوانیوە ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە پێویستە، واتا لەڕاستیدا پشت دەبەستێ بە مرۆڤ وەکو عەقیدەکەی، ڕۆشنبیریەکەی، پەروەردەکەی، تواناو وزەکەی.

جموجوڵی ئوممەتەکان لە شارستانێتی ئاوەدانکردنەوەدا، جموجوڵێکی لولپێچییانەیە، جا یان دەروونی کەسەکان هاندەدرێت بۆ چاککردنی شێوازەکانی پەروەردە و فێربوون وخوێندن، کە ئەمەش بەرەو ئاسۆیەکی گەش و فراوانتری دەبات، وە یان ئەو شێوازە پەروەردەیی و فێرکاریانەی خوێندن فەرامۆشی دەکات و هاندەرەکانی دەپوکێنەوە و بەجێهێنانەکانی باش نین و ئەمەش بەرەو ئاستە نزمەکان و تەنگەبەرەکان دایدەبەزێنێ.

## ئیسلامییەتی مەعریفە ئەزمونێکی زیندووە

## لە چالاککردنی خوێندنی بالاٌدا:

(ئیسلامییەتی مەعریفە) ئامانج و دۆزێکی ڕۆحی و مەعریفی زانستی و پەروەردەییە، لە ناخی عەقڵی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتەدا چرۆی کردووەو گەورە بووە، بەوە دەناسرێتەوە کە باوەڕبوونی تێدایە بە پەیامی ئیسلام و پەیبردن بەڕۆح و وزەی شارستانێتی، کە لە بنەڕەتدا شارستانێتی ئیسلامی لەسەر دروست بووە و بووەتە هۆی بوژانەوەی شارستانیەتە مردووەکەی مرۆڤایەتی، وە ئاسۆی نوێی پێ گەشەدار بووە، کە بنچینەی ئەم شارستانییەتە بوو بە بناغەی بۆدامەزراندنی شارستانێتی ئوممەتەکانی دواتر، وە بەوەوە گەیشتنە بەدەستهێنانی دەستکەوتەکانیان، هاوکات گەلێ لە بەهاو چەمکە ئیسلامیەکانیشیان بۆ خۆیان برد، کە ئەوانە پێگەی گەورە بوون لەم ئیسلامەدا لە چاخە مێژووییە مرۆییەکەدا.

پێکهاتەی ئەم کۆمەڵەیە کە بە (ئیسلامییەتی مەعریفە) ناسراوە، بە گشتی بووەتە هۆی کۆکردنەوەی ڕۆشنبیریەکەی خۆی، لە مەعریفەی ڕۆشنبیری ومێژووی ئیسلامی لە لایەك و ڕۆشنبیری زانستە هاوچەرخەکان لە لایەکی ترەوە، هەر ئەم پێکهاتەیە بەوە دەناسرێ کە کامڵ و زیرەکە، بەهۆی پەراوە وەزیفی و زانستیەکەیەوە، واتا پێکهاتە هزریەکەی بە کۆی گشتی بەوە جیا دەکرێتەوە لەڕووی زانستییەوە کە (یەکانگیری مەعریفە)ی ئەوتۆی تێدایە کە کۆکەرەوەی هەردوو مەعریفەی (وەحی)و مەعریفەی زانستە مرۆیی و تەکنۆلۆژیەکانە، بۆیە دەگوترێ پێکهاتەیەکی تێرو تەواوی هەیە.

ئەم (یەکانگیری مەعریفە)یەو تەواوکارییەی پێکهاتەکەی لە کۆمەڵەیەکدا، لە نوسراوە بەراییەکانی هەندێ کەس دا دەرکەوتووە، لەو کەسانەی کە سەر بە تیمی خستنەکاری ئەم کارە گرنگە بوون، لەو کتێبانەش کتێبی (تیۆری ئیسلامی ئابوری: فەلسەفە و هۆکارە هاوچەرخەکان) لە نوسینی (خانجی– قاهیرە– ١٩٦٠ز)، هەروەها لەهەوڵ و کۆششەکانی ئەو تیمە لە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری ئیسلامی گەورەدا کە (یەکێتی قوتابیانی موسوڵمانە لە ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦٣)، کە دواتر بووە بنەمایەك بۆ دروستکردنی چەند دامەزراوەیەکی ئیسلامی گرنگ لە بزاوتی ئیسلامی مەعریفەدا، لە هەمووشیان گرنگتر (کۆمەڵەی زانایانی کۆمەڵایەتی ئیسلامی لە ئەمریکا و کەنەدا–١٩٧٢) وە (پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی–١٩٨١).

بنچینەی بیرۆکەی (ئیسلامیەتی مەعریفە) ئەوەیە کە جەوهەر و ناوەڕۆکی ئەو دەرد و شکستییانەی بەسەر هزری ئیسلامی و گەشەکردنەکەیدا هاتووە، پێش هەموو شتەکانی تر هۆکاری سەرەکیەکەی بۆ ڕوودانی ئەو قەیرانە دەگەڕێتەوە کە یەخەی ئەم ئوممەتەی گرتووە لە ڕووی کەمتەرخەمی بەجێهێناوە، هەر ئەو دۆخە ژێرییە بووەتە هۆی شێواندنی تێڕوانینی ئیسلامییانەو لەناوبردنی (یەکانگیری مەعریفە)و وایکردووە کە مەعریفەی ئیسلامی بگۆڕێت بۆ مەعریفەیەکی ئایینی بە دەقی بەستراوی چەق بەستوو، هاوکات مەعریفەی مرۆیی پەراوێز خراوە لە پێکهێنانی ئەم هزرە و جێبەجێ کردنەکەیدا، وە تۆوی ئەو زانستە مرۆڤایەتییانەی کە چرۆکانی لەبنەڕەتدا لە بنەماکانی فیقهی ئیسلامی و چەمکەکانیەوە وەرگیراوە، گۆڕدران وموتوربەکران، ئەمەش ئەو کارە بوو کە

دواجار بووە هۆی دارمانی ڕۆشنبیری ئەم ئوممەتەو بەرنامە هزری و دامەزراوەییکانی و یەکبوون و فەرمانڕەوایی و کاریگەریەکانیان وکاریشی کردە سەر وتاری ئاینی و وای لێکرد کە ببێتە وتارێکی وەعزدارانەی هەڕەشە ئامێز، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دیاردەی سستبوونی هزری و سەرهەڵدانی ستەم و تۆقاندنی سیاسی، دواجار بووە هۆی پێکهێنانی کەسێتییەکی ناهەموار و نەشیاو بۆ ئەم ئوممەتە، کە بریتیە لە (دەرونی کۆیلە) و ئیتر لێرەوە وزەی شارستانیەتی جێنشینێتی زەوی و داهێنەرانە لەکار خران، تا گەیشتنە ئەو ئاستەی لە ئێستا بە چاوی خۆمان دەیبینین کە ئەم ئوممەتە چەندە ڕیسوا و داماو کراوە و چەندە دواکەوتوویە، چونکە مرۆڤی ترسێنراو کە بە زۆر کارێکی پێ بکرێ، بە کەمترین کردن دەیکات، بەڵام کۆشش و خۆماندووکردن و بەخشین لە سیفەتی کەسێکە کە بۆ خۆی حەزی لەو کارە بێ و خاوەن ئامانج و مەبەستی دیار بێ، لە کوردەواریدا گوتراوە: (بەزۆر کەچەڵیان نارد بۆ مازوو کردن، لە داری هەڵنەڕوانی).

(بیرۆکەی ئیسلامییەتی مەعریفە) لەلای دامەزرێنەرانی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی، سەرەتای دەستکردنە بە نەخشەیەك بۆ دووبارە داڕشتنەوەی هزری ئوممەت لەسەر بنەمای (نەگۆڕەکان) لە ئیسلامدا و دەرچە مرۆییە جیهانیە شارستانیەتەکە، کە بەندە بە یەکتاپەرستی و جێنشینی مرۆڤ لەسەر زەویدا، وە ئەم نەخشەیە ئامانجی گێڕانەوەی ئەو تێڕوانینە ئیسلامییە گشتییە هەموارەیە کە خۆی لە بنچینە و بنەما و دەرچەدا دەبینێ، وە کار دەکات بۆ چاکسازی پرۆگرامی مەعریفی، بەو نیازەی کە بونیاتنانەکەی تەواو بکات لەسەر چەمکی گشتگیرانەی

شیکارییانەی ڕێکخرا و لەسەر یەکانگیری ڕێنمایی خودایی زانستە مرۆییەکان، کە ئەم دوانە لە یەکتر جیا ناکرێنەوە، ئەمەش بە مەبەستی پێکهێنانی واقعی ژیانی مرۆڤ لەم سەرزەویەدا تاکو بەو جۆرە ئامانجی هەڵگرتن و گرتنە ئەستۆی سپاردە خواییەکە لەسەر زەوی بەدی بهێنرێت لەلایەن مرۆڤەوە و بگەینە مەبەستە شەرعیەکان لە سەلامەتی بژاردەی مرۆڤەکاندا بۆ چاکسازی و خێرو بێر، وە بنەماکانی ژیریش –کە کەرەستەی جێنشینیەکەن– پابەند بێت بە یاسا خوداییەکان لەم گەردوونەدا، بەمەش هۆکارە پێویستەکان دەستەبەر دەکرێن بۆ بژارکردنەوەی ڕۆشنبیری ئیسلامی لەو شەخەڵانەی تێوەی گلاون و شێواندوویانە، هەروەها لەو شێواندنەی کە تێی کەوتووە لە جادوو خورافیات خەیاڵ و پیلانانی دژوار، جا ئەگەر ئەمانە بکەین، ئەوا بە پشتیوانی خودا سەرکەوتوودەبین لە دووبارە بونیادنانەوەی شارستانێتییە ڕاست و دروستکەرەکە و چاکسایە پەسەندەکان و بونیادنانەوەی ژیری و دەروونی و ویژدانییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگەو مرۆڤە موسڵمانەکان و پەروەردەکردنی نەوەی پڕ لە هێز و بەخشین و توتنا و داهێنانی شارستانی ئاوەدانی بە یارمەتی خودا.

(پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی) دایناوە کە کاری سەرەکی لە ئێستایدا بریتی بێ لە دواندنی ڕۆشنبیران و بیرمەندان و پەروەردەکاران و ژیری دروستکەران لە مامۆستایانی زانکۆ، بە جیاوازی پسپۆڕی و ئاڕاستە و هۆشیاریەکانیشیانەوە بەپێی سروشتی قەیرانەکە و بوونی چاکسازی پەروەردەیی مەبەستدارو ڕوونی تێڕوانینەکە بە ڕوویاندا، تاکو هەریەکەیان بەشدار بن لە هەڵگرتنی ئەرکی بەرپرسیارێتی خۆیان لە چاکسازی

ڕۆشنبیری و پەرەپێدانیداو چاکسازی کردن لە پرۆگرامەکانی پەروەردە و ڕاگیرکردنیان و چەسپاندنیان و خستنەکاری وزە شاراوەکانی ناو ناخی ئەم ئوممەتە، تاکو بە پشتیوانی خودا کاروانەکەی بخەینەوە ڕێ، ئەمەش کاری یەکەمی پەیمانگەکە دەبێت.

پەیمانگەی ناوبراو دەستی درێژ کردووە و داوای یارمەتی دەکات لە سەرجەم بیرمەندو شارەزایانی ئەم سەردەمەی ئوممەی ئیسلامی و جیهان تاکو هاوکاری هزری هاوبەش پێشکەش بەم پەیمانگەیە بکەن و چەندین دوانگە (منبر)ی موسڵمان هەیە بۆ ئەوەی لەو ڕێگایانەوە بیری هاوبەش و پرۆژەکانیان بخەنە کار، لە سەرجەم ئەو بنکە و دامەزراوەو کۆنگرە و کۆنفراس و چاپەمەنی و خولانەدا کە دەکرێنەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و زمانەکانی تری گەلانی ناو ئوممەتی ئیسلامی و دەرەوەش، ئەم کارو چالاکیانەش بوونیان هەبووە لەلایەن بیرمەندەکان و خوازیارانی چاکسازی هزری و پەروەردەیی، بوونەتە هیوایەکی گەش و دۆزێکی گەرم و گوڕ گرنگ و خراونەتە ڕوو لەسەر مێزی هزری زانستی و ئەکادیمی بەمەبەستی وروژاندن و بەگەڕخستنی تواناکانی ئەم ئوممەتەو دووبارە بونیادنانەوەی هزر تیایدا لە دەرچە شارستانیەتەکەوە.

ئەمەش گرنگترین کۆڵەکەی ڕاگرە بۆ دەستەبەرکردنی مەرجە پێویستەکانی ڕابوون و هۆشیار بوونەوەی ئەم ئوممەتە و خستنە جوڵەی توانا شاراوەکانی ناخی قەوارەکەی و سەرکەوتنی پرۆژە شارستانیەتەکەی، بەمەبەستی خزمەتی مرۆڤایەتی بەپشتیوانی خودای گەورە.

**ئەزمونی (ئیسلامییەتی مەعریفە)**

**لە زانكۆی ئیسلامی جیهانی لە مالیزیا:**

دەوڵەتی مالیزیای سەربەخۆ لەساڵی ١٩٥٦و هەستی بەوە کرد کە ڕێگەی بونیادنانی دەوڵەتەکەی لە پێشەو سەرکردەکانی هۆشیارکردەوە لە ڕۆڵی ئیسلام لە بزواندنی توانا شاراوەکانی گەلانی ئەم وڵاتە، کە زۆربەیان موسڵمانن، بۆیە بەهۆی کاریگەری کۆنگرەی ئیسلامی یەکەم بۆ فێربوون کە لە ساڵی ١٩٧٧ز لە شاری مەککە بەسترا زانکۆی ئیسلامی جیهانی (کوالا لامپور) لە ساڵی ١٩٨٣ز دامەزرا بە ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتییانە لەگەڵ ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی تاکو بکرێتە وڵاتێکی نوێ کە دەخرێتە سەر لیستی ناوی وڵاتانی خاوەن زانکۆی ئیسلامی جیهانی، لەناو زنجیرەی زانکۆ ئیسلامیەکانی تردا، کە ڕێکخراوەکە مەبەستی بوو ڕۆشنبیری ئیسلامی پەرە پێبدات، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە پێویست بوو بێ ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی خەرجی ئەم زانکۆیەی گرتبێتە ئەستۆ، چونکە دەوڵەتی مالیزیا خۆی ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ.

وە سەرکردایەتی مالیزیا بەئاگا بوو لەوەی کە سروشتی هزری چاکسازیانەی شارستانیانەی ئیسلامی بونیادنەر چەندە گونجاو و چالاکە، کە لە پەیمانگەی هزری ئیسلامی جیهانییەوە سەرچاوەی گرتبوو، وە یەکێك لەکۆنگرەکانیشی بەستبوو دەربارەی (ئیسلامیەتی مەعریفە) وچاکسازی کردنی سستمی مەعریفی لە (کوالا لامپور) لە ساڵی ١٩٨٤ز، کە لەو کاتەدا وەزیری پەروەردەی مالیزیا بریتی بوو لە (مامۆستا ئەنوەر ئیبراهیم) کە پەیوەندیەکی بەهێزیشی هەبوو هەر لەو کاتەوە کە ئەندامێکی ئەمانەتی

گشتی نەدوەی لاوانی ئیسلامی جیهانی بوو لە شاری ڕیاز، لەبەرئەوە وەزارەتی پەروەردە بانگهێشتی پەیمانگەی جیهانی هزری ئیسلامییان کرد بۆ پشتیوانی و هاوکاری کردنی زانکۆ تازەکە (هەزار خوێندکاری زانکۆ) و داوایان کرد کە کەسێکی پەیمانگەکە تەرخان بکرێ بۆ داڕشتنی پلانی چەمکە ئیسلامییەکانی مەعریفە و دەرچەکانی لەم زانکۆیەدا و پەرەپێدانی لە چوارچێوەی نەخشەیەکی پەروەردەیی زانکۆییدا وەك خزمەتێك بۆ ئیسلام و ئامانجە چاکسازی و پەرەپێدانەکان لە مالیزیادا.

پەیمانگەکەش کەسێکی بیرمەند و شارەزای بواری ڕێکخراوەیی و زانکۆیی تەرخان کردو زانکۆکەی پێ سپێردرا، بۆ ماوەی دە ساڵ (١٩٨٨–١٩٩٩ز) ئینجا دەست کرا بە دروستکردنی بینای ئەو زانکۆیە لە ڕووی مادی و ئەکادیمی، تاکو پرۆگرام و کۆلیژەکانی بگرێتەوە کە بریتی بوون لە کۆلیژەکانی زانستە ئیسلامی و مرۆڤایەتیەکان و سەرجەم زانستەکانی تریش وەکو بیناسازی و ئەندازەو پزیشکی و زانستەکان لە دوو بینای زانکۆییدا، وە بینای سێهەمیش تایبەت بوو بە ئامادەکردن و فێرکردن و ڕاهێنانی خوێندکارەکان لەسەر زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و تەواوکردنی خوێندنی قۆناغی ئامادەیی، بۆ ئەو قوتابییانەی لەو ڕێکخراو و خوێندنگایانەوە هاتبوون کە تێر نەبوون لە هەندێ لەو لایەنانەوە کە بۆ خوێندکاری موسڵمان پێویستن و هێشتا ئامادە نەکراون بۆ چوونە زانکۆ وەکو خوێندکارانی هەرێمەکانی ڕوسیای جاران و ناوەڕاست و ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، هەروەها خوێندکارانی سیستمی ڕۆشنبیری گشتی، کە ئامادەکردنی فێربوونیان لە یازدە ساڵی خوێندن زیاتر نەبووە.

## تەلار و مانا:

نەخشەی هەردوو تەلاری زانکۆکە ئامادە کرا، تەلاری سەرەکی لە (کوالا لامپور) وە تەلاری کۆلیژی پزیشکی و زانستەکان لە (کوانتن)، تاکو دەربڕێك بن بۆ داهێنان لە بیناسازی ئیسلامیدا، لەڕووی بینا و چەمکەکانی و چوستی جێبەجێکردن و ڕازاوەیی بیناکە و ڕەچاوکردنی ژینگەی شیاو و هەستکردن بە چێژ و خۆشی تیایاندا.

داهێنان و جوانکاری لە دروستکردنی ئەم زانکۆیەدا لە (بەشی ناوخۆیی و نیشتەجێکردنی پازدە هەزار خوێندکار)دا بەرچاو دەکەوێ، چونکە هیچ کەمتەرخەمیەك نەکراوە لە داهێنان و نوێگەری ڕازاندنەوەی ئەم بینایەدا و لە نەخشەی دروستکردنەکەیدا، کەوا دروست کراوە بووەتە جوانترین زانکۆ لە هەموو جیهاندا و چالاکترینیشیان، کە دەکرێت دەربڕینێك بێت لە نیشاندانی هونەری بیناسازی ئیسلامی داو چالاکترین زانکۆش بێ لە ڕێزگرتنی ژینگە و بەگەڕخستنی تواناکان، لەسەروو ئەمانەیشەوە لە هەموویان گرنگتر پرۆگرامی خوێندنە لەم زانکۆیەدا و نەخشەو پلانە ئەکادیمی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیەکەیەتی.

سەردانکار دەتوانێ لە دوورەوە ئەوە ببینێ کە لەناوەڕاستی تەلاری زانکۆدا مزگەوتێکی زۆر جوان هەیە و چەقی ڕۆحی زانکۆکە دەنوێنێ بەو هەموو قەشەنگی وڕازاوەییەوە کە هەیەتی و بەردەوام بە دەوریدا جمەی کارمەند و کرێکاران و خوێندکاران دێت لە هەموو لاکانیەوە، وەگۆڕەپانێکی گرنگیشی تێدایە بۆ چالاکییە ڕۆحی و ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکان و شێوازی بینای زانکۆکەش دڵئارامی و هاوپەیوەستی فەراهەم دێنێ بۆ هۆگربوونی

ڕۆح و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، وە پەیوەندی نێوان بەکارهێنانی بیناکان و خزمەتگوزارییەکان بە جۆرێکی نەرم و لاستیك ئاسایە بۆ گرتنە خۆی خەڵکی، وە دابەشکردنی شوێنەکانی نیشتەجێبوون و وەرزش و خۆشگوزەرانی و کاتبەسەربردنیش پابەندن بەو بنەما ئیسلامییانەی کە بۆ هەریەکە لە دوو ڕەگەزەکە (نێرو مێ)شیاوە لەگەڵ چوستی بەجێهێنان لە وەڵامدانەوەی پێویستییە دەروونییەکان و کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری و وەرزشی و کات بەسەربردنە خۆشەکان لە زانکۆدا، ئەوانەش بۆ خوێندکاران و مامۆستایان و دەستەی وانەبێژی و کارمەندان دابین کراون، تەنانەت بۆ منداڵی هەمووشیان بە گشتی هەر لە ئامێزگری و باخچەی ساوایان و سەرجەم هۆکارەکانی پەروەردە و فێرکردن و ڕاهێنان، بە مەبەستی چاودێری کردنیان و خۆتەرخان کردنی تەواوەتیان بۆ خوێندنێکی ڕاستەقینەو دەستەبەرکردنی کەشێکی دەروونی و ئاسوودە بۆ خوێندکاران و کاراو کارمەندان لە چوارچێوەی ئەم کۆشکە زانستییە ئیسلامییە شکۆدارەدا.

تەلاری ئەم زانکۆیە پابەندکراوە، بە مەرجی تەلاری ئیسلامییانەوە، کە تیایدا ڕێزی خەسڵەتە تایبەتییەکانی ئەم ئوممەتە دەگیرێ و خزمەت دەکرێ و کەشەکەش ئیسلامییانەیە و هەندێ داهێنانی بیناسازیشی تێدا کراوە بە مەبەستی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ خوێندکارەکان، وە ئەو کێشانەش چارەسەر کراون کە ئەم ئوممەتە بە دەستیانەوە دەناڵێنێ لە شێوازی ئەو بینا دروست کردن و تەلارسازیە تازەیەی تیایدا ڕەچاوی خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی ناکرێت و بگرە دۆخ و ژینگەکەیشی هەر

بۆ خوێندنی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە شیاو نین، وە من لەو باوەڕەدام کە کاتی ئەوە هاتووە تیمێکی تەلارسازی بێت توێژینەوە لەسەر ئەم پڕۆژەیە بکات و هەوڵ بدات بۆ ئەو کارەی چەندین خوێندکار ڕابسپێرێت کە توێژینەوەی نامەی زانکۆیی لەسەر ئەنجام بدەن و تیایدا بۆ کەسانی کارا لە بواری زانکۆ و تەلارسازەکان پێشکەش بکرێن، بە مەبەستی پشتگیریکردن لەو ئامانجە گەورانەی لەم پڕۆژەیەدا هاتوونەتەدی و بوونەتە خزمەتگوزاریەکی گرنگ بۆ سوودگەیاندن بە خەڵکی و بە زانکۆکانی تر لە سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیدا و لە هاوشێوەی ئەمەش لە جێگای خزمەتگوزارییە گشتییەکان.

## مەعریفە سرووشیە ئیسلامی و زانستە مرۆڤایەتییەکان:

پڕۆگرامی ئەکادیمی و پەروەردەیی –پێش هەموو شتێك– جەمسەر و ئامانجی سستمی زانکۆیەو نەخشەیەکیشە بە فێرکاری و پەروەردەیی ناسراوە، ئامانجەکانی (ئیسلامیەتی مەعریفە) بەرجەستە دەکات، وە هەوڵ دەدات بۆ چارەسەری ئەو شێواندنەی کە ڕووی کردووەتە هزرو پڕۆگرام و ئامێر و دەزگای پاکژکردنەوەی ڕۆشنبیری بونیاد دەنێ و کاردەکات بۆ دووبارە بونیادنانەوەی کەسێتی و پەروەردەیی نەوەکانی ئەم ئوممەتە.

کارە گرنگ و چالاکیە یەکەمەکە لە نەخشەی کاری کارگێڕی زانکۆدا ڕووبەڕووبوونەوە بوو دژ بە شێواندنە مەعریفی و پڕۆگرامییەکە، کە هزری ئوممەتی پێکاوە و تواناکانی تووشی ئیفلیجی کردووە لە ئاستی چاکسازی و بنیاتناندا و لە ئاستی پێگەیاندنی کادری ڕۆشنبیر و کارا و بەدیلی ئەوتۆ کە بیر و هزریان بەوە بناسرێتەوە کە باربۆکراون بە یەکانگیری مەعریفەی

ئیسلامی و گشتگیرییانەی پرۆگرام، وە گرنگترین گۆڕەپانی جێگرەوەی ئەم پرۆگرامە زانستییە ئەکادیمییە بەدیلەشی گۆڕەپانی زانستە ئیسلامی و مرۆڤایەتییەکان بوو.

بۆ ئەم مەبەستەش کۆلیژی (مەعریفەکانی وەحی ئیسلامی و زانستە مرۆڤایەتییەکان) دامەزرێنرا، تاکو ببێتە گەورەترین فاکەڵتی و پسپۆڕیە زانستیەکانی تێدا بخوێنرێت وەکو توێژینەوەی زانستی ئیسلامی و زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان ئەمە جگە لە زانستەکانی ئابووری و کارگێڕی و یاسایی، ئەمەش لەبەر خاتری هۆکارە پیشەییەکان، سەرەڕای ئەوەی کە بەرنامەکەیشی هەر هەمان مەبەستی ئامانجداری هەبوو.

بەردی گۆشە لەدیواری ئەم سستمە ئەکادیمیەی ئەم کۆلیژەدا بریتی بوو لە دەستبەکاربوون بۆ هێنانەدی پرۆژەی یەکانگیری مەعریفەی ئیسلامی و چاکسازی پرۆگرامەکانی هزر و پێگەیاندنی کادری ئیسلامییانەی ڕۆشنبیر و سەرکردایەتییانە و پیشەیی بەدیل لەم هەوڵانەدا بە بەکارهێنانی سستمی جووتپسپۆڕی (پسپۆڕی زانستی هاوچەرخ و زانستی وەحی) لە چوارچێوەی سستمی بەشە وانەکان بەپێی ژمارەی کاتژمێرەکان.

وە لەسەر بنەمای سستمی جووتپسپۆڕی، هەر خوێندکارێك (مێ، نێر) پسپۆڕییە سەرەکییەکەی بریتی دەبوو لە توێژینەوەی ئیسلامی و وانە ئیسلامییەکان وە دەبووایە جگە لەوەش پسپۆڕییەکی تر لە لقەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان هەڵبژێرێت، یان هەمان شت بە پێچەوانەوە واتە هەر خوێندکارێك (نێر، مێ) ئەگەر پسپۆڕیە سەرەکیەکەی زانستە مرۆڤایەتیەکان بووایە، دەبوایە پسپۆڕیەلقییەکەی توێژینەوە و وانە ئیسلامییەکان بووایە،

وه هەر كەسێكیش ساڵێكی زیاتر خوێندایه لەسەرو ئەوەوه ئەوا دەبوو به هەڵگری بڕوانامەی (بەكالۆریۆس)ێكی تر، ئەمەش ئەو پلانه بوو كه زانكۆ زۆر هاندەر بوو بۆی، تا خوێندكارەكانی ببنه خاوەنی دوو بڕوانامەی بەكالۆریۆس، بەمەش دەرچووی زانكۆكه دەبوو به خاوەنی دوو بڕوانامه، یەكیان له بواری زانسته كۆمەڵایەتییەكان و ئەوی تر له بواری پسپۆڕییه لقییەكەی كه خۆی هەڵیبژاردووه.

ئەم جووت پسپۆڕییه له مەعریفه و پسپۆڕیدا، به تەنها نەدەبووه هۆی ئەوەی كه خوێندكارەكه بكاته خاوەنی ئاسۆیەكی مەعریفی فراوانی ئەوتۆ كه تێر و تەسەلی پێوه دیار بێ له ئاڕاستەكردن و بەجێهێنانەكانیدا، وه لەپەیبردنێكی گشتگیرانەدا بۆ ڕەهەندەكانی ژیانی مرۆڤایەتی له ڕووی ڕۆحی سروشتی و یاسا كۆمەڵایەتی و گوزەرانییەكانەوه به تەنها، بەڵكو دەبووه سەرەتایەك بۆ تەواوكاریەكی بەشەكی (جزئی) پرۆگرامەكه (پرۆگرامی پێوانەكردن و بەراوردكاری له توێژینەوەی ئیسلامی دا) بەڵام بەشه گشتیەكەی بریتی بوو له (پرۆگرامی توێژینەوه كۆمەڵایەتییەكان) به خۆی و هۆكاره زانستییه جیاواز و هەمه جۆرەكانیەوه، ئەمەش كارێكی پرۆگرامییانەی گرنگ بوو بۆ تەواوكاری بونیادی ژیری خوێندكارەكان و ئایندەی تواناكانی له ڕووی جێبەجێكردنەوه. ئەم سستمه مەعریفییه نەبووه هۆی فراوان كردنی هەستەكانی خوێندكاران بۆ لایەنه گشتییه كۆمەڵایەتیەكان (توێژینەوه كۆمەڵایەتییەكان) بەڵكو گەشته لایەنی كایەی رۆحی و كەسیی(توێژینەوەی ئاینی و رەوشتی)، بووه هۆی ئەوەی پرۆگرامی خوێندن وا لێ بكات بتوانێت ئامرازی هزری له خوێندكارەكەدا دەستەبەر

بکات و فەراهەمی بهێنێت، تا بەردەوام وابەستە بێ بە ڕۆحی ئەم ئوممەتە و قەوارە دەروونی و مەعریفیەکەیەوە، وە خاوەن توانا بێ لە خستنەکاری کلیلەکانی جوڵەو وزە پێدانەکانی لەناو قەوارەی ئوممەتەکە خۆیدا، ئەمەش هەر بە تەنها نا، بەڵکو ئەم جووتپسپۆڕییە(توێژینەوە کۆمەڵایەتی و ئیسلامییەکان) بوارێکی وەزیفی وای بۆ دەرەخساند کە سوود وەربگرێ لە وزەی کادرەکان و شکۆی خۆیشی پێ بپارێزێت، بە تایبەتیش لەو وڵاتانەی کە موسڵمانان تیایاندا کەمینەن، یان ئەو وڵاتە ئیسلامییە هەژارانەی کە هەلی کاریان تێدا کەمە، بەتایبەتیش لەبوارەکانی خزمەتی ئایینیدا، کە دەرچووی ئەم زانکۆیە لەبەرئەوەی کراوەتە پسپۆڕی کۆمەڵایەتی و لەگەڵ ئەوەشدا فێری زمانی ئینگلیزی بووە لە خوێندنی وانە هونەریەکانداو فێری زمانی عەرەبیش بووە لە وانە ئیسلامیەکاندا، ئێستا دەتوانێت کار بکات لە هەر بوارێکی مەدەنیدا کە خۆی حەزی لێ دەکات.

بەم شێوەیە توانرا وا لە هەر کادرێك بکرێ کە بتوانێت کار بکات لە هەر بوارێکی حکوومی یان وانە وتنەوە یان کاری کۆمپانیا و بازرگانی و کاری تایبەتیدا، نەك بواری کاری پسپۆڕی خۆیان —کە ئەم جۆرە کاری دەستییانە شیاو نین لەگەڵ سروشتی تواناو جۆری خوێندنەکەیدا، بەم جۆرە دەرچووی ئەم زانکۆیە دەبێتە خاوەن توانا لە بوارەکانی توێژینەوەی ئیسلامی و وانە ئیسلامی و کۆمەڵایەتیەکانداو لە هەموو بارەکانیشدا زۆر تەواوتر و پێگەیشتووترە لە کەسانی شوێنانی تر لە ڕووی تواناو هزر و پەیبردن و هۆشیارییەوە، هاوکات بە توانایە لە ڕووی کردارییەوە بۆ جێبەجێکردنی

مەیدانی و زۆرترین کاریگەریشی دەبێت لەسەر هاوپسپۆڕییەکانی لە زانکۆو پەیمانگەکانی تر.

ئەم زانکۆیە لەم سستمەدا دەرفەتی بە دەرچووانی زانکۆ تاکمەعریفییەکان داوە کە بێن لێرە خوێندنی باڵا تەواو بکەن، ئەگەر مەرجە پێویستەکانیان تێدا بێت، تاکو پسپۆڕییەکەی خۆیشی تەواو بکات و ئاشنا ببێت بە مەعریفەکانی وەحی ئیسلامی لە پاڵ مەعریفە مرۆڤایەتییەکەیدا کە لە هەر بوارێکدا خۆی هەڵیبژاردووە.

هەر خوێندکارێك ئارەزووی خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی هەبێت، لە هەر لقێك لە لقەکانی مەعریفە بۆ ئاستی ماستەرو دکتۆراه، دەتوانێت ئەوەشی دەست بکەویَ ئەگەر مەرجەکانی تەواوکردنی ئەو خوێندنەی تێدابێ لەو بوارەدا، کە بریتییە لە زانینی زمانی عەرەبی بەباشی و ئامادەیی ئەکادیمییانە لەو ژمارە بوارانەی کە بنەڕەتین لە زانستەکانی شەریعەتی ئیسلامی بۆ گونجاندن و شایستەبوونی لەگەڵ خوێندن و تێڕوانینی زانستییانەی لەو بوارەدا، بەڵام ئەگەر لە بنەڕەتدا خۆی خوێندکاری وانە شەرعییەکان بوو، ئەوا پێویستە یەکێك لە بنەماکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بخوێنێت بە تەواوەتی لەگەڵ زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و دەبێ ئەو دووانە بەباشی بزانێت.

ئەگەر پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی ئەم بیرۆکەیەی پێش هەموو شوێنێکی تر خستبێتە ڕوو بۆ هەندێ لە زانکۆ ئیسلامیەکان و ئەوانیش وایان زانیوە کە ئیتر ئەمە دوا وێستگەیەو کەچی وەکو پێویست تا ئێستا ڕێزی ئەمەیان نەزانیوە و ئەو زانکۆیانە چەندێتی بە پەسەندتر دەزانن لە چۆنێتی،

بۆیە ئەو زانکۆیانە لە توانایەکی سنووردار‌دا ماونەتەوە و زۆر سوودبەخش نەبوون و تاکمەعریفەیی زاڵە بەسەریاندا.

(زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیا) لەبەر هەندێ هۆکار توانیویەتی سەرکەوتوو بێت لەپەیڕەوکردنی پرۆگرامەکانیدا، لەو هۆکارانەش، گرنگترینیان ئەمانەن: ئەو خوێندکارانە ڕوویان تێکرد وە کە پێشتر ئامادە کراون و ڕاهێنراون بۆ خوێندنی زانکۆیی لە بوارەکانی توێژینەوەی شەرعی و توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و پرۆگرامەکانیاندا و درێژەدان بەخوێندنی باڵا لە زانکۆکەدا، هاوکات زانکۆ دەستی کرد بە پەرەپێدانی پرۆگرامی فێربوونی زمانی عەرەبی، بۆ ئەو کەسانەی کە ناتوانن بەو زمانە قسە بکەن، لە چوارچێوەی پرۆگرامێکدا کە ئەمڕۆ بە باشترین شێواز دادەنرێت لەو بوارەدا، هەروەها خوێندکارانی زانکۆکانی تر زۆرتر پەرۆش بوون بۆ ئەوەی بێن و پەیوەندی بەم زانکۆیەوەبکەن، کە مەرجی وەرگرتنیان تێدا بوو، بەوەی کە بەباشی هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزییان دەزانی، ئەمەش هەر لەسەرەتاوە ئەم مەرجەیان تێدا بووە بەر لەوەی تەماشای داواکاریەکانیان بکرێت و وەربگیرێن، کە ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم زانکۆیە هاندەرێکی زۆر باش بووە بۆ ئەو کەسانە تاکو بە تەواوەتی و بە هەوڵ و کۆششی خۆیان فێری هەردوو زمانەکە بن، کە پێشتر لە وڵاتی خۆیان یان هیچ یان یەکێك لەو زمانانەیان زانیوە، یان خوێندکار خۆی هاتووە و لەسەر ئەرکی خۆی پەیوەندی بەم زانکۆیەوە کردووە و خۆی فێری زمانەکان کردووە، بۆیە زانکۆ کێشەی ئەوەی نەبووە کە داخوازەکانی مەرجی زمانی پێشوەختەیان تێدا نەبوو بێ بۆ خوێندنی باڵا، وە (وەرگرتنی جۆری) لەپرۆگرامەکەیدا زۆر

گەورەتر بوو  لە  وزەی جێبەجێکردن، بەمەش پڕۆگرامی زانکۆیەکە بۆ خوێندنی باڵا، بە هاتنەدی ئەو یەکانگیریە مەعریفیەو پڕۆگرامە تیۆری و توێژینەوە زانستییەکانی توانی درێژە بە بەردەوامی گۆڕەپانی هزری خۆی بدات بۆ پسپۆڕان و زانستخوازانی مرۆڤایەتی لە هەموو لقەکانی مەعریفە جیاوازەکاندا و ئەمەش لە ڕوانگەی ئەوەوە کە خوێندکارەکانی ئەم زانکۆیە بەو تێڕوانینە ئیسلامییە لەکاردا بوون کە بەندە لەسەر (نەگۆڕە ئیسلامیەکان)و بنەماو بەها و مەبەستەکانی، بۆیە بەم شێوەیە توانرا خوێندکارەکان ئامادە بکرێن و شیاندنیان بۆ بکرێ تا دەستبەکار بن بۆ قوڵبوونەوە لە بنەما ئیسلامییەکاندا و بکەونە گەڕان بەدوای توێژینەوەکانی ئەو بوارانەی کە خوێندوویانە بەپێی بواری پسپۆڕی خۆیان و ئەو ڕۆشنبیریە گەشەپێدراوەی تیایاندا پەرەی پێ دراوە لەسەر بنەمای تێڕوانینی ئیسلامی و خزمەتکردنی ئامانج و مەبەستەکانی.

بەڵام پەرەپێدانی ئەو ماددانەی دەخوێندرێن لەلایەن خوێندکارەکانەوە لەهەر لق و بەشێکدا بێت لە تێڕوانینە ئیسلامییەکەوە، ئەوا وا تەماشای دەکرا کە ئەمەکارێکی پەرە پێدەرانەی بەردەوام و درێژخایەنە و بە یەك جار و یەك هەنگاو کۆتایی نایەت و لە شەوو ڕۆژێکدا تەواو نابێ، سەرەتاکەی بەوە دەست پێ دەکات کە دەبێ خوێندکار هەموو ئەو شتانە بزانێ کە دێنە پێشی، هەر لە بابەت و ماددە زانستیەکانی زانکۆ مەدەنیەکانەوە تا دەگات بە هەڵسەنگاندنە ئیسلامییە ڕەخنەییەکە و خستنەڕووی ئەو شتانەی کە گەیشتوونە ئاستی کامڵبوون لە ڕوانگە ئیسلامیەکەوە بۆ ئەو بوارانەی خراونەڕوو، بە چەشنێك کە تێڕوانینە ئیسلامییەکە شتێکی زانستی نوێ

بخاته سەر بابەتە ئەكادیمیەكەی و كێش و قورساییەكەی زیاتر بكات. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی –كە تێپەڕبوونی كات– گەنجینەیەكی زۆر و گرانبەهای زانستییانە كەڵەكە ببێت لە بوارە زانستیەكانداو دەكرێت وردە.. وردە.. بە تێپەڕبوونی كات ئیشیان لەسەر بكرێت لە ڕووی دڵنیابوون لە ڕاستی و ناڕاستییەكانیان و پەرەپێدانی بوارەكانیان بە جۆرێك كە لە خزمەتی بەرژەوەندییەكانی ئەم ئوممەتەدا بن، بە شێوەیەكی كردایی و ڕاستەقینە لە بوارە مەعریفییەكەداو لە پێكهێنانی جۆری (كادرەكان)ی لە جێبەجێكردن و لەكاردا بوون و داهێناندا، هەر لێرەدا چەندین بەدیلی هزری و زانستی تێرو تەواو دەخرێنە ڕوو پێشكەش دەكرێن لە بوارە هەمە جۆرەكانی زانست و ژیاندا.

لەم ڕووەوە زانكۆ لەو ڕاستیەش بێئاگا نەبووە كە دەستەی مامۆستایانی زانكۆ دەناڵێنن بە دەست تاكمەعریفییەوە، وە ژمارەیەكی كەم لە خودی مامۆستاكان خۆیان تێرو تەواون لەو مەعریفەیەدا كە هەردوو جۆرەكە بێت، ئەوانەشیان كە شارەزایی و ڕۆشنبیرییەكیان لەو بارەوە هەیە بە هەوڵ و كۆششی تاكە كەسیانەی خۆیان لە ڕووی زانستیەوە پێی گەیشتوون، لەبەرئەوە زانكۆ (دبلۆم)ێكی تایبەتی داناوە بۆ ئەو مامۆستایانەی كە زانستە كۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەكان دەڵێنەوە، هەروەها بۆ مامۆستایانی زانستەكانی تریش و زانستە ئیسلامییەكانیش تاكو زۆرترین تەواوكاری مەعریفی لە مامۆستاكاندا بەدەست بێت و دروست ببێت.

زانكۆ بە پێدانی ئەم دبلۆمانە دەرفەتێكی ڕەخساند بۆ ئەوەی هەر كەسەو لەجێی خۆیەوە لەو ڕێگەیەوە كار بكات بۆ خۆ شارەزاكردنی لە

بواری مەعریفەکاندا ئەمەش بە مەبەستی بەدەست هێنانی تەواوکاری جێبەجێکردن لە کاری کادر و کارمەندانی ئەکادیمی زانکۆییدا، بە مەبەستی گەشەپێدانی مەعریفە لە ڕوانگە ئیسلامیەکەوە و بۆ پێشکەش کردنی خزمەتی زیاتری پێویستیەکانی ئەم ئوممەتەو ڕووبەڕووبوونەوەی سەردەمەکە، لەپێناوی گەشەپێدان بە هزری ڕەسەنی ئیسلامیانەی کۆکراوەدا، بۆ بونیادنانی زانستە ئیسلامییەکان، بە تاییەتیش زانستە کۆمەلایەتی و مرۆڤایەتییەکان.

لەپاڵ ئەم دبلۆمانەشدا، زانکۆ دوو دبلۆمی تریشی دامەزراند، یەکەمیان لە بەشی پەروەردەدا، بە مەبەستی پێگەیاندنی کادری پەروەردەیی و فێرکاری لە بواری توێژینەوەی خێزان و باواندا (لایەنی پەروەردەی دەروونی و ویژدانی) وە ئامادەکردنی ژمارەی پێویستی ئەم کادرانە بۆ ئامادەکردن و پێگەیاندن و شیاندنێکی ئەوتۆ کە گونجاو بێ لەگەڵ ئەم ڕەوتە (بڕیار لەسەر دراوە)ی خوێندنی زانستییانەی ئیسلامیدا، تا ئەو پسپۆڕییەش هاوکات ببێتە پێداویستییەکی بواری پسپۆڕی ئەکادیمیانەی زانکۆکە. ، وە دبلۆمەکەی تریش بۆ بەشی (دەروونزانی)یە، بۆپێگەیاندنی کادری پەروەردەیی و فێرکاری زانکۆیی لە بواری هزری داهێنەرانەو چارەسەرکردنی کێشەکان بەهەمان مەبەست، ئەمەش بەهۆی تووشبوونی رۆشنبیری ئوممەتی ئیسلامی و پەڕاوەکانی بەو سەقەتییانەی هێزی دەسەلاتخوازی تووشی کردووە.

هەر بۆ هێنانەدی تەواوکاری مەعریفی و گەشەی زانستی ئەکادیمییانە دەست کرا بە پەرەپێدانی زۆرێك لەو بابەت و مادانەی کە بڕیاریان لەسەر

دراوه بخوێنرێن له بواره زانستیه ئەکادیمیه پەیوەندیداره به پێویستییه تایبەتییەکانی ئەم ئوممەته و تێڕوانینەکانی له بوارەکانی ئایین و فەلسەفەو یاساو مرۆڤناسی و ئابوری و کارگێڕییەوه، که دەکرێت بگەڕێینەوه بۆ دەلیلی زانکۆکه که بۆ توێژینەوه زانستییەکان و خوێندنی باڵا له پڕۆگرامەکانی کۆلیژ و بەشه زانستییه جۆراوجۆرەکاندا، بۆ دەستخستنی ئەم بابەتانه.

هاوکات دەکرێت لێرەدا ئاماژەیەکیش بکەین بۆ بواری (توێژینەوه خۆراواییەکان) یان (توێژینەوەی خۆراوا) که له سەرەتاوه بوارێکی پسپۆڕی لاوەکی یه و وردە.. وردە.. دەبێته پسپۆڕییەکی سەرەکی، ئامانجی ئەم بەشه ئەوەیه که ئەم جۆره خوێندن و توێژینەوانەی وڵاتانی خۆراوا له ڕووی مێژووییەوه هەنگاو به هەنگاو بخوێنرێن هەروەها لایەنی هزری و شارستانێتی و چەمکییانەیان شی بکرێنەوه به شیکردنەوەیەکی ورد و قوڵ و ڕەخنەیی، که ئەمەش دەبێته یارمەتیدەرێك بۆ کادره زانستییه پسپۆڕەکان بۆ ناسینی توانای ژیری موسوڵمانان له پەرەپێدانی ئەم مەعریفەیەشدا له پاڵ پەرەپێدانی مەعریفەکەی خۆیدا، وه بۆ تێگەیشتن و ناسینی خۆراوا وەکو خۆی و ئەو سامانه کولتوورییەی که هەیەتی له شارستانێتی و مرۆڤایەتی و ئەوەی هەیەتی، بۆ ئەوەی کادری ئەم ئوممەته بەرچاو ڕوون بن و بەردەوامیش بن له درێژەدان به گفتوگۆی هاوبەش لەگەڵ خۆراوادا، به مەبەستی سەرخستنی پڕۆژەی چاکسازی ئیسلامی و هاوکاری کردنی کادرەکان بۆ هەر شتێك که پێویستیەتی بەپێی سستمەکەو ئامانج و مەبەسته شارستانیەتەکانی، بۆ ئەوەی پەرەسەندنی پەیوەندییەکان لەگەڵ

خۆراوادا ببێتە پەیوەندییەکی هەموار و بنیاتنەر و لەگەڵ خۆیدا ئەو شتانەش لەناوبەرێت کە بوونەتە کۆسپ و تاریکی و لێکتێنەگەیشتن و ستەم و چەوسانەوە و ڕق لە یەکتربوونەوە و هاوکات هۆکارێکی گرنگیش بوون بۆ دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی و لاوازبوون و کەرت و پەرتبوونی، واتە بەم پێیە دەتوانرێ کارێك بکرێت کە کارلێکی ئوممەت لەگەڵ دەستکەوتە شارستانیە هاوبەشەکاندا بێت، وە لەگەڵ کۆمەڵگەو وڵاتەکاندا بێت و ئەوەش لەسەر بنەمای تێگەیشتنی زانستی و ئەو بنەما پڕۆگرامیانەدا بێ کە عەقڵی موسڵمان وەریدەگرێ، هەروەها شیاوی سستمە ئیسلامییە شارستانیەتیەکە بێت و خاڵی هاوبەش کارا بکرێت لەگەڵ ئەم شارستانیەتە مادیە پەتیەدا کە بە شارستانیەتێکی مادیانەی پێشکەوتوو لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام هاوکات تایبەتمەندێتی و خەسڵەت و ئامانج و دەرچەی خۆی هەیە، وە مەبەست لە کارلێکردن لەگەڵ ئەم شارستانییەتەدا، واتا پێوەنکردنی ئەرێنی و بەرچاوڕوون و هەڵبژاردنی باشترین ئامانجەکان کە دەبنە مایەی خێر و خۆشی بۆ مرۆڤ و چاکسازی شارستانیەتە مرۆییە گەردونییەکە لەسەر بنەچەی سستمە ئیسلامییە پڕ لە خێروبێرەکە، کە لەسەر هەق و ڕاستی دامەزراوە و پڕە لە ئاشتی و دادپەروەری و خێرو بێر بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی و شارستانییەتە جیهانییە گشتییەکە.

بەڵام لە بواری توێژینەوە زانستییە فیزیایی وئەندازەییەکانەوە و ئەو حوکمەی هەیانە لە بوارەکاندا و لە پیشەکاندا، ئەوا (ئیسلامییەتی مەعریفە) تیایاندا پەیوەندی نییە بە ڕاستیە زانستیەکان و ڕووکارە فیزیکییە مادديەکانی و بوونەوەرە گەردوونییەکانەوە لەناو بەها پێدانەکان و یاسا

خوداییەکاندا، چونکە بۆ هەستکردن بەم ڕاستییانە هەموو مرۆڤەکان وەکو یەك وان.

بەڵام جیاوازییەکە لە پرۆگرامی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندایە، وە لە شێوەکانی پێملکردنیان و بەگەڕخستنیان و ئەو سەنگی مەحەکەی کە پێوەری ڕەوشتییە بۆیان ئاخۆ بەکارهێنانە کە هەموارە یان ناهەموارە، ئایا بۆ چاکسازیە یان بۆ گەندەڵی؟ ئایا سوودی دەبێ یان زیان؟ ئەمانەش هەموویان دەچنە خانەی عەقیدەی ئیسلامی و ڕۆشنبیری و فەلسەفەی زانستەکان و ڕەوشتی توێژینەوەی زانستی و کاراکردنی پیشەیی، لێرەدا تێڕوانینەکان و حەز و مەبەستەکان جیاواز دەبن، وە شارستانیەتەکان جیاواز دەبن، بۆ نموونە مرۆڤی باوەڕدار و موسوڵمان بە تێڕوانینێکی ئیسلامییانەی تاکپەرستانە دەڕوانێتە پێگەی هەریەکە لەوانەو ڕۆڵیان لەو چاکسازی و خستنەکارەدا کە پاك و پیس لێك جیادەکاتەوە هەروەها بەسوودو بێسوود، مرۆیی و ئاژەڵی، وە گیانی ژیان دەسازێنێ و ئامانج و مەبەستەکانی دەپێکێ و بەردەوامە لە درێژەدان بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا و دوورە لە نەفامی ماددە بینی پەتییانە و دوورە خوایی.

بوارەکەی تریش کە پەیوەندە بە زانستە فیزیاییەکان و ئامادەکردنی (کادرەکانی) بریتییە لە بواری هۆشیاری لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی، لەم بوارەشدا باس لە مێژووی هۆشیاری بەم ئوممەتەو مرۆڤایەتی و دەستکەوت و ویژدانی ئەم ئوممەتە دەکرێ، وە باس لەوە دەکرێ کە ئیسلام دوور بووە لە پاشکۆیی و لایەنگری خۆراوا لە ڕووی ستەم و خوێنڕێژیەکانیەوە، وە کار

دەکرێت لەسەر متمانەبەخۆبوون لەناو ناخی (کادر)ە زانستیەکانی ئەم ئوممەتەداو ڕەواندنەوەی گومانەکانیان و وەرگرتنی ئەو پەندانەی کە تێیاندەگەیەنێ لە بارەی هۆکارەکانی دواکەوتنی ئەم ئوممەتە لە کاروانە مادیەکەداو گومڕابوون و ڕێلێونبوونی و وای لێکردووە کە مرۆڤی موسوڵمان سارد بکاتەوە لە گەرم و گوڕی کار و زانستخوازییەکەی و چوونی بەرەو خاوبوونەوەو دەستەوسانی و خەون و خەیاڵ و خورافات و دابڕان لە واقیع و هۆکارەکانی تری دواکەوتوویی ئەم ئوممەتە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا لە داڕشتنی میکانیزمی پرۆگرامی ئیسلامییەتی مەعریفەدا، چەمکی پەرەپێدانی بەرنامەکانە (Process)کە بەردەوامی و خۆڕاگری لەسەر کار دەنوێنن و پەرە بە هێنانەدی ئامانجە شارستانییەتە پڕ لە خێرە زیندووەکان دەدەن و بوونەتە مایەی چالاکی و جوڵە و گەشە و بەرە و پێشچوونێکی بەردەوام، هزر و ڕۆشنبیری دەوڵەمەنتر دەکات، وەڵامی داخوازیەکانی کۆمەڵگە زیندووە پێشکەوتوو خوازەکان و واقعی ژیانیان دەداتەوە، ئەمانەش لەو دەرچەیەوە هاتوون کە دەرچەی ئیسلامی انەی نەگۆڕی ڕەوشتن تا دەگات بە مەبەست و ئامانجە خێردارە ڕوون و دیارەکان.

پەرەپێدان بە مادە و بابەتە بڕیار لەسەر دراوەکانی خوێندن و هەمە جۆرییەکەیان کارێکی بەردەوامە و نەوەستاوە و بەندە لەسەر دەرچەکانی (ئیسلامیەتی مەعریفە) تاکو ببنە مادەیەکی زیندوو لە گەشەپێدان و نوێکردنەوەی شارستانییانەی داهێنەرانە و بەردەوام، ئاوێتە بوو بە شارەزایی و کارامەیی و ئەزموون و وەڵامدانەوەی بەردەوامی پێویستییەکانی

ئەم ئومەتە و کۆمەڵگەو هاوکاریکردنی بونیادنانی مەعریفەیەکی هەمیشە تازە بۆ خوێندکاران و داخوازانی مەعریفەی ئیسلامی و کادرە جێبەجێکارەکانی و فراوان کردنی ئاسۆی بیریان وایان لێ بکات کە هەمیشە پڕ بن لە وزەی زانستی ودەروونی شاراوەی ناخیان و بەردەوام بن لەبەگەڕخستنی ئەم تواناکانەیاندا.

ئەم تێڕوانین ونەخشەیە بووە هۆی ئەوەی کە دەرچوانی ئەم زانکۆیە لە ڕووی زانستی و دەروونیەوە سەرکەوتوو بن و زۆرێك لە کۆمپانیا و کەرتە حکوومییەکان لە وڵاتی (مالیزیا)دا داخوازن بۆ ئەوەی ئەم کادرە دەرچووانە دابمەزرێنن لە بواری پیشە جیاوازەکاندا، بەهۆی هەبوونی ئەو توانا زانستی و پسپۆڕی و ڕەوشتە بەرزانەیان و ڕۆشنبیری و وزەو توانا شاراوەکانیانەوە، تا ئەو ئاستەی کە هەندێ لەو شاند و نوێنەرە فەرمییانەی لە وڵاتانی ترەوە سەردانی ئەم زانکۆیەیان کردووە بە تکاوە داوایان کردووە کە ئەم زانکۆیە هاوکاریان بێت تاکو لە زانکۆکانی ئەوانیشدا کادری لەم جۆرە بەرهەم بهێنرێت لە ڕووی زانستی و پیشەیی و چوستییە بەرزەکەیانەوە.

ئەوەی کە کرا، ئومێدێکمان پێدەبەخشێ و متمانەمان پێدەدات بەوەی کە بەردەوام بوون لە پەرەپێدانی مەعریفەی ئیسلامیدا، ڕاستییەکەو دەکرێت بێتە دی، ئەوەتا ئەم درەختی ڕەنجە هاتە بەرهەم، بەرهەمەکەی کەڵەکە کرا، تا ببێتە زانست و مەعریفەیەکی کامڵ و لە داهاتوودا بەشدار بێت لە بووژانەوەی ئەم ئوممەتەدا و پەرەپێدانی تواناکانی و خستنەوە سەر شاڕێی کاروانی شارستانییەتی ئیسلامی داهێنەرانەی مرۆڤانەی پڕ لە خێروبێر بە پشتیوانی خودا.

## زمانەکان و بەعەرەبیکردن:

کاتێك هزرو پرۆگرام کرۆکی کارەکە بن، ئەوا زمانەکان ئامرازن، لەبەرئەوە زمان بایەخێکی گەورەی هەیە لە چالاککردنی کارو جێبەجێکردنیدا، ئاسانکارە و هۆکارێکی سەرکەوتن و بەئاکام گەیشتنە و چاکتر بەخت دەکاتە یاوەر. زانکۆش زمانی کردووەتە بابەتێکی جێبایەخ و گرنگییەکی زۆری پێداوە بۆ دڵنیا بوون لە توانای دەرچووانی زانکۆکە لەو ڕووەوە کە بە باشی فێری بوون و دەتوانن بە چاکی بەکاری بهێنن، وە دەرفەتی گەشەپێدان و بەیەکگەیشتن و گفتوگۆی نێوانیانی ڕەخساندووە، بە جۆرێك کە بتوانن بەهۆی ئەم زمانانەوە لە پەیوەندی گەرم و گوڕدا بن، بۆیە زانکۆ کاری کردووە بۆ ئەوەی خوێندکارەکانی جگە لە زمانی دایکیان زمانە جیهانییەکانی وەکو عەرەبی و ئینگلیزیش بەباشی بزانن، کە ئەمەش کارئاسانییەکە بۆیان تاکو بتوانن بگەنە سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە ئیسلامی و زانستی و تەکنۆلۆژییەکان، ئەمەش لە چوارچێوەی ڕەچاوکردنی دابینکردنی پێویستی بۆ خوێندکاران و لەچوارچێوەی بارودۆخ و واقیعی جیهانی ئوممەتی ئیسلامی.

زانکۆ سوور بووە لەسەر دەستەبەرکردنی هۆیەکانی فێربوونی زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بە باشترین شێوە لە چوارچێوەی پرۆگرامی زانستی پێشکەوتوودا، وە بە مادە و ئاراستەکردنێکی ئیسلامیانەوە، تاکو زمانی عەرەبی بکاتە زمانی ڕۆشنبیری و مەعریفەی مەبەستە شەرعییە ئیسلامییەکان و زمانی پەیوەندی ویژدانییانەی ئیسلامی لەنێوان ڕۆڵەکانیدا —وە زمانی ئینگلیزیش— لەم قۆناغەدا کە مادە و بابەتە زانستی و

تەکنۆلۆژییەکان کەم و لاوازن بە زمانی عەرەبی و زمانەکانی گەلانی ناو ئوممەتی ئیسلامی– زمانی مەعریفەی زانستی و تەکنۆلۆژی هاوچەرخە، کە لەلای کادرە زانستی و سەرکردە ئیسلامییەکان زمانی مەیدانییانەی کار و پەیوەندیەکانە لەگەڵ چینی پێشەنگ و پێشەوایانی هزری و ڕۆشنبیری و زانستی و سیاسی لەم قۆناغەدا لە وڵاتە جیاجیاکانی جیهان و سەنتەرەکانی بڕیار و مەعریفەی زانستی و هاوکات زمانی نێوان تاکە کەسەکانی چینی زانستخوازانە لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکانیشدا.

وە بەهۆی ئەوەوە کە خوێندکارەکە ئەو دوو زمانە (عەرەبی و ئینگلیزی) دەزانێت دەبێتە کادرێکی بەتوانا بۆ کارتێکردن لەسەر بواری کار و جێبەجێکردن و زانست و ویژدان لە وڵاتەکانی خۆیانداو دەشبنە سەرچاوەیەك بۆ گەشەکردنی هزر و مەعریفەکان لە کۆمەڵگەکانیاندا.

ئومێد وایە کە دامەزراوە زانستی و ئیسلامی و ڕۆشنبیریەکان، لە ئاستی ناوخۆیی ونێودەوڵەتیشدا دەنگدانەوەیەکی گەورەیان هەبێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی زمانەوانی ئەم وئوممەتە بە یەکجارەکی، ئەو کێشە زمانەوانیەی کە ڕۆڵی گەورەی هەبووە ـ تا ئێستاش هەیەتی ـ لە لاوازکردنی شارستانیەتانەی ئەم ئوممەتە و پەرت بوون و لێکهەڵوەشاندنیدا لە ڕووی سیاسییەوە. جا ئەگەر ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان، بەتایبەتی کاروباری ڕۆشنبیری و زانستی ئەم ئوممەتە بەزمانی یەکەم نەبێت بۆ گەلانی ناو ئوممەت ئەوا ڕۆشنبیری ئەم ئوممەتەو گەلەکانی دەبێتە ڕۆشنبیریەکی مەعریفی لاواز و سنوردار لەلای وەرگر و گوێگر و ناچار پەنا دەبات بۆ بەکارهێنانی ئەو زمانە بیانیەی کە دەوڵەمەندە بە وشە و زاراوەی زانستی و

مەعریفی، لە هەمووشیان گرنگتر زمانی ئینگلیزی کە لە ئێستادا و لەهەموو بارودۆخەکانی وڵاتانی ئیسلامیدا بووەتە زمانی دووەم، ئەمەش وای کردووە کە کەمینەی زمانی یەکەم دەرفەتیان بۆ نەڕەخسێ بۆ هێنانەدی تواناکانی داهێنان، چونکە داهێنان بە زۆری بۆ بەزمانی یەکەمی مرۆڤ دەکرێت، واتا داهێنەر بە زمانی دایکی دەدوێ. وە ئوممەتی ئیسلامیش ناتوانێت هاوسەنگی خۆی هەبێ لە ڕووی زانستی و ڕۆشنبیری جیهانییەوە، مەگەر بە زمانە جیهانیە فراوانەکەی کە زۆرینەی خەڵکی سەرزەوی پێی دەدوێن، زمانێکی ئەوتۆ کە تێرو پڕ و دەوڵەمەند بێ، بە تایبەتی لە بواری مەعریفەی فیزیا و تەکنۆلۆژییادا، ئەم مەرجەش بۆ ئەم گەلانەی ناو ئەو ئوممەتە نایاتە دی، مەگەر هەر بەو زمانە قورئانییەی کە هەموو گەلە موسوڵمانەکانی جیهان لە ڕووی باوەڕ و ویژدانەوە بە یەکترەوە پەیوەست دەکات، تەنانەت نەخوێندەوارەکانیشیان قسەی پێ دەکەن –لەڕێی قورئانەوە– بە ڕادەیەك کە خراپ نییە بۆ قسەکردن و لێکتێگەیشتن، ئەگەر ئەوە بکرایەتە پرۆگرامگەرایی لە ئێستادا باشتر بوو هەروەکو لە ڕابوردوودا وابووە.

ئەم گەلانە زمانێکی جیهانی وایان هەیە کە لە جیهاندا پەسەندە و هاوبەشە لەنێوان هەموویاندا، دەتوانن کە هەر بەو زمانە مادە زانستییە تەکنۆلۆژیەکەش دابین بکەن و ڕۆشنبیری و ویژدانیشیان بە کەمترین تێچوون مسۆگەر بکەن. گەلە موسڵمانەکان کەمتەرخەم نابن لە پەرەپێدان و گرتنە خۆی زمانی قورئان، وەك زمانی ئایین و ڕۆشنبیری و زانستەکانیشیان، لەپاڵ زمانە لۆکاڵی و کرمانجە گشتیەکانی خۆیاندا، هۆکارەکەیشی بەهۆی هەبوونی خۆشەویستی زۆریان بۆ پەیوەست بوون بەم قورئانەوە، بەڵام بە

مەرجێك كە ئاسانكارییان بۆ بكرێ وە وایان لێ بكات كە زانینی ئەم زمانە هەموو پێویستیەكانی ژیانیان بۆ دەستەبەر بكات و ناچاریان نەكات پەنا بەرنە بەر زمانی تر، هەموو ئەوەی كە پێویستە لەسەر گەلانی عەرەب و گەلە موسڵمانەكان ئەوەیە كە سەرنج لە ڕابردوویان بدەن لە چۆنیەتی بە عەرەبیكردنی شتەكان، وە وردببنەوە لە ئوممەت و گەلە پێشكەوتووەكانی ئێستا لەو خێرا گواستنەوەیەی تیایاندایە بۆ هەر شتێك كە تازە بێ بۆ ناو زمانەكەی خۆیان لە مەعریفەو زانیاری، بەتایبەتیش مەعریفە فیزیایی و تەكنۆلۆژیەكانی یابان و ڕوسیاو چین و ئەڵمانیاو ئەمریكاو هاوتاكانیان.

یەكەمین شتێك كە دەبێ موسوڵمانان تواناكانی خۆیانی بۆ بخەنە گەڕ لە وەرگێڕاندا بۆ زمانی عەرەبی ئەوەیە كە بایەخ بدەن بە خولە زانستی و تەكنۆلۆژیەكان و وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی عەرەبی، چونكە ئەم شوێنانە یەكەمین كەناڵن كە دواتر لەوانەوە لافاوی وشە و داهێنراوە تازەكان و مەعریفەكان هەڵدەكەن و دەگوازرێنەوە بۆ ناو زمانی گەلان، وە پاشان ئەم مادە زانستییانە دەگەنە دامەزراوە زانستی و فێركاری و كتێبخانە گشتییەكان و لەڕێی كەناڵە ئەلكترۆنیەكانیشەوە بە شێوەیەكی زۆر خێراو ڕێك و پێك بەڕێدەكەوێت، ئەمەش بەو شێوازە پەیڕەو دەكرێ لەو وڵاتانەی كە گەیشتوونەتە سەركەوتن و پێشكەوتنی زانستی لە ماوەیەكی كەمدا.

تێچوونی خەرجی دامەزراندنی دامەزراوەی وەرگێڕانی زانستی و پەخشی زانستی و ئەركەكانیان بە شێوەیەكی بەردەوام و بێوچان بۆ وەرگێڕانی

تازەی زانست و مەعریفەکان لەشێوەی خول و کۆرسی ڕێکخراودا و پاشان دابەشکردنی بەسەر بازاڕەکانی کاری ئوممەتدا و دامودەزگاکانیدا بە شێوەیەکی چالاك و کارا تێچوونی خەرجی هەموو ئەوانەی باسمان کرد کەمترین بڕی پێویستە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە زانکۆیەکی گەورەی پایتەختی یەکێك لە زۆر لە پایتەختەکانی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی.

بڵاوکردنەوەی مەعریفەی زانستی بە زمانی قورئان دەبێتە مایەی زیادبوونی داخوازی لەسەر ئەم زمانە و ئەو مەعریفە ئایینی و ڕۆشنبیری و زانستیی و تەکنۆلۆژیەی تێیدایەتی و وا دەکات کاری وەرگێڕان ببێتە کارێکی بازرگانی و لە کاتی دیاریکراوی خۆیشیدا تەواو بکرێت و وا دەکات کە وەرگێڕانی بابەتەکانی خوێندن بۆ سەر زمانی عەرەبی بکاتە کارێکی ئاسان و کاریگەر، وە سەرجەم ئەو بیانووانەش دەبڕێ کە ڕێگرن لە بەردەم ئەوەدا کە نابێ خوێندن بە زمانی عەرەبی بێت لە هەموو بوارەکاندا، ئەمەش نەك بە هۆی سروشتی زمانەکە و توانا گەورەکەی لە بواری دەربڕینی ورد لە زانست و مەعریفە هەمە جۆرەکاندا بە هەموو شێوەکانیانەوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە زمانی قورئان دەستەوسان کرا بوو سەبارەت بە زمانی زانستی مەعریفە تازەکان کە زیاتر زمانی گەل و میللەتە زیندووە هاوچەرخەکانە وەرگێڕانی زانستییانەی هەڵقولاوی سروشتی هەر بە شێوەیەکی خودییانە کێشەی زاراوەکان چارەسەر دەکات و بایەخ بە زاراوە یەکانگیرەکان (یەکزاراوەیی) دەدات لەڕێی پەخشکردن و بڵاوکردنەوە و بەکارهێنانیانەوە،

پێویستە ئەم هەوڵە پشتگیری لێ بکرێ و (کۆمەڵەیەکی زمانەوانان)ی ناوخۆیی بۆ دروست بکرێ کە بە (هاوهەوڵی) کاری بۆ بکەن بۆ درێژەدان بە کاروباری کاروانی بە عەرەبیکردن و وەرگێڕانی زاراوە یەککگرتووەکان، بە جۆرێك کە کارەکە پوخت بێ و دوور بێ لە هاوار و تاسەی دابڕاندن کە بەهۆی پاڵنەرە سیاسییە ناهەموارە نەخۆشەکانەوە ڕوودەدات، کە دواجار تەنها ئامانجەکانی بیانی و داگیرکەران دێنێتە دی.

## ئاسانکاری زمانەوانی (ڕێزمان و ڕێنووس):

کاتی ئەوە هاتووە کە سەرجەم کۆمەڵە زمانەوانەکانی زمانی عەرەبی هەوڵەکانیان یەکبخەن بۆ کۆششی زیاتر و هاوبەشی بە مەبەستی کارئاسانیکردن لە ڕێزمان و ڕێنووسی عەرەبیدا بۆ کۆی گشتی ئەم ئوممەتە و بیکەنە قەڵغانی پاراستنی ڕۆشنبیری و هاوکاریکردنی بە پێوەری تێگەیشتنی قورئانیانە و پاراستنی باش لێتێگەیشتنەکە و هەر ئەمەش مسۆگەر کردنێکە بۆ تێگەیشتن لە کولتوورو پارێزگاری لێکردنی، لەسەروو ئەمانەشەوە دەکرێت ئەوەش تێپەڕێنرێ بۆ ئاسانکاری فێربوونی زمان و سەلامەتی و دروستی بەکارهێنانی لە سەردەم و چاخێکدا کە فێربوون و ڕۆشنبیری بووەتە مافی هەموو کەسێك و گشتییە، نەك هەر بۆ کۆمەڵێ یان چینێکی تایبەت لە پسپۆڕان و هاوکات دەڕوات لەگەڵ گەورەبوونی داخوازیەکانی مەعریفە و فراوان بوونی ئاسۆکانی.

لە کاتێکدا ئامراز و کەرەسەکانی مەعریفەی ئەلکترۆنی کارئاسانییەکی زۆریان کردووە بۆ توانای مامەڵەکردن لەگەڵ زمان و دۆزینەوەی نهێنیەکانی

و کردنەوەی گرێکوێرەکانی، ئەوا کارەکە ئاسانتر کراوە بۆ شارەزایی زیاتری شیکارییانە بە هەموو دەرکەوتە زمانەوانیەکانیەوە و دۆزو لایەنە هەمە جۆرەکانیەوە کە بۆ زانایانی پێشین ئەم ئاسانکارییانە نەبوون، واتا بۆ زانایانی زمانەوانی، بۆیە ئومێدی ئەوە هەیە کە زانایانی زمان هەوڵەکانیان یەك بخەن و سەرکەوتوو بن لەم سەردەمەدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕێزمان و ڕێنووس.

وە یەکێك لە نموونەکانی ئەو گرانی و قورسییەی لەو زمانەدا هەیە و هەندێ کەس پێیان وایە کە ئەوانە لەم سەردەمەدا بەو وردەکاریەوە پێویست نین، بریتیە لە ئالۆزی یاساکانی دانانی (هەمزە) لە ڕێنوسی عەرەبیدا، کە دەکرێت لە سەرەتا یان ناوەڕاست یان کۆتایی وشەدا هەبێت، کە پێویستە نوسەرەکەی بزانێ چۆن نیشانە دەدات بەو هەمزەیە لەگەڵ زانینی نیشانەی وشەکەی پێشیەوە، ئەوەش کراوە بە مەرج بۆ دانانی ڕاست و ڕەوانی هەمزەکە، کە مەرجی لەم جۆرە لە پیتەکانی تری ڕێنوسی عەرەبیدا نیە، وە بەهۆی توندی و گرانی ئەم یاسایەوە، تەنانەت بۆ کەسێك کە شارەزاییشی هەبێت، زۆرینەی خەڵکی هێشتا هەر هەڵەی تێدا دەکەن، وەك ئەوەی کە ئەم یاسایە دانرابێ بۆ دڵنیابوونەوە لە نەزانینی نووسەرەکەی، نەك بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێنووسەکەی، بە هەمان شێوە بۆ پیتە نەرمەکانیش، ئەوەتا دانان و دەربڕینی پیتی (ئەلف) لە کۆتایی فرمانێکی (کارێکی) وەکو (رَمی) بە شێوەی ئەلفی مەقصوورە دەنوسرێ، کە لە شێوەی پیتی (یاء) دایەو دوو خاڵەکەی لەژێردا نیە، کەچی هەمان

دەنگ لە کۆتایی کاری (دنا)دا بە ئەلفی مەمدوودە دەنوسرێ ئەمەش وەك دەلالەتێك بۆ بنچینە ڕەسەنەکەی فرمانە (واوی)یەکە.

دەشزانین ئەو کەسەی کە دەتوانێت بزانێت بنچینەی فرمانەکە (ڕەگی فرمانەکە)، (یائی)یە یان (واوی)یە پێویستی بە ئەلفی مەقصوورە و ئەلفی نەرم نییە (کە لە شێوەی یاء دایە) تا جیاوازی بکات لە نێوان فرمانی (واوی)و (یائی)دا، بەڵام ئەو کەسەی پەی بە ڕەگی فرمانەکە نابات ئاخۆ (یائی) یە یان (واوی) یە، ئەوا زۆربەی کات دەکەوێتە هەڵەوە، یان هەر بە ڕاهاتن وەك لاساییکردنەوە دەینوسێت و هۆکار و ناوەڕۆکەکەی نازانێ، بۆیە هەندێ جار ڕاست دەینوسێ و هەندێ جاری تریش هەڵە دەینوسێ، بە گشتی ئەمە ڕێزمانێکە و ئەم یاسایانەی تێدایە و پێویستیش ناکات هەموو خەڵکی ئەمە بزانن، چونکە زانینەکەی سوودێکی ئەوتۆی نییە کە شایانی باسکردن بێت، لەبەرئەوە پێویست بەوە ناکا ئەم زمان و ڕێزمانە لەسەر خەڵکی قورس بکرێت بەم جۆرە یاسا زمانەوانییە ئاڵۆزانە، چونکە ئەوە تەنها ڕێنوسیان لەلای قورستر دەکات و یادگە (**ذاکرة**)یان ماندوو دەکات بەتایبەتیش بۆ فێرخوازان، ئەمەش تاکە نموونە نییە، گەلێك نموونەی تری ئاوامان هەیە کە دەکرێت ئاسان بکرێن و یەکانگیر بکرێن، نەك ئاڵۆز بکرێن، بۆ نموونە: دانانی (ئەلف) لە کۆتایی فرمانی ڕابوردوو و فرمانی ئێستایی (گوزارە) کە ئاخۆ (مەنصوب) بێت یان (مەجزوم) بێت یان لە فرمانی داخوازی (أمر) بێت، وەکو (كتَبوا، لن يكتبوا، لم يكتبوا، اكتبوا) لە کاتێکدا ئەلفەکە لادەبرێ کاتێك کە (کۆی نێرینە)ی سالمی مەرفوع بە واوی دەخرێتە پاڵ ناوەکەی دوایەوە وەکو (حضر مدرسو المدرسة)، هەروەها ئەلفی درێژی

لابراوی موقەددەرە لە (هاذا: هذا) و (هاذە:هذە) و (لاكن:لكن)و (ذالك: ذلك)و (أُؤلائك)و.... هتد، كە لەم بابەتانە زۆر شتی وامان هەیە.

کەواتە گرنگە سەرلەنوێ چاو بخشێنرێتەوە بە بونیادنانەوەی یاساکانی ڕێزمان و ڕێگەکانی فێربوونی، وە ئەگەر ئەوە بە گرنگ دابنرێ کە دەبێ جیاوازی بزانرێ لەنێوان (فاعل: بکەر)و (مفعول بە: بەرکار)، بە تایبەتیش لەو کاتەدا کە (بەرکار) بکەوێتە پێش (بکەر)ەوە، چونکە ئەمە کاریگەری دەبێ بۆ سەر واتای ڕستەکە، وە ئەگەر نیشانەکە سوودێکی ئەوتۆی نیە لەو ناوانەدا کە بە (ئەلفی مەقصورە) کۆتاییان هاتووە وەکو (لیلی)و (منی) و ئیتر ئاسان نیە (بکەر) و (بەرکار)ی تێدا جیا بکرێتەوە، چونکە بەندە بە جۆری نیشانەکەوە، ئەوا هەر دەبێ ڕێکخرێ لە پێناوی گەیاندنی واتای ڕاستەقینەی ڕستەکە، ئەگینا جیاوازی کردنەکە بەهۆی جۆری نیشانەکەوە هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نیە بۆ کاریگەری لەسەر تێگەیشتنی واتای ڕستەکە، لە جیاکردنەوەی (صفە: ئاوەڵناو) و (حال:بار)، چونکە نیشانە ئیعرابییەکە خودی خۆی کار ناکاتە سەر تێگەیشتنی سیفەتی کەسەکەو بارودۆخی کەسەکە، هەموویان لە دواجارداوێنە و سیفەتن، ئاڵۆزی لەم جۆرانە پێویستییان بە دووبارە پێداچوونەوە هەیە لە زۆربەی یاساکانی ڕێزمانیدا.

رای ئێمە ئەوەیە کە بزاڤی چاکسازی زمانەوانی بایەخی داوە بە بونیاتنان و ڕەوتی داڕشتنی کارەکە و لەوەدا هەوڵی خۆی چڕکردووەتەوە کە درك بە واتاکان بکرێت و دووربکەوینەوە لە ڕوکاری دەرەکی شتەکان و بابەتە کولتوورییەکان و پیشەگەرییەکان کە پەیوەستن بە واتاوە لە بونیادی ڕێزمان و فێربوونی لەم سەردەمەدا کە چاخی (ڕۆشنبیری بۆ هەمووان)ە، وە

جەخت بکرێتەوە کە زمانی ڕەوان (الفصحی) ئاسانکاری تێدا بکرێ بۆ بونیادنانەوەی ئوممەت و ئاسانکاری توانای بەکارهێنانی بە شێوەیەکی گونجاو و کاریگەر، لە سەردەمێکدا کە ڕۆشنبیری تەنها نەوەستاوەتەوە لە کۆمەڵێ کەسی تایبەتی و پسپۆڕدا.

پێویستە لەسەر زانایانی زمانی عەرەبی ئەم چاخەو کاریگەریە خێراکەی، هەوڵ و کۆششی زیاتری زانستییانە بدرێ بۆ ئاسانکاری و بەرزکردنەوەی ئاستی چوستی بەکارهێنانی، بە جۆرێك کە شیاوی ئەم واقعە بێت، بەبێ تێوەگلان لە ئاڵۆزییە بێسوودەکان، تاکو وا بکرێت خەڵکی بە ئاسانی لە قورئان تێبگەن و هاوپەیوەند بن لە تێگەیشتنی واتاو شێوازەکانی، بە تایبەتیش ئەگەر ئەوە بیری خۆمان بهێنینەوە کە زۆری شێوازی دیالەکتیکەکانی زمانی عەرەبی لەناو عەرەبەکاندا نەبووەتە هۆی پچڕاندنی پەیوەندیەکانیان لە ڕابوردوو ئێستاشدا، هاوکات کاریشی نەکردووەتە وردی و ڕەوانبێژی بەکارهێنانەکەیشی.

سەرەڕای هۆشیاری پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی و هۆشیاری زانکۆکەش بە گرنگی و بایەخی دەوڵەمەندکردنی زمانی قورئان وهەوڵدان بۆ ئەوەی لەجێگەی ڕاستەقینەی خۆیدا دابنرێ، هێشتا کارەکە زۆر لەوە زیاترە کە لە توانای هەریەکەیاندا هەیە لە جێی خۆیانەوە، وە ئەوپەڕی ئەوەی کرا ئەوە بوو کە زمانی عەرەبی دابنرێ لە پاڵ زمانی ئینگلیزیدا وەك زمانێکی سەرەکی لە فێربوونی خوێندنی زانکۆی جیهانی ئیسلامیدا.

هەرچەندە زانکۆکە لە (مالیزیا)یەو پێویستیەکان لەبەردەستدان بۆ پێگەیاندنی ڕاستەوخۆی (کادر)ەکانی ئەم ئوممەتەو بەرە تایبەتە

بیرمەندەکانی، هەروەها پەیمانگەو زانکۆکەش گرنگیەکی گەورەیان داوە بە کردنەوەی خولی زانستی بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و پەخشکردنی کاروبار و توێژینەوە هزری و ڕۆشنبیرییەکان بە زمانی عەرەبی، بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری ئوممەت و هزرەکەی، هەروەها بە زمانی ئینگلیزیش وەك هۆکارێکی جیهانییانەی هاوچەرخ لەلای زۆربەی گەلە زانستخوازە هاوچەرخەکانی جیهان.

گرنگە کە لایەنە فەرمی و نافەرمیەکان، خێرخوازی و بازرگانیەکان، ناوخۆیی و جیهانییەکان، کە هاوکار بن بۆ وەرگێڕانی گشتی و کردنەوەی خولە زانستییە جیهانییە گرنگەکان، بەتایبەتیش بۆ زمانی قورئان و دەوڵەمەندکردنی ئەم زمانە و سازاندنی بۆ ئەوەی ببێتە زمانی یەکەمی گەلە موسڵمانەکانی ئەم ئوممەتە وەك زمانی زانستی، هەروەها پێویستە کە ڕێکخراوەکانی ئەیسیسکۆ و ئەلسکۆ و حکوومەتە ئیسلامی و دامەزراوە زانستی و توێژینەوەییەکانی جیهانی ئیسلامی هاوکار و خەمخۆری ئەم بابەتە بن –وەك دەبینین– پێویستە هاوکار بن لە پێناوی ڕێکخستن و کۆکردنەوەی تواناکانی نێوانیان تا ئەم ئاواتانە بکرێنە کردار، وە پڕۆژەی یەکزمانی ئەم ئوممەتە هەنگاو و خواستی یەکەم بێت بۆ بونیادنانی پڕۆژەی شارستانیەتی پڕ لە خێروبێر بۆ مرۆڤایەتی.

ئەوە خەیاڵە کە خەون بەوەوە ببینین کە زانست و تەکنۆلۆژیاکانمان بۆ بکرێتە دیاری و لەلایەن خەڵکییەوە پێشکەشمان بکرێن، چونکە ئەم زانستانە زۆر پێشکەوتووانەن و زۆر بە خێرایی گەشە دەکەن و هیچ کەسێك وەری ناگرێت مەگەر ئەو کەسانەی کە ئامادەکراون و شیاندنیان بۆ کراوە بۆ

وەرگرتنی و بوونەتە خاوەنی ژێریەکی زانستی و توانایەکی گەورەی داهێنان و ڕۆشنبیری، لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە دەبێ دەست بکرێت بە ئامادەکردنی نەوەی ئەم ئوممەتەو کادرەکانی بۆ ئەو وەرگرتنە و چالاککردنی وزەی ئەم کادرانەو وورووژاندنی هەست و پاڵنەرەکانیان و چاکسازیکردن لە پرۆگرامی هزر و ڕۆشنبیریان و تێرکردنی ڕۆشنبیریەکانیان –بەتایبەتی ڕۆشنبیری عەرەبی– بە جێبەجێکردنی هەموو کارێکی نوێی زانستییانە و تەکنۆلۆژییانە، تاکو ئەم تەواوکارییە بە زمانی عەرەبی بێت و بە چەند پلەو قۆناغێك بێت، سەرەتا بە زمانی یەکەمی ڕۆڵەکانی گەلانی ئەم ئوممەتەو پاشان یەکانگیر کردنی لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە لەسەر بنەمای زمانی قورئان، بە چەند هەنگاو قۆناغێك وە بەپێی نەخشەیەکی زانستییانەی شارستانییانەی توندوتۆڵ.

گرنگە هەموومان ئەوە بزانین کە کارەکە دەبێ بە ڕاستی دەستی بدەینێ و خەمخۆری ڕاستەقینەی بین و وە زۆر ئاسانیشە ئەگەر بە متمانەوە دەستی بدەینێ و تێڕوانینمان ڕاست و دروست بێ بۆ ئەوەی کە دەبێت تەواوکاری ئەم ئوممەتە ئامڕازەکانی تواناو بەخشین و چالاککردنی دامەزراوەو کادرە زانستی و تەکنۆلۆژیەکانی بۆ بخرێتە کار، بە پشتیوانی خودا.

لەو ڕاسپاردانەی کە پێویستە لەم بوارەدا ڕایانبگەیەنین ئەوەیە کە دەبێ زۆر بە خەمخۆریەوەو بە ڕاستی دەستبەکار بین بۆ بوژاندنەوەی شارستانیەت و ڕۆشنبیری ئیسلامیمان و زمانە قورئانیەکەمان –واتە ئوممەت کار لەسەر ئەوە بکات کە فێری ئەم زمانە زیندووانەیان بکات بە شێوازی

کاریگەر بە تایبەتی بۆ منداڵان لە قۆناغی خوێندنی بنەڕەتیدا، کە قۆناغی وەرگرتن و فێربوونی خۆڕسکییانەی زمانەکانە، بەڵام دەبێ وریای ئەوەش بێت کە چاودێری فێربوونی زمانە زیندووە بیانیەکان لە قۆناغی خوێندنی باڵادا دوایی بکرێتە بژاردە و بەپێی خواستی کەسەکە بێ (اختیاری)و تەنها بۆ ئەوانە بێ کە ئارەزوومەندن و ئامادەیی فێربوونی زیاترو وەرگرتنیان تێدایە، ئەمەش وا دەکات کە باشترین هۆکار و کەمترین خەرجی کادری پێویست بۆ وەرگێڕان و پەیوەندیە بەردەوامە زانستییەکان و ڕۆشنبیرییەکان و شارەزا بە شارستانییەتەکانی تر لەناو ئەم ئوممەتەدا پێبگەیەنرێت، وە ئەوەشمان لەبیر بێت کە ڕێژەی بەکارهێنەرانی زمانە بیانیەکان لە ڕۆڵەکانی گەلە زیندووە پێشکەوتووەکان بە شێوەیەکی کاراو بەرهەمدار، ڕێژەیەکی کەمە لە بوارەکانی وەرگێڕان و توێژینەوەی زانستی و چالاکییە بازرگانی و گەشتیاری و کارە دپلۆماسییەکاندا.

لەبەرئەوە وەرگێڕانی زانستییانە بۆ سەر زمانی قورئان و دەوڵەمەندکردنی لە ڕووی زانستیەوە، لەپاڵ بەها ئایینی و ڕۆحیەکەیدا لەناو دڵی ڕۆڵەکانی گەلانی موسوڵماندا، وا دەکات کە فێربوون بە زمانی قورئان لەناو ئەو گەلانەدا ئاسان بێت وە زمانی ئەم گەلانەش وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەکو لە ڕابوردوودا وا بووە یان بەلایەنی کەمەوە با زمانی قورئان زمانی ڕۆشنبیری و فێربوونیان بێت، بەمەش زمانی قورئان دەبێتە زمانێکی جیهانییانەی زیندوی داهێنەرانەی شارستانییانە بەوپەڕی هەق و ڕاستی و ڕاستگۆییەوە و بەشدار دەبێت لە یەکگرتنەوەی ئوممەتی ئیسلامی و فراوانکردنی ئاسۆ پڕ لە بەخشینە شارستانیەتەکەیدا.

بەڵام ئەو گەلانەی کە شتە نوێیەکان وەرناگێڕن لە بابەتە زانستیەکان بۆ سەر زمانی خۆیان و لە خزمەتی زمانە بیانیەکاندا دەبن لە فێرکردنی قۆناغەکانی خوێندنی باڵایاندا، ئەوا ئەو گەلانە و ئەو ئوممەتانە دەبنە گەل و ئوممەتێکی هەژار لە ڕووی زانستیەوە و بەردەوام لە پاشکۆیی شارستانییەتدا دەمێننەوەو پێویستی زۆریان بە تواناو داهێنانی زۆر دەبێ تا دواتر بێنەوە بە هۆشی خۆیاندا و جڵەوی فێرکردنی ڕۆڵەکانی خۆیان بەدەستی خۆیان بێت و لێبڕاوانە کار بکەن بۆ چاکسازی لەو شێوازی فێرکردنەی هەیانە، تا لەسەر بنەما راستە زانستییەکان بێت.

## گەشە پێدانی مەعریفە و توێژینەوەی زانستی:

هەوڵەکانی توێژینەوەی زانستی بۆ هاندانی داهێنان و گەشەپێدانی مەعریفە، ڕوویەکی تری چالاکیە زانستیەکانن لە بواری (ئیسلامییەتی مەعریفە) لە زانکۆکەدا.

خۆ ئەگەر خوێندنی زانکۆیی بنەڕەتی و تەواوکاریەکانی لە هەموو بەش و لقەکاندا گرنگ و پێویست بێت بۆ پێگەیاندنی ئەو کادرانەی خاوەن مەعریفەیەکی تێر و تەسەل بن، وە باربۆ بن بە توانای پرۆگرامیانە، بۆ دەستەبەرکردنی بوارێکی زانستییانەی تەواوی توێژینەوەکان و بەراوردکاریەکان، ئەوا ئەم ئامانجە لە رێی کەڵەکەبوونی توێژینەوە باڵاکانەوە بەردەست دەبێت، هەروەها لەڕێی توێژینەوەکانی مامۆستایانی زانکۆ و خوێندکارانی خوێندنی باڵاوە، وە هەوڵەکانی بنکەکانی توێژینەوەی زانستی زانکۆ و کارلێککردنی ئەم هەوڵانە لەگەڵ ژیان و کۆمەڵگە، لەڕێی

بڵاوکردنەوەی کارە زانستییەکان و کردنەوەی خولی ئاستبەرز و جیهانی و سازدانی دیدار و مێزگرد و نەدوە زانستییەکانی زانکۆ، وە ئەو چالاکییانەی دەکرێن لەنێوان ئەندامانی دەستەی وانەبێژی و هاندانی گفتوگۆ لەنێوانیاندا لە بوارە هەمە جۆرەکانی دۆزەکان و بایەخپێدانە مەعریفی و زانستییەکان داو ئاڵوگۆڕکردنی ڕاوبۆچوونەکانی نێوانیان و شارەزاییەکانیان و سازدانی کۆڕو کۆنگرەی هاوبەش لەسەر ئاستی جیهانی و نێودەوڵەتی، سەرجەم ئەم کار و چالاکیانە بەلای زانکۆوە جێگەی بایەخ بوون و ئەوپەڕی هەوڵی هێنانە دی ئەمانەی داوە، تا سەرەنجام توانرا کە ئەو زانکۆیە لە ماوەیەکی کەمدا ببێتە مینبەرو دوانگەیەکی زانستی لە بوارەکانی ئاین و مرۆڤایەتی و ئەندازیاری و پزیشکیدا، وە چەندین کۆنگرە و کۆڕی زانستی لە بوارە جیاجیاکاندا تێدا ئەنجام درا.

بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجانەش –هەر لە یەکەم ڕۆژەوە– پڕۆگرامێکی فراوانی خستەکار بۆ خوێندنی باڵا لەسەر ئاستی ماستەر و دکتۆرا لە ژمارەیەکی زۆری بەشەکانی خوێندنی ئیسلامی و مرۆڤایەتی و پەروەردەدا، وە لە بوارەکانی خوێندن و توێژینەوەی بەشی یاساو ئابوری و ئەندازەو پزیشکی و هەموو پێویستییەکانی لە ڕووی زانستی و ئامڕازی تاقیگەکان و کەرەسەکانی نوسینی بۆ دابین کرد، وە پردی هاوکاری دامەزراند لەگەڵ زۆربەی دامەزراوە زانستی و پیشەسازیەکان، ئەم سیاسەتە کاریگەری باشی هەبوو لەدەستەبەرکردنی زۆربەی هۆکارەکانی بە هەرەوەزی کارکردن و ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ زۆرینەی لایەنە پەیوەندیدارەکان بە کاری هاوبەشیەوە و بووە هۆی بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆر توێژینەوەی زانستی، لەلایەن

دەستەی وانەبێژان و خوێندکارانی خوێندنی باڵا، زانکۆ سووریش بوو لەسەر کارکردن لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاستی ئەم توێژینەوانەدا و ئاڕاستەکردنیان بەرەو خزمەتی دۆزی هزری ئیسلامی و داخوازیەکانی ئوممەت و بەشداری کردنی گەرم و گوڕ لە هێنانەدی پەیامی ئیسلامییەتی مەعریفەدا.

هەروەها سەنتەری توێژینەوەکان و ئەنجومەنی زانستی زانکۆ و لیژنەکانی هەستان بە دابینکردنی هاوکاری و هاندانی توێژەران و گرتنەخۆی پرۆژەکانیان لە کۆلیژەکانی زانکۆدا بە هاوکاری لەگەڵ دامەزراوە و کۆمپانیاکان و لایەنە زانستی و پیشەسازیەکان، هەروەها زانکۆ کاری کردووە بۆ پشتیواندکردن و گرتنە خۆی نەخشە توێژینەوەییە لێکۆڵراوەکان، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ داخوازیەکانی گەشەپێدان و ئاوەدانکاری و بازاڕی کار، زانکۆ ئەرکی خەرجی خوێندن و قورسایی سەر شانی ئەو کەسانەشی کەم کردەوە کە بە توانای خۆیان دەبنە خاوەنی توێژینەوەیەکی پلە نایاب لە یەکەمەکانی زانکۆ، کە مایەی سوود گەیاندنێکی باش بێت بۆ ئوممەت و دەشگاتە ئاستی ئەوەی کە کەسەکە بە تەواوەتی تەرخان بکرێ بۆ کارکردن لە پرۆژەی توێژینەوەکەیدا وەك خزمەتێك بۆ زانست و هێنانەدی ئامانجەکانی ئیسلامییەتی مەعریفە لە کاری یەکانگیر کردنی مەعریفەی ئیسلامی داو تەواوکاریی پرۆگرامەکان و ئامادەکردنی خوێندکارەکانی، بۆیە زانکۆ سوور بوو لەسەر کردنەوەی دەرگاکانی بەڕووی کەسانی بەتوانادا لە ڕووی زانستی و شارەزایی و کردارییەوە، تاکو بێنە ناو هێڵی فێرکردن و توێژینەوەی زانستییەوە، لە

دادوەران و پارێزەرە دیارەکان و پیاوانی بازرگان و کەسانی سەرکەوتوو و زانایانی شارەزاو توێژەر بە شێوەی هەمیشەیی یان بە شێوەی هاوبەشکردنی بەشەکی(جوزئی) لە بواری فێرکردن و توێژینەوەدا، یان لە بواری ڕاوێژکاری و ڕێنماییکردن، یان بواری بەشداریکردن لە ئەنجومەنی زانکۆو لیژنەکانی ئاراستەکاری و پەرەپێدانی نەخشە و پڕۆگرامەکان.

وە لەو پڕۆژە توێژینەوەییانەش کە هەندێ لە ئەکادیمیەکانی بۆ تەرخان کراوە، بریتیە لە پڕۆژەی (کتێب و پڕۆگرامەکانی خوێندن) لە ڕوانگەی تێڕوانینی ئیسلامییەوە و داڕشتنی نەخشەیەکی فێرکاریانە بۆ قوتابخانەیەکی نموونەیی ئیسلامی بۆ ڕۆڵەکانی مامۆستایانی زانکۆ، کە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی گشتی دەگرێتەوە و ئەم قوتابخانەیەش دەبێتە (تۆو)ی دامەزراندنی سستمێکی تۆکمە بۆ قوتابخانەی جیهانییانەی ئیسلامی، کە وەك کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و فێرکاری هەموو ئاستەکانی پەروەردە و فێرکردنی تێدا بێ هەر لە باخچەی منداڵانەوە تا دوا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی و بەندە لەسەر تێڕوانین و چەمکە ئیسلامییەکان و ڕۆشنبیرییەکی ئیسلامییانەی هەمواری شارستانییانەی ژیرانە و پڕۆگرامییانەی زانستی پێشکەش بە منداڵ دەکات، ڕۆشنبیرییەك کە پیس نەبووە بە گومان و شێواوی و لادان و جادوو و خورافیات و پاشماوە نەریتییە خراپەکانی شارستانییەتە شێواوە هاتووەکان و سەر لەنوێ گێڕانەوەی چەمکەکانی پەروەردەی خێزانی و قوتابخانەیی بە مەبەستی بنیاتنانەوەی ئەو مرۆڤە بەخشندەیەی کە ڕازاوەتەوە بە گیانی جێنشینێتی لە زەویدا لە ڕووی داهێنان و دەستپێشخەری و ئاوەدانکاری و چاکسازییەوە، پڕۆژەکە دامەزراندنی قوتابخانەیەکی گشتی لێکەوتەوە کە بۆ منداڵانی دەستەی مامۆستایانی وانەبێژەو هەندێ لەو خەڵکانەش کەکاری

پەروەردەیی منداڵەکانیان زۆر ئاڵۆزە، ئەم پرۆژەیە گەرچی هێشتا لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدایە، بەڵام نیشانەکانی تێڕوانینی پرۆگرامییانە و سیستمی خوێندن و بەڕێوەبردنی وا دیارە کە سەرکەوتنێکی باش بەدەست دێنێ، ئومێدەوارین هاندانی زیاتر لە کاردا بێ بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژەیە و ئامانجەکەی، بە پشتیوانی خودا. یەکێك لە ئەرکەکانی سەنتەری توێژینەوە و ڕاگرایەتی زانستی بۆ خزمەتی ئەم ئوممەتەو داخوازیە ئاوەدانکاریەکانی، بریتیە لە ڕێکخستنی ئەو کارە ڕاوێژکاری و توێژینەوانەی کە ئەندامانی دەستەی وانەبێژی دەیانکەن بۆ کۆمپانیا و دامەزراوەکان و بە هاوکاریکردنیان.

زانکۆ پرۆگرامێکی لەئەستۆ گرت بۆ بڵاوکردنەوە و پەخشی کارە زانستییە ناوازە و نایابەکان کە لەلایەن ئەندامانی دەستەی وانەبێژییەوە دەردەچن، بۆ ئەمەش هەستا بە هێنانەدی ئەو ئامانجە لە ڕێی دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆری خولگەڕی (دوريات) زانستی کە لەلایەن زانکۆ یان پسپۆڕەکانی کۆلیژەکان و سەنتەرەکانی توێژینەوە تایبەتیەکانەوە پێشکەش دەکرێ بە زمانی ئینگلیزی، هاوکات زانکۆ گۆڤارێکی زانستیش چاپ و پەخش دەکات بە زمانی عەرەبی بە ناوی (نوێکردنەوە)و پابەندە بە پێشکەوتووترین پێوەرە زانستییەکان لە هەڵبژاردن و بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی و ئازادی دەربڕینی زانستی کە ئاوێنەیەکی زانکۆکەیە لەسەرجەم چالاکییە زانستییەکانیدا تا توێژینەوە و دەربڕینەکان دەرهاتووی گیانێکی زانستییانە بێت، بە ئامانجی خزمەتی ئیسلام و مەعریفەی ئیسلامی.

لەگەڵ ئەم هەوڵە هەمە لایەنانەی ئەم کارە زانستییە بەردەوامانەدا لە هەموو کۆلیژ و بەشە زانیستییەکاندا، کۆڕبەند (ندوه)و وانە و وتووێژو کۆنگرە زانستییە ناوخۆیی و هەرێمی و جیهانیەکانیش ڕێك دەخرێن، کە

بەرهەم بەخشن و ساڵانە ژمارەیەکیان لێ ساز دەکرێن لە بوارە جیاجیا ئیسلامی و مرۆیی و فیزیاییەکاندا لە ڕوانگەی دەرچەی ئیسلامییەتی مەعریفەوە وە لە توێژینەوەو گەڕاندا بەدوای ئەو دۆزانەی کە بۆ ئوممەت گرنگن بۆ پەرەپێدانی مەعریفە لەسەر بنەمای تێڕوانینی ئیسلامی، وە زانکۆکان و سەنتەرەکانی توێژینەوە لە ناوەوە و دەرەوە و دامەزراوە نێودەوڵەتیەکان، لەوانەش پەیمانگای جیهانی بۆ هزری ئیسلامی و ڕێکخراوی ئیسلامی بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و زانستەکان و بانکی ئیسلامی بۆ پەرەپێدان کە بەهرەمەندبوون بەچوستی کاری زانکۆیی، کە ئەمانە هاوکاری زانکۆ دەکەن و شوێنەوارو کاریگەری گەورە لەسەر زانکۆکە بەجێ دەهێڵن بۆ ڕووکاری توێژینەوەی زانستی و فراوانکردنی ئاسۆکەی و ئەزموونەکەی هەروەها ساڵانە زانکۆ کتێبێك چاپ دەکات دەربارەی ئەو کار و چالاکییانەی دەستەی وانەبێژی کردوویانە لەگەڵ لیستێکی ئەو توێژینەوانەی کە لەبەردەستدان بۆ کارتێداکردنی پرۆگرامە زانستییەکەی زانکۆ سەلماندی کە زانکۆ ئیسلامییەکە توانایەکی گەورەی هەیە بۆ وەرگرتنی لایەنی هەموار لە بواری زانستە هاوچەرخەکاندا، بە گیان و تێڕوانین و ئامانجی ئیسلامییانەی شارستانییانەی وا کە خواست و ئاواتی گەورە بەرپا بکات لە ئایندەی چاکسازی فێرکاریدا بە جۆرێك کە لە خزمەتی ئوممەت و گێڕانەوەی ڕۆڵە شارستانییە پڕ خێرو بێرەکەیدا بێ، بە پشتیوانی خودا.

## تەواوکاری بەجێهێنانە زانستی و پەروەردەییەکان:

کاتێك چاکسازی پرۆگرامە پسپۆڕییەکانی زانستەکان و بەرنامەکانی کاردەکەن بۆ هێنانەدی یەکانگیری مەعریفەو خوێندکار باربۆ دەکەن بە بنەما مەعریفییە پێویستەکان بۆ داڕشتنەوەی ناوەڕۆکی زانستی و پرگۆرامەکەی، ئەوا سەرچاوە مەعریفی و ڕۆشنبیرییەکانی و دۆخی بواری کار و ژیان و جوڵە لە زانکۆدا بە هاو گرنگیەکی گەورەتری دەبێ لە داڕشتنی دەروونی و کەسێتی خوێندکاردا، وە لە ئاسۆی کارلێکەکانی لەگەڵ کۆمەڵگەدا.

یەکەمین شتێکیش لەو شتانەی کە پێویستە دۆخی زانکۆو ژینگەی زانکۆ دابینی بکات دەستگرۆییکردنی خوێندکارە بۆ ڕۆشنبیریەکی گشتی ڕاست و دروست و تەواوکاری ئەو لایەنە گرنگە پێویستانەی هەن بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو شێواویانەی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بە دەستیانەوە دەناڵێنن، ئەم ماددە و پرۆگرام و شارەزایی و کارامەییانەش لەو پرۆگرام و داخوازییە هەمە جۆرانەوە دێن کە پێشکەش بە خوێندکارەکان دەکرێن، جا یان لەڕێی ئەو داخوازییە هەمە جۆرانەوە دێن کە پێشکەش بە خوێندکارەکان دەکرێن، یان لەڕێی داخوازییە پرۆگرامییە ئەکادیمیەکانەوەیە لەسەر ئاستی زانکۆیی، یان لەڕێی پرۆگرامی چالاکیەکانی کاروباری خوێندکارانەوەیە، کە بە خواستی بژاردەی خۆیانە، ئامانجی ئەمەش پڕکردنەوەی ئەو لایەنانەیە کە کەمایەتی پێوە دیارە لە دروستکردنی کەسێتی خوێندکارەکەدا و گەشەپێدانی لە بوارەکانی ڕۆحی و ئایینی و ڕۆشنبیری و پەروەردەدا، وە باربۆی دەکات بە توانای ڕۆشنبیری و کارامە کۆمەڵایەتی و وەرزشی و وزە ویژدانییەکان، لەم

بارەشدا دەبینین کە ئاستی بەرهەمهێنانی خوێندکار –سەرەڕای چڕوپڕی پرۆگرامە زانستییەکە– چەند هێندە دەبێت، وە توانای وەرگرتنی زانستییانەیان زیاتر دەبێت بە شێوەیەکی نائاسایی، وا دەکات پێگەیەکی گەورەیان بۆ فەراهەم بێنێ لەناو زانکۆکانی تردا لە یەکە چالاکییە هەمە جۆرە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکاندا.

بەهەڵەدا چووە ئەو کەسەی وا گومان دەبات کە ئامادەکردنی کادرەکانی ئوممەت کە کادری هزری و زانستی و سەرکردایەتی کردنن، گوایە لە ناوەڕۆکدا چەند کردارێکی زانیارییانە و ڕادێران (تلقین)و تاقیکردنەوەن، ئەو چالاکی و دەستپێشخەرییەی خوێندکاران کە دەبنە مایەی تەقاندنەوەی توانای لاوان و هەست و نەستە گەرم و گوڕەکانیان و پڕتریان دەکات لە تواناو کارامەیی ئەوتۆ کە لاوان ئارەزوویان بۆیان هەیە –وزەکەی دەردەپەڕێنێ– و شوێنەوارێکی وا بەجێ دەهێڵێ کە هەرگیز ناسڕێتەوە لە ناخی ژیری و ویژدانیاندا.

لەبەرئەوە نابێ کاری زانستی و پەروەردەیی هەر لە دەروازەی وەرزەکانی خوێندندا گیر بخوات و ڕابوەستێ، بەڵکو دەبێ درێژەی هەبێ و چاودێری بکرێت لە هەموو ڕووکارەکانەوە لە چالاکییەکان و بوارەکانی تواناکان و شتی تریش، وە بەبێ ئەمەش کرداری پەروەردەو فێربوون تەواو نابێت، گومانیش لەوەدا نیە کە تێچووەکان بە ئەنجامەکان بەراورد ناکرێن، چونکە هۆکارە چالاکەکە کۆششی خودی خوێندکارانەو پەیوەستە بە وزەکەیانەوە، بەڵام ئەوە گرنگە پەی بەوە بەرین کە سەرجەم ئەوانەی باسمانکردن هەرگیز نایەنە دی ئەگەر هەست بە مەبەست و ئامانج و پەیام نەکەین لەناو دۆخی ئازادی وەهادا

که ئاوێته کراوه به گیانی تیم و کاری هەرەوەزی به کۆمەڵ و دەستپێشخەری و گیانی هەستکردن به بەرپرسیارێتی.

پرۆگرامی داخوازییه زانکۆییەکان له نەخشەی زانکۆدا هاتووه، تاوەکو بنەمایەکی کارو مەرج و ڕەوشتی و ڕۆشنبیری گشتی خوێندکار تەماشا بکرێن، به ئامانجی پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییه و گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و مەعریفەتەکەی خوێندکارەکە و بەشداریکردن له لایەنی پرۆگرامی خوێندنی زانکۆیی و ئامادەکردنی بۆ ئەوەی به ئەرکه کۆمەڵایەتی و سەرکردایەتییەکەی خۆی هەستێت، له پاڵ لایەنی چالاکیه خوێندکاری و پیشەییەکەیدا، لەبەرئەوه زانکۆ لەگەڵ پرۆگرامەکانی خوێندنی عەقیده و ڕەوشت و کۆمەڵایەتی ئیسلامی و هەستکردن به بەرپرسیارێتی و بەرژەوەندی گشتی پرۆگرامێکی تریشی بڕیاردا بۆ خوێندن، دەربارەی (خێزانپەروەری) که بریتیه له توێژینەوەیەکی زانستییانەی کۆمەڵایەتی پەروەردەیی ئیسلامی بۆ لاوانی زانکۆ، ئەمەش به مەبەستی دانانی بەردی بناغەی بونیاتنانی کۆمەڵگە، یان خشتی یەکەمی دیواری کۆمەڵگە، که بریتیه له (خێزان) لەسەر بنەمایەکی ئیسلامییانەی دەروونی و کۆمەڵایەتییانەی ڕاست و دروست، که هەر له ئێستاوه دایك و باوك ئامادە دەکات لەم کوڕو کچه لاوانه، به جۆرێکی وا که هەست به ئامانج و هۆکارە پەروەردەییه ڕاست و دروستەکان بکەن و کار بکرێت بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی ئەوتۆ که خاوەن ڕۆحییەتێکی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و توانای زانستی و کرداری و ژیری و وزەی دەروونی داهێنەرانه بن و هەست به شکۆی خۆیان و متمانه بەخۆبوون بکەن، ئەمەش بۆ نەوەکانی داهاتوو

دەبێتە مایەی دابینکردنی وزەی باوەڕ و هێزی بوێری و ئازایەتی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و گیانی دەستپێشخەری کردنی پێویست بۆ مرۆڤێك کە شایستەی جێنشینی و هەڵگرتنی سپاردەی خودایی و ئاوەدانکردنەوەی زەوییە.

هەر بۆ هەمان مەبەست زانکۆ پرۆگرامێکی تری خوێندنی داناوە بۆ شارەزاکردنی لایەنی داهێنان لە خوێندکاراندا، ئەویش بریتیە لە (بیری داهێنان و چارەسەرکردنی کێشەکان) بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری دەربارەی سروشتی ئەم بیرەوبنەما دەرونی و پەروەردەییەکانی و ئەو هۆکارە زانستییانەی کە ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە تیایدا ڕۆشنبیر نین و شارەزاییەکی ئەوتۆیان تێدا نیە، ئەم پرۆگرامە ڕێنمایی تازە لاوان و نەوجەوانان دەکات لە پەرەپێدانی بیرۆکە و جێبەجێکردنی و گەشەپێدانی ڕۆڵەکانی ئەم گەلە و لەو بنەمایانەدا کە ئوممەت ڕۆڵەکانی پێ ئامادە دەکات بۆ پێشبڕکسێکردنی ئاوەدانکاری و بونیادنانی شارستانێتییەکان.

هاوکات بابەتێکی تری خوێندنی زانکۆش دانراوە بۆ خوێندکاران دەربارەی (پێکهێنان و داڕمانی شارستانیەتەکان)، مەبەست لەوەیە کە ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە شارەزا بن لەوەدا کە شارستانێتی ئەم ئوممەتە میراتی کۆمەڵێك شارستانێتی دێرینە بۆمان ماوەتەوە، وە وا لە نەوەی نوێ بکات لە پێشبڕکێی بەردەوامدا بن بۆ بەرگریکردن لەم شارستانیەتە لەگەڵ شارستانیەتە هاوچەرخەکاندا، ئەمەش وا لە خوێندکاران دەکات کە باربۆ بن بە تێڕوانینێکی گشتگیرانە و هەمە لایەنانەی زانستی شارستانیانەی ئەوتۆ

هاوكاریان بێت لە ڕاگیرکردنی پرۆگرامی چاکسازی ئیسلامی شارستانییانەی هاوچەرخ بە پشتیوانی خودا.

بۆ پێشکەشکردنی ئەم ڕەوتە زانکۆییانە بەشێوەیەکی زانستی، زانکۆ دوو دبلۆمی باڵای کردووەتەوە بە مەبەستی ئامادەکردن و پێگەیاندنی مامۆستایانی وانەبێژ لە بواری (خێزانپەروەری)و بواری (بیری داهێنان و چارەسەرکردنی کێشەکان)دا، تا زانکۆکە ئەمانە بخاتە ناو ڕیزی داخوازییە بنەڕەتییە زانکۆییەکانەوە، وە هەر بۆ هەمان ئەو مەبەستانە زانکۆ ئەو ئەرکەی پێ سپاردم و ڕاگرایەتیەکی دامەزراند بۆ کاروباری ئەو خوێندکارانەی کە هەیەتی، ئەمەش یەکێك بوو لە بەشە گرنگەکانی بەڕێوەبردنی ئەم زانکۆیە، ئەرکی ئەم دوو پرۆگرامە ئەوەیە کە توانای خوێندکاران بتەقێنێتەوەو گیانی برایەتییان تێدا بەهێز بکات و هەست بە کاری هەرەوەزی و بەکۆمەڵ بکەن و پاشان لەنێوان خۆیاندا کار بکەن بۆ پابەندبوونەوە بەم ئوممەتە و کردنەوەی دەوازەی فراوان بۆ تەواوکردنی چالاکی و کارامەیی و ڕۆشنبیری و فێربوونی ئازادانەو شارەزایی هەمەجۆر لە چوارچێوەی بەرنامەی ڕێکخستنی خوێندکاران و ئەندامانی دەستەی وانەبێژیدا پێکەوە وەك یەك خێزانی گەورەی ئیسلامی کە پێکهاتووە لە نەوەد و شەش ڕەگەزنامەی وڵات و نەتەوە جیاوازەکانی جیهان و زیاتر لە چل ڕەگەزنامەی جیاوازی مامۆستایان لە وڵات و نەتەوە جیاوازەکانی جیهان کە هەموویان یەك پەیام کۆی کردونەتەوەو هەڵیاندەسوڕێنێ، وە یەك گیانی برایەتی و هەستی ڕاستەقینەی پابەندی و گەشەکردن و ئامانجداری و هۆشیاری سەردەمییانەیان تێدایە.

بەڕێوەبردنی زانكۆ و بەشە كارگێڕیەكانی و خزمەتگوزارییەكانی تۆمار و وەرگرتن و سەرجەم دەزگاكانی بەڕێوەبردن لە هەموو ئاستەكاندا، لە خوارەوە تا سەرەوە، هەموویان بەرپرسیارێتیەكەیان لە چوارچێوەی یەك خێزانی سیاسەتی زانكۆیی ئیسلامیدا بە بەشێك لە خێزانی زانكۆ ئەژمار دەكرێت و بەرپرسیارێتیەكی پەروەردەیی و فێركاری لەقەڵەم دەدرێ، بگرە ڕۆڵی كەسە كارگێڕە پەروەردەییەكان كاریگەریەكەیان زیاتریشە، لەو ڕوانگەیەوە كە ئەمانە زۆرترین بەركەوتنیان هەیە لەگەڵ خوێندكاراندا و نمونەیەكی زیندووی هەڵسوكەوت و ڕەفتاری ڕۆژانەی كاروبار و ڕاییكردنی كاری خوێندكارانن و ڕاستەوخۆ بەر خوێندكاران دەكەون و جۆرایەتی هەڵسوكەوتیان كاریگەری خۆی هەیە و ئەو هەستە لای خوێندكاران دروست دەكەن كە ئەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵك و كۆمەڵگەدا بكەن لە داهاتوودا.

لەبەرئەوە زانكۆ بە هەستێكی ئیسلامییانەوە سوور بووە لەسەر پاراستنی شكۆو كەسێتی كارمەندەكانی و بایەخی داوە بە داخوازی و پێویستیەكانیان، تەنانەت كەمتەرخەمی نەكردووە لە پێدانی قەرزی بچووك و دەستەبەركردنی بیمەی تەندروستی خۆیان و خێزانەكانیان، وە دامەزراندنی دایەنگە بۆ ساواكانیان، وە ئەمەی كردووەتە بنەمایەك بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵكردنیان تاكو بتوانێت دواتر داوای ئەركەكانیان لێ بكات بە باشترین شێوەو كوالێتی و وایان لێ بكات زۆر بە باشی ڕەفتار بكەن لەگەڵ خوێندكاران و داواكاریەكانیان بۆ جێبەجێ بكەن و كاروباریان بۆ ڕایی بكەن و ڕێزی شكۆ و كەسێتیشیان بگرن وەك مرۆڤێك كە خودا ئەو شكۆیەی بە مرۆڤەكان بەخشیوە، وە كەمتەرخەم نەبن لە هاوكاری كردنیان و

کارئاسانیان بۆ بکەن و سەرجەم خزمەتگوزاری و بڵاوکراوەکانیان پێ ڕابگەیەنن بەبێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ خوێندکارەکە چ زمان و ئایین و نەتەوەیەکی هەیە، یان ئاخۆ موسوڵمانە یان نا موسڵمانە.

جا کە زانکۆ ئەم هەنگاوە گەورانەی بڕیوە، ئەوا پێویستە لەسەر زانکۆ و هەموو دامەزراوەکانیش، بە تایبەتی دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکارییەکان وزەکانیان بخەنە کار تاکو ئەمە ببێتە ڕاستییەکی گرنگ لە دام و دەزگاکاندا بە تایبەتیش لە باش هەڵبژاردنی کارمەندان بۆ بەشەکانی ئەم زانکۆیە وە پاشان مامەڵەکردن لەگەڵیدا بە هەمان ڕۆح، سێهەمیش کەمتەرخەمینەکردن، با لە بچوکترین ئاستیش دا بێت و کەسەکەش لە هەر پلەو ئاستێکدا بێ. چونکە هەریەکە لەم کارگێڕو بەرپرسانە وەك باوکێك وایە بۆ خوێندکارەکان و ڕێگە نادرێ هیچ کەسێك پۆست و پلەکەی بەکاربێنێ بۆ هیچ سەپاندن و قۆرخکارییەك لە هیچ بارودۆخێکدا.

بە ئەزموون و کارامەیی، بە گیانی بەرپرسیارانە، وە هەستی سپاردەپارێزی، وە گیانی بەرژەوەندی هاوبەشی ئەوتۆ کە بەندە لەسەر دادپەروەری و ویژدان و یەکسانی و ڕێز و ڕێزگرتنی بەرانبەر و هاندان، وە دەستەبەرکردنی کارامەیی و ڕاهێنان و ڕێنمایی و ئاڕاستەکردن، وزەی هەموار دەبێتە مایەی بەرهەمهێنانی چەندێتیەکی گەورە بە ئاسانی و بە خەرجیەکی کەمتر لەو خەرجی و کۆششە ناهەموارەی بەهەدەر دەچێ لە کۆسپدروستکردن و ئەو ململانێ گەندەڵەی هەیە لە زۆربەی ڕێکخستن و ئەو دامەزراوانەی ئامانجە ڕوونەکەیان دیار نییە و گیانی پەیماداریان و نەو بەرژەوەندی کۆمەڵ پەنهانە، هەستی پابەندی لاوازە، وە ئەو قسەیەش

ڕاستە کە بە ئەزموون سەلمێنراوە (داهێنان و پێشکەوتن و سەرکەوتن پێویستی بە هەوڵێکی زۆرە، بەڵام خۆ کۆسپدروستکردن و ململانێی ناهەموار و دواکەوتوویش لە ڕاستیدا پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی زۆرترە) وە لەوەش دڵنیاین کە هەژاری و داماوی لە بنەڕەتدا لە وزە و ڕۆحدایە، بەر لەوەی کە لە سەرچاوەکانی داهاتدا بێت.

## بەرهەمگەلێکی ئومێدبەخش:

گیانی ئیسلامی و ئەو پەیامەی کە لە پرۆگرامی کاردایە و بنیادنانی گیانی تیم، لە پشتی ئەو دەستکەوتە گەورانەوەیە کە لەم کۆشکی زانستییە نایابەدا هاتنەدی، لە تەنها ماوەی چەند ساڵێکدا، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە پلانە ئیسلامییەکەی مەعریفە ناسراوە لەگەڵ ئەو تێڕوانینانەی هەیەتی هەر لە پڕگرامی زانستی داهێنەرانە و پشتیوانیکردنی بە ڕۆحە ئیسلامییەکەو چالاکی و دامەزراوە تێر و تەسەل و کاراکانی و دابینکردنی پێویستییەکان بە کوالێتی بەرزو چاك بەجێهێنانی ئەرکەکان و ڕاپەڕاندنییان بە کەمترین تێچوون و خەرجی.

لەبەرئەوە جێگەی سەرسامی نیە کە ئەم بەرهەمە بکەوێتەوە لەم تەلارە زانستییەی کە بەندە لەسەر بنەمای (ئیسلامی ەتی مەعریفە)و دەرچە ئاوەدانکاری و شارستانییەتەکانی، کە هەر لە سەرەتای ڕێگەدا ئەم جۆرەی کادرە ناوازەو نایابانە پێشکەش بە ئوممەت بکات، لە بوارە جیاجیاکاندا، وە پرۆگرامە ئەکادیمیەکەیشی شیاوو کارا بێت لە پاڵ دامەزراوەکانی، پەروەردەکەی، چالاکییە ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیەکانیدا،

هەروەها لە بوارەكانی شارەزایی و كارامەیی و تواناكانی توێژینەوەی زانستی و گرنگیدانی بەو دۆزانەی گرتنیە خۆی لە گواستنەوەی جۆرایەتی و چەندێتی و چۆنیەتیدا لەسەر ئاستی خوێندنی باڵا، وە كارا كردنی لە خزمەتی پرۆژی شارستانیەتی ئوممەتدا و تەقاندنەوە و خستنەگەڕی توانای فێرخوازان و خوێندكاران و خستنە جووڵەی تواناو شارا پڕ لە تواناكانی بەخشین و دەستەبەركردنی پێویستییە رۆحی و هزری و كار پیشەییەكانی ئەم ئوممەتە.

خوێندكارانی زانكۆ -بە هەردوو ڕەگەزەكەوە- سەلماندیان لە ڕێی ئەنجام و بەرهەمی ئەم ماوە دیاریكراوەیاندا، كە زۆر بەتواناترن لە هاوتاكانیان لە دەرچوانی زانكۆ دێرین و ناودارەكانی تر، وە بوونەتە خاوەنی مەشخەڵی بردنەوەی پێشبڕكێ لەگوشبەند (حلبە)و گۆڕەپانی ڕۆشنبیری و وەرزشیدا، نەك هەر لەسەر ئاستی مالیزیادا بە تەنها، بەڵكو لەسەر ئاستی پێشبڕكێكاریدەكانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا-ئاسیا- ئەفریقادا، بەڵكو هەمیشە بوونەتە یەكەمی سەر ئاستی (ئوستورالیا)و جیهان بە گشتی، كە ئەوەش لە پێشڕكێی ساڵی (٢٠٠٠ز)دا بە ڕوونی دەركەوت بۆ یەكەمین جار لە مێژووی ئەم پێشبڕكێ جیهانیەی وەرزشدا لە وڵاتێكدا كە خەڵكەكەی بە زمانی ئینگلیزی نادوێن، وە لەسەر ئاستی جیهانیش پلەی دەیەمی بەدەست هێنا، كە تیپی وەرزشی زانكۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیا توانی ببێتە خاوەنی ئاستی حەوتەم لە پلەبەندیدا لەسەر ئاستی زانكۆ گەورەكانی هەموو جیهان.

هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٦ز) تیپی زانکۆکە بەپلەی یەکەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە کەنەدا لەنێو ئەو زانکۆیانەی ئەو وڵاتانەدا کە زمانی ئینگلیزی تیایاندا بە زمانی دووەم دادەنرێ.

هەروەها تیمی نەوجەوانانی زانکۆ –کوڕان و کچان– بە تیمی یەکەم ناسران لە پاڵەوانێتی (تەکواندۆ) لە مالیزیادا، وە ئەوان بۆ یەکەم جار لە (١٩٩٨ز) بوونە خاوەن یاریگەیەکی تەواوی تۆپ لەحەرەمی نوێی زانکۆدا و بوونە پاڵەوانی –پاڵەوانێتی تۆپی پێی زانکۆکانی مالیزیا– وە سەرکەوتن بەسەر ئەو تیمەی کە بۆ سێ ساڵ لەسەریەك پاڵەوان بوو، بەبێ ئەوەی کە تیمی وەرزشی هیچ کام لە زانکۆ مالیزیەکان بتوانن تەنها یەك گۆڵ تۆمار بکەن لە تیمی زانکۆ ئیسلامیەکەی مالیزیا، لە کاتێکدا تۆڕی گۆڵچی هیچ تیمێکی وەرزشی زانکۆکانی تر نەمابوون کە تۆپی ئەمانی پێدا نەچووبێ، تەنانەت لە یەکێك لە یاریەکاندا توانیان هەشت گۆڵ تۆمار بکەن بۆ خۆیان بەبێ ئەوەی کە بەرانبەرەکەیان هیچ گۆڵێك تۆمار بکات.

ئەوەی کە بەڕێوەبردنی ئەم زانکۆیەو ڕێکخراوەکانی کردیان لەو دەستکەوتانەی دەرچووانی زانکۆکە بەدەستیان هێنا، بە تایبەتی لاوان و نەوجەوانان لە بە دەستهێنانی ئەو پلەو پێگە لاویەتییانەی لەسەرکردایەتی و پێشەنگیدا بۆ وڵاتەکەیان مسۆگەر کرد، بەڵگەیەکی بەرجەستەیە لەسەر کارایی ڕۆحی ئیسلام و گەرموگوڕی دەرچووی (ئیسلامییەتی مەعریفە) لە کاراکردنی خوێندنی باڵا بۆ خزمەتکردنی ئوممەت و پڕۆژە شارستانیەکەی و وە دەرخستنی تواناکانی ئیسلام و دەرچەکانی لە جوڵاندن و بەکارخستنی وزە شارستانیەتە شاراوەکەی ناخی لە قەوارەی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتەدا بە

کەمترین هەوڵی بەرهەمهێن و نزمترین خەرجی تێچوونی ماددی، تا چەندێتی بگۆڕێ بۆ چۆنیەتی، وە کەم بۆ زۆر، هەرزان بۆ گرانبەها، بە پێچەوانەی ئەوەی کە باو بوو لە ژیانی ئوممەتە زیندووە هۆشیارەکەو دامودەزگا کاراکانی، کە دەتوانێت توانا ڕۆشنبیرییەکەی بتەقێنێتەوە لە چوارچێوەی پڕۆگرامە پەروەردەییەکەیدا بە خستنەگەڕی توانا شاراوەکەی و هەوڵدانی ڕۆڵەکانیدا، بەمەش وای کرد کە ئەزموونی ئەم زانکۆیە ئەزمونێکی پێشەنگ و سەرکەوتووانە بێت و شایستەی هەڵوێستە لەسەرکردن و تێڕامان و وردبوونەوە بێت، وە سوودی لێ وەربگیرێت لە ڕووی چۆنیەتی گەشەپێدانی زانکۆیی لە جیهانی ئیسلامی داو کارکردنی بۆ بەشداریکردنی لە هەستانەوەی ئەم ئوممەتەو پڕۆژە شارستانییەتەکەیدا.

## سەرچاوەی داهات و پاڵپشتییەکان (التمویل):

کارکردن لەم پڕۆژەیەدا و هەر شتێ کە پەیوەندی بەوەوە هەبێ و ئامانج و مەبەستەکانی بپێکێت، وە ئەو چاکسازییە پڕۆگرامییانەی کە کران و چاکسازییەکەش هێنانیە دی، لەگەڵ ئەو سیاسەتە زانستی و فێرکاریانەی گیرانەبەر، وای کرد کە بچێتە ناخی ویژدانی کارمەندانەوە، وە لە دەروونی زۆربەیاندا ئاواتەکان ببوژێنێتەوە، چونکە ئەو ئەواتانەیان بە بەرجەستەکراوی تێدا دەبینی، وە لە چرۆی بەرهەمە زانستی و مرۆڤایەتیەکاندا دەبووژانەوە، کە وێنەیەکی ئیسلامییانەی زیندووی کارای دەدا بە دەستەوە، کە بووە هۆی جولاندنی پاڵنەرەکان و بەخشینی مادی و مەعنەوی لە ناخیاندا.

لەبەرئەوە گەلێك لە خەڵكی پەرۆشانە كاریان كرد بۆ كەوتنە سەر پێی ئەم زانكۆیە، هەر لە پیاوانی خەمخۆری ئەم ئوممەتە، لە هەموو ئاستە جیاجیاكاندا، وە جەماوەری خەڵك، مامۆستایان، كەسانی فەرمی، هەموویان هەنگاویان هەڵگرت، وە بەدوای ئەم زانكۆیەوە بوون و بەردەوام چاویان لێی بووە بە ڕێنمایی كردن و هاوكاری و هاندان و كۆشش و بەخشین.

ئەگەرچی حكوومەتی مالیزی قورسایی ئەركی خەرجی زانكۆكەی گرتە ئەستۆ، لەگەڵ سەرجەم ئەو دامەزراوانەی سەر بە زانكۆكەش دەبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراوە و ڕێكخراوە ئیسلامییەكانیش دەستی یارمەتییان بۆ درێژ كرد - لەپێش هەمووشیانەوە بانكی ئیسلامی بۆ گەشەپێدان- بە خەرجكردنی پارەی دروستكردنی تەلار و بیناكانی و گرتنە ئەستۆی سندوقی یارمەتیدانی خوێندن، بۆ ئەو خوێندكارانەی كە مالیزی نین، وە خەرجیكێشانی كۆنگرە زانستییە نێودەوڵەتیەكان بەڕێگای پێشوەخت، وە دامەزراوە خێرخوازی و بازرگان و خاوەنكارو كەسانی خێرخوازیش لە هاوكاریكردن دوانەكەوتون، بە تایبەتی لە یارمەتیدانی سندووقی هاوكاری خوێندن، كە ئەمە بووە هۆی تەواوكردنی خوێندنی هەزاران خوێندكاری نایاب لە زیاتر لە نەوەدو شەش وڵاتی جیاجیا و ڕەگەزنامە و پێكهاتە و ڕۆشنبیری جیاوازی گەلانی ناو ئوممەتە، كە بە هەزاران ئەمەكداری و سوپاسی لەو خوێندكارانەوە پێشكەش بەو دەزگا و كەسە خێرخوازانە كرا.

هاوكاری و بەخشینەكەش هەر تەنها لە ڕووی مادییەوە نەبوو، بەڵكو ئەو كارلێكردنە لەگەڵ پەیامی زانكۆ و سەرمایە مرۆییەكاندا بەردەوام بوو، لەوانەش ئەو كەسانەی خۆبەخشانە لە دەستەی مامۆستایانی وانەبێژدا

بوون، یان هاوکاری دەستەکە بوون، کە تواناو زانستیان دەبەخشییە دەستەکە، وەك یارمەتیەك بۆ بەرنامە زانستی و فێرکاری و پەروەردەییەکە، ئەم هاوکاری و بەخشینە جێدەستی دیارە بە زانکۆکەوە لەلایەن ئەو کەسە مەزنانەوە، وە لەلایەن دامەزراوە زانستییەکان و ئەو زانکۆیانەش کە بەشدار بوون بەکادرە خۆبەخشە زانستیەکان و وانەوتنەوەو توێژینەوەکانیان ئەو بەختە باشەی کە زانکۆ هەیبوو لە هاوکاری و یارمەتی ماددی و مرۆیی لەلایەن دەوڵەتی مالیزیاو گەلەکەی و دامەزراوەکانی و دامەزراوە زانستییەکانی ئوممەت و کەسە زانستخوازەکانی مالیزیاو دەرەوەی مالیزیا، دەربڕینێکە سەبارەت بە ویژدان پاکی ئەو خەڵکە بۆ ئەم پڕۆژەیەو بوو بە هۆی بزواندنی وزەو توانای ناو ناخی ئەو خەڵکانەو بەشداریش بووە لە کاراکردنی ئەم هەموو وزە پڕ لە خێروبێرەی ئامادەی خزمەتکردنی ئەم ئوممەتەیە، وە کاراکردنی دامەزراوەی فێرکردن لە چوارچێوەی وێنەی زانکۆی جیهانی ئیسلامی مالیزیاداو پڕۆژە پەیماندارەکەی لە ئیسلامییەتی مەعریفە و چاکسازی هزر و ڕۆشنبیری و پەروەردەی ئیسلامی.

پێویستە ئەم ئەزموونە گرانبەهایە لە دەست نەدەین کە پڕیەتی لە پەند و جوڵاندنی وزە شاراوەکان و کۆششی ئەم ئوممەتەو توانای کاراکردنی دامەزراوە فێرکاری و پەروەردەییەکان، کە بنەمایەکە لە بنەماکانی خستنەکاری تواناکانی پڕۆژەی چاکسازی ئیسلامی شارستانیانە، وە نەهێڵین ئەم هەوڵە بەفیڕۆ بڕوات، بەڵکو دەبێ پەرەی پێ بدرێ و سوود لە ئەزموونەکەی وەربگیرێت لە کاراکردنی دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا لە خزمەتی ئایندەی ئەم ئوممەتە و پڕۆژە شارستانیەتەکەیدا، وە ئومێدەوارین

ئەم ئەزموونە ببێتە مایەی هاندانی زیاتر بۆ توێژینەوەی زانستی و خوێندنی زانكۆیی و هەر شتێ كە هاوتای ئەمانە بێ لە نموونەی ئیسلامییانەی داهێنەرانە لە ڕووی واتایی و بیناسازی لە سەر ئاستێكی بەرز لە خزمەتی زانكۆكان و دامەزراوەكانی خوێندنی باڵا لە وڵاتە ئیسلامییەكاندا.

**دواڕۆژ (ئاینده):**

لە وانەی پێشووەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە هۆشیار بوون بە ڕەهەندەكانی پرۆژەی ئیسلامییەتی مەعریفە چەندە گرنگە و چ ڕۆڵێكی گەورەی هەیە لە چاكسازی دامەزراوەی خوێندنی باڵادا، بۆ ئەوەی ئەم فێربوون و خوێندنە ڕۆڵی خۆی ببینێ لە چاكسازی ژیانی هزری و پەروەردەیی ئەم ئوممەتە، بە جۆرێك كە جۆرایەتی فێركردن و توێژینەوەی زانستی گەشەكردنی جۆرایەتی (كادرەكان) وەك سەركردە و پیشەیی لە كاردا بێ، هەروەها تواناكانی ئەم ئوممەتە گەشە بكات و ویژدانی ڕۆڵەكانی بخاتە جووڵەو ئەوەی كە دووچاری بووە لە شێواوی و شێواندن لە جەستەی ئەم ئوممەتەدا وە لە ژیری و دەروونی ڕۆڵەكانیدا چارەسەر بكرێت.

وەبەبێ بوونی هۆشیاری لەو كەسانەدا كە ئەم پرۆژانەیان ڕاگرتووە، واتە پرۆژەی خوێندنی باڵا و بەڕێوەبردنی بەم ڕەهەندە عەقیدەیی و هزری و پەروەردەییە و باوەڕ پێبوونی بە چاكسازی كردن لە خوێندنی باڵادا، كاراكردنی ئەم فێركردنە نایەتە دی لە جوڵاندنی توانا شاراوەكانی ئەم ئوممەتەو مەڵۆی ئەو توانایانەدا و تازەكردنەوەی مەعریفە لەم ئوممەتەداو بەكارخستنی سستمەكانی فێركردن لە خزمەتی ئوممەت و گەشەپێدانی

کادرەکانی، هەرچەندێکیش بەرەوپێشەوە چووبن لە هۆکار و ئامڕاز و کەرەسەکان، ئەوسا خوێندنی باڵا بۆ نەوەکانی داهاتوو بە نەخۆشیەوە دەگوازرێتەوە، بەو حاڵە خراپەی ئەمڕۆ لەگەڵێ لایەنەوە گیرۆدە بووە — هەروەکو چۆن بۆ نەوەی ئێمە هات لە ڕابوردووەوە، بە پێوەرە جیهانیەکەی شارستانیەت و بۆماوەی چەندین چاخ— دامەزراوەیەکی سست و دەستەوستان بوو لە بەرهەمهێنانی کادری پیشەییدا، کە بیرو هزریان مرد بوو، ڕۆشنبیرییان ناپوخت بوو، پرۆگرامیان شێواو بوو، خواستەکان و ئاواتەکانیان سنووردار بوو، تەنها هەوڵ و کۆششەکەی بۆ دابینکردنی تیکەی ژیان بوو، لەژێر پاڵنەری ڕەمەکی حەزی مانەوەدا، گەرچی چەندین هۆکارو دەزگایشی لێ کۆکرابووەوە کە هاوردەی دەرەکی بوون، وە چەند ئێمەش ئامێرو کەرەسەی تازە داهێنراوی ترمان خستبێتە سەریان، ئەوا ناتوانین پێشبینی شتێك بکەین کە باشتر بێ لەوەی کە پێشتر بینویانە، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئایندەی دۆخی زانست بپێوین و بەڕابوردوو بەراوردی بکەین.

ئەو ئاواتەی کە ڕەوتی ئیسلامییەتی مەعریفە بە ئامانجی دەگرێت ئەوەیە کە هەوڵەکەی بەرهەمدار بێ لە هۆشیارکردنەوەی چینی پاڵفتەی ئەم ئوممەتە لە ڕۆشنبیران و بیرمەندان و پەروەردەناسان و مامۆستایانی زانکۆو ئەو کادرانەی بەوە جیا دەکرێنەوە کە هەڵگری ئیسلامییەتی هزرو تێڕوانینەکەین، تاکو بتوانێت بەرپرسیارێتی چاکسازی هزری و پرۆگرامی و پەروەردەیی گشتی هەڵبگرێت، بە تایبەتیش لە کەرتی خوێندنی باڵادا، چونکە ئەمە ئەو بوارەیە کە دەستە بژێری چینی کادرە ئەکادیمی و زانستی و کردارییەکانی ئەم ئوممەتەی تێدا دروست دەکرێت، وە دەبێ ئەم چینە

هەوڵ و توانای هزری و ئەکادیمیانەی پێویستی خۆی بخاتە کار بۆ بژارکردن و پوختەکردنی ئەو ڕۆشنبیری و پەروەردە ئیسلامییەی کە ئومەت بە گشتی لە گرفت و دەردەکان ڕزگاردەکات، بەتایبەتی جادوو و خورافیات و چاوبەست و هەر شتێکی تر کە پێچەوانەی ئەو ژیری و زانستەیەیە کە بەندە لەسەر گرتنەبەری هۆکارەکان و یاسا خواییەکان وەك مەرجێکی پەیوەندیدار بە سەرکەوتنەوە، وە دەبێ ئەم دەستەیە گشتگیرییەکانی کاروباریدا پشتببەستێ بە باوەڕ و بە تێڕوانینێکی گەردوونیانەی شارستانیانەی وابەستە بە وزەی پشتبەستنی بەرچاوڕوون (بەکارهێنانی هۆکار و پشت بە خودا بەستن) و کار بکات بۆ چەسپاندنی هەر شتێك کە یارمەتی تێڕوانینە ئیسلامییە گشتی و ڕۆحیەتە جێنشینییە ڕەوشتیی و ژیریە ئاوەدانکارییە شارستانیەتەکە دەدات و بە هێزی دەکات، وە ئەدەبیاتی زانستییانەی ئیسلامی پێشکەش بکات بۆ چاکسازی پرۆگرامەکانی پەروەردە و ئامادەکردنی دایکان و باوکان و ڕاهێنانیان لە ڕووی پەروەردەییەوە بۆ پێگەیاندنی نەوەی هەڵگری سپاردە خواییەکەو جێنشینداری سەر زەوی کە پاکژ کرابێتەوە لە ڕەوشتی کۆیلایەتییانە و دەروونی کۆیلایەتییانە و بە پاکی و دەروونپاکی و هەستی بەرپرسیارێتی و پارێزەری بەرژەوەندیە گشتییەکان و گیانی دەستپێشخەری و داهێنان بناسرێت، چونکە دایك و باوکان گرنگترینی ئەو ڕەگەزەن کە بەتوانان و کاریگەری گەورەیان هەیە لەسەر ژیری و پەروەردە و ویژدانی نەوجەوانان و منداڵان، بەتایبەتیش کە هەر لە قۆناغی منداڵییانەوە ڕەوڕەوەی گۆڕانکارییان بۆ بجوڵێنن، ئەمەش وا دەکات کە دایك و باوك و خێزان وەك ڕاستیەك بوونیان هەبێ و نموونەی

ئەمانیش وەکو نموونەی سویچی مەکینە وایە لە ڕووی توانای کاریگەرییان لەسەر جۆرایەتی ئەم بەرەیەی نەوەکان و دواتر گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا و چاککردنی جۆرایەتی ڕۆڵەکانی بە پشتبەستن بەو پاڵنەرە ماکییەی تیایاندایە لە سووربوونیان لەسەر بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ڕۆڵەکانیان و ئامادەیی ئەوان بۆ قوربانیدانی گرانبەها، لە پێناوی هێنانەدی ئەو خواستانەی کە دایك و باوکان لە منداڵەکانیاندا بەدییان دەکەن و کارەکەیان لەبەرژەوەندی ئەوانە بەپێی ئەو قەناعەتپێکردن و زانیاریانەی کە بیرمەندان و پەروەردەناسان پێشکەشیان دەکەن، وە ئەگەر بەرەی نەوجەوانان چاك بوو، ئەوا هەموو کۆمەڵگە چاك دەبێ و کاروباری خۆی و دامودەزگاکانیشی ڕاست دەبێتەوەو چالاك دەبنەوە، ئەوسا ئیتر فەرمانبەری بەرتیلخۆر و مامۆستای کەمتەرخەم و سەربازی ترسنۆك و بەرپرسی گەندەڵ نابێ.

ئێمە ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەو بەرهەمەی کە ئوممەتە پێشکەوتووەکان پێشکەشیان کردووە لە (توێژینەوە زانستیەکان) یان لەلایەن بیرمەندان و پەروەردە ناسانیانەوە بە مەبەستی توێژینەوەی پەروەردەیی بۆ هۆشیار کردنەوەی دایکان و باوکان و سەرکردەکانی کۆمەڵگە بەو ژمارە دەگمەنەی کە بیرمەندانی جیهانی ئیسلامی و پەروەردەناسەکانی بەرهەمیان هێناوە و پێشکەشی کردووە بە دایك و باوکان و مامۆستایانی موسوڵمان، بۆمان دەردەکەوێ کە گرنگترین هۆکار بۆ تێگەیشتن لە دواکەوتوویی ئەم ئوممەتەی کە پڕۆژەی چاکسازیە شارستانیەتەکەی بە (بزر) ناسراوە، ئەوەیە کە منداڵی موسڵمان لەم پڕۆژەیەدا بزرە و ئەدەبیاتی ئیسلامی زانستی و پەروەردەیی کە لە واقعی

کۆمەڵگەوە هەڵدەقوڵێ بە خۆی و مەبەست و بەهاو پاڵنەرو پەراوەکردنەکانیەوە زۆر دەگمەنە، لەسەروو ئەمانەشەوە فەرامۆشکردنی شیاندن و ئامادەکردنی کاری هزری و پیشەیی و پەروەردەیی بۆ ئەم ئوممەتە، مەگەر بە برێکی کەم نەبێ لە بواری ڕۆشنبیری و پەروەردەی ئیسلامیدا بەهۆی ئەوەی کە دامەزراوەی خوێندنی باڵا زیاتر بایەخی داوە بە لایەنە میکانیکی و ئامێرکاریەکان لەجیاتی ئەوەی بایەخی بدایە بە لایەنە ویژدانی و ڕۆشنبیریە ئیسلامییەکەی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە، کە نەکردنی ئەوە بووەتە هۆی سستی و دەستەوستان بوونی لە ئاستی چالاککردن و کاراکردنی زانست و مەعریفەو چاکسازی کردن لە پرۆگرامەکانیدا تاکو کارا بن بۆ پێگەیاندنی کادری سەرکردەیی و پیشەیی و جوڵاندن و هاندانیان بۆ خزمەتکردنی ئەم ئوممەتەو چاکسازی لە چاککردنەوەی ئەو دەرد و پەتایانەی ڕوویانکردووەتە ڕوانگەو بیرو ڕۆشنبیری و پرۆگرامە پەروەردەییەکانی، کە بریتین لە شێواوی گۆڕانکاری بەبێ کاراکردنی ژیری موسڵمان و جوڵاندنی مەڵۆکانی توانا شارستانی و کاراکردنی دام و دەزگاکانی و بەکارخستنی کرداریانەیان.

پێویستە ئەوەمان بیر نەچێ کە پێگەیاندنی کادری زانستی و تەکنیکی لە خودی خۆیدا ئامانجەکە نیە، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە ئەم کادرانە پێبگەیەنرێن و بکرێنە کەسانی مەیدانی بۆ خزمەتی ئەم ئوممەتەو وەڵامدانەوەی داخوازی و پێویستیەکانی ئوممەتەکەو پێویستیەکانی پرۆژە چاکسازیە شارستانیەتەکەی و و لەوەشەوە جڵەوگرتنەوەی توانا زانستی و تەکنۆلۆژی ەکە بە ڕۆحێکی وردکاری و بەجێهێنان و بەخشینێکی وا کە بە

بوونی ئەم کادرانە تواناکان بەدەر بکەون بە شێوەی تێڕوانینە سەلامەتەکەیان و هەستکردنیان بە گیانی بەرپرسیارێتی، ئەمەش دەبێتە هێزی بەجێهێنان و دڵسۆزی بۆی.

بواری پەروەردە و پوختەکردنی ڕۆشنبیری، بەتایبەتیش ڕۆشنبیری پەروەردەییانەی دایك و باوکان وەك کلیلی خستنەکاری جوڵەی گۆڕانکاری کۆمەڵگە وایە، بۆیە پێویستە لە پێشی پێشەوەی ئەو داخوازییە چاکسازییە ئیسلامییە شارستانیەتەدا بێت کە هەوڵەکانی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی لەو پێناوەدا بووە تاکو بونیادی نموونە و ئەزموونێك بخاتەڕو کە بەپێی توانا ئەم دەرچە و چەمکانەی تێدا بەرجەستە بکرێن و تواناکەیشی بچەسپێنێ لە تەقاندنەوەی وزەی گەنجانی ئەم ئوممەتەدا و مەڵۆکانی توانا بخاتە جوڵە و بەکردار تیایاندا دەربکەوێ، نموونەی ئەمەش لە پرۆژەی خوێندنی باڵاوە دەست پێ دەکات، بە کارا کردنی ئەو پرۆژەیە لە خزمەتی ئەم ئوممەتەدا لە چوارچێوەی ئەزمونی زانکۆی جیهانی ئیسلامی مالیزیادا.

کە ئومێدەوارین —لەو دۆخانەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای پێدا تێپەڕ دەبێ— سەلامەت بێت و بەردەوام بێ و سوور و چەسپاو بێت لە بەدەستهێنان و دەستخستنی ئەرك و کار و بەرهەمەکانیدا، وە لە گەیاندنی پەیامەکەیدا، تاکو هەمیشە وەك نموونە بەردەوام بێت لە وڵاتانی ئیسلامیدا لە بواری گەشەپێدانی زانستی و چاکسازی هزریدا و لە کاراکردنی خوێندنی باڵادا بۆ خزمەتی ئەم میللەت و ئوممەتە و چاکسازی کردنی دەرچەکانی وەك خزمەتێك بۆ شارستانیەتی ئیسلامی و مرۆیی پڕ لە خێروبێر درێژەپێدانی، بە پشتیوانی خودا.

## چۆن زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامیەکان
## بونیاد بنێین و ڕوانگەی ئیسلامی بەدی بهێنین؟

پێش ئەوەی کۆتایی بەم لاپەڕەیە بهێنین، گرنگە کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ دۆزی بونیادنانی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان ئامادە بکەین، کەبەهۆی ئەوانەوە هزری ئیسلامیمان بۆ دروست دەبێ و بەوەش تێڕوانینی ئیسلامی بەدی دێت، دواتر بەم کارەمان دەتوانین سنورێك دابنێین بۆ ئەو وتووێژو سەرسامییەی پەیوەستە بە جەوهەری بونایەتی (ئیسلامییەتی مەعریفە)و چۆنیەتی بەدیهێنانی، جا یەکێك لە هۆکارەکانی لێڵی لە دۆزی ئیسلامییەتی مەعریفەدا، بریتیە لە لێڵی خستنەڕووی دۆزەکە، واتا دۆزی بونیادنانی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان و ناڕوونی سروشتی ناوەڕۆکەکەی و ئەرکەکەی و پەیوەندییەکەی بە هزرو کولتوری ئیسلامییەوە لەلایەك و پەیوەندیشی بە زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییەکانەوە لە لایەکی ترەوە.

لەبەرئەوە دەبێ ئەم دۆزە لە بنەڕەتەوە بخرێتەڕوو بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و دیار بۆ خوێندکارانی خوێندنی ئاسایی کولتوورییانە لەلایەك و خوێندکارانی خوێندنی کۆمەڵایەتی خۆرئاوایی لە لایەکی ترەوە، چونکە (ئیسلامییەتی مەعریفە)و (ئیسلامییەتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان) دوو ڕووی یەك دراون، جا ئەگەر پەیوەندی نێوانیان ڕوون و دیار نەبێ لەگەڵ زانستە کولتوورییە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، ئەوا مانای هێشتا واقوڕمان و گفتوگۆی بێسەرەوبەرە تەواو نەبووە سەبارەت بە تێگەیشتنی تەواو لە مانای (ئیسلامیەتی مەعریفە) ناوەڕۆك و نەخشەو کارپێکردنی

پێویستی بۆ گەیشتن بە دەستکەوتەکانی و دامەزراندنی و بەرهەمهێنانی، بۆیە هێشتا ئەوانە کۆتاییان نەهاتووە و هەوڵ و کۆششەکانیش بۆ بەرەوپێشچوون لەو بوارەدا سست و سنووردارە و کەڵەکە بووی کارەکەش کەرت و پەرت و پەرشوبڵاوە.

بۆ لابردن و ڕەواندنەوەی ئەم ئاڵۆزییە، پێویستە لەسەرمان کە دەست بکەین بە دیاریکردنی بوونایەتی ناخی زانستە ئیسلامییە کولتوورییە قوتابخانەییەکان، کە باویان هەیە و دەخوێنرێن، لە هزری ئوممەتی ئیسلامی و بەکارهێنانەکانی و پرۆگرامەکانی خوێندنیان و پاشان سروشتی ئەو زانستە کۆمەڵایەتییە هاوچەرخانەش دیاری بکەین، کە چین و ناواخن و بونایەتییان چۆنەو چۆن دەخوێنرێن و ئەرکیان چیە لە ژیانی هاوچەرخدا، تا دواجار بتوانین بگەینە دیاری کردنی سروشتی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییە هاوچەرخەکان و پەیوەندییەکانیان بە پرۆگرامگەرایی و بیرگەراییان لەگەڵ ئیسلامدا، لەگەڵ کەلتووردا، لەگەڵ زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییە هاوچەرخەکاندا، لەڕووی هاوردەکردنیان و ناوەڕۆکە هزریەکەیان، وە لە ڕووی پرۆگرام و توێژینەوە و خوێندنیانەوە.

بە دۆزی هزرو زانستە کولتورییە ئیسلامییە کلاسیکییەکان دەست پێدەکەین، لە ڕووی ناوەڕۆکییانەوە، هەروەها لەڕووی گرنگی و ئەرك و سروشتی ئامادەبوونیانەوە لە ناوجەرگەی واقعی ئوممەی ئیسلامیدا.

ئەوە ڕوونە کە لایەنی فیقهی (یاسایی) دارِشتە زاڵە باوەکەیە بەسەر ئەم هزرەدا، وە بەسەر ئەو جێبەجێکردنەی بۆی کراوە لە واقعی ئوممەتدا، وە لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئایین و هزری ئیسلامی.

(فیقه) له ناوەڕۆكدا دۆزی (یاسا)یە، وە ڕۆڵەكەیشی بریتیه له بەرجەستەكردنی له ژیانی كۆمەڵگه ئیسلامییەكاندا، له عەقیدەی ئوممەت و نەگۆڕەكان و بەروبوومی هزر و ئەزموونەكەی، له شێوەی یاساو بەندەكاندا، كه پەیوەندییه كۆمەڵایەتیەكان بەڕێوە دەبەن، له ئەنجامی ئەمەشدا ئەو یاساو بڕیارو فەتوایانەیان لێكەوتووەتەوە كه ئوممەت پێویستی پێی بوون بۆ بەڕێوەبردن و ڕێكخستنی ژیان و جووڵەی كۆمەڵگه و پەیوەندی تاكەكانی كۆمەڵگه و دام و دەزگاكانی. ئەگەر به وردی چاو بخشێنین به تێڕوانینی گشتییانه هەمه لایەنه ئاسانكراوەكەی هزری ئیسلامی و پەیوەندییەكانی به فیقه و یاسا ئیسلامییەكانەوە، بۆمان دەردەكەوێ كه فیقهی ئیسلامی له سەرەتاوه هزرو ناوەڕۆكەكەی له چاخی پێغەمبەر و یارانیەوە وەریگرتووە، لەو پەروەردە و پەیڕەوكردن و بەكرداریكردنەی ئەوانەوە كه جەوهەرەكەی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)و چاخی پەیڕەوكردنی فەرمانڕەوایی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بووە له دوای كۆچیدوایی پێغەمبەر، واتا چوار جێنشینەكه.

به داڕمانی چاخی جێنشینه ڕاشدەكان (چوار یاران)و فەرمانڕەوایی ئەو هاوەڵانەی كه له ناوەڕۆكدا فەرمانڕەواییەكانیان درێژكراوەی سەردەم و چاخی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بووه له هزر و پەیڕەوكردن و پەیوەندییەكان و پەروەردەدا، لەگەڵ چەند ڕادۆزیەكی (إجتهادات)ی گرنگی ئەوتۆ كه پێویست بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو گۆڕانكارییه گەورانەی ڕوویاندا به كۆچی دوایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وە كۆتایی هاتنی ماوەی دابەزینی وەحی لەلایەك و ڕزگاركردنی وڵاتانی تر له دەستی

موسوڵمانان لەلایەکی ترەوە و ئەو شتانەی کە لە ئارادا بوون لە فەرمانڕەوایی هۆزایەتی عەرەبەکان بۆ بەشداری کردن لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت و هاوشێوەی ئەمانە لە لادان و هەڵگەڕانەوەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لە چاخی ئەمەویەکاندا وە ئەو شتانەی کە سەریان هەڵدا لەو جەنگە کوشندەیەی دژ بە ڕەوت و قوتابخانەی هزری (مەدینەی پیرۆز) بەرپا کرا، تا کار گەیشتە ئەو ئاستە توندەی کە خودی (مەدینە)یشی گرتەوەو کارەساتی گەورەی تێدا بەرپا بوو، ئەنجامەکەیشی بەوە کۆتایی هات کە زاناو پەیامداران و پێشەوایان دابڕێنران لە کاروباری بەڕێوەبردنی گشتی ئوممەت و هزری ئیسلامی خرایە قاڵبی قوتابخانەییەوە لە مزگەوتەکاندا و لەو شتانەی کە پەیوەستن بە باری کەسێتی و مامەڵە کەسێتیەکانی خەڵك و دواجار ئەمە کاریگەرییەکی ناهەموار و کارەساتباری شارستانیانەی بەجێهێشت بەو شێوەی کە لە جێگەیەکی ترداو لە کتێبی (قەیرانی عەقڵی موسوڵمان)دا بە دوورودرێژی باسمان کردووە[1].

وە لەبەرئەوەی سروشتی سەردەمەکە و درێژە کێشانی لە ناوەڕۆکدا گۆڕانکارییەکی وای بەسەردا نەهات بوو لەو شێوەیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر و (دروودی خوای لەسەر) چوار یارەکانیدا بووە، بۆیە سوننەتەکانی پێغەمبەر و نموونەی کاری چواریارەکە لە بەدواییەکداهاتن و

---

[1] بۆ شارەزابوون بە قەیرانەکانی هزر و خواست لە ئوممەتی ئیسلامیدا بڕوانە کتێبی (ازمة عقل المسلم) لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی، هەمان نووسەر –هردندن– ڤێرجینیا– ١٩٩٤ز، وە کتێبی (ازمة الارادة والوجدان المسلم) هەمان نوسەر، چاپی سێهەم ساڵی ٢٠٠٧ز.

وردەكاری (كاتی و شوێنی)دا وەك شتێكی نموونەیی باش مابوونەوە، وە سەرچاوەی گرنگی ئەو  هزرە ئیسلامییە قوتابخانەییە كە دواتر ئەمەش زێدەڕەوی تێكەوت لە كۆكردنەوەی دەقەكان و پیرۆز گرتنیان و وردبوونەوە لە هەڵسەنگاندنی فەرموودەكاندا ئەمە ڕاستەو ئەمە هەڵەیە و ئەمە بەهێزەو ئەمە لاوازە، ئامانجەكە لە بنەڕەتدا بۆ پاراستنی ئەو سستییە بوو كە لایەنی هزری و سیاسی گرتبووەوە بە پەنابردنە بەر زاڵكردنی پیرۆزی(**قداسة**)و زێدەڕەویكردن لە وتاری (ترساندن)دا.

بە تێپەڕبوونی كات و بەردەوامبوونی دابڕان و دەستەوسانكردنی هزری و سیاسی و كۆتایی بەوە هات كە دەروازەی زانستەكان داخرا بە (داخستنی دەرگای ڕادۆزی: قفل باب الاجتهاد) و لاوازكردنی توانای خوێندكارانی زانستە شەرعییەكان و قوڵبوونەوە لە ڕووكەشی دەقەكان پیت بە پیتی جێبەجێكردنی فیقهی لە واقعی ژیان و پەیڕەوكاری و پەروەردە و پەیوەندییەكاندا كە زۆربەیان هەر بوونێكی ڕاستەقینەشیان نەما لە كۆمەڵگە ئیسلامییەكانی ئەم ڕۆژگارانەی دواییدا، كە تا ئێستاش ئەوە بە چاوی خۆمان دەبینین لە واقعی ئوممەت و كۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەكاندا، لە ڕووی سروشتی سەردەمەكە و چەتری ڕۆشنبیری و مەعریفە و تواناكانی و ئەو شتانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە كە زۆربەی یاساكان و بڕیار و حوكمە فیقهیەكان لە ڕووی بەجێهێنانی كرداریانەوە بەستراون بە سەردەم و دۆخ و هزرەكانەوە (ئەمانە مەبەستمان لە بنەماو بەهاكان نیە)و واقع و تواناو ڕووبەڕووبوونەوەی دۆخی چاخەكە، واتا كولتوور ئەگەرچی پڕە لە بنەماو

بەهای بەنرخ و باڵا و چەمکی مەزن لە واقعی چاخی جێبەجێکردنیاندا و توانا بەهێزەکەیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە کارایە، بەڵام ئەم یاساو ڕاوبۆچوونە فیقهیانە زۆربەیان لە ئەمڕۆدا بوونەتە هزرو واقعێکی مێژوویی، لە ڕاستیدا بوونیان نەماوە، هەروەها هاوکات بوونەتە یاساو فەرمان و بڕیارو جێبەجێکردن و پەیوەندییە مێژووییەکان و سەر بە واقعی ئێستای ژیانی ئەم ئوممەتە نین و دابڕێنراون و توانا و پێزی سەردەمی خۆیان تێدا نەماوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە.

گرنگە هەست بەوە بکەین کە دەبێ نەگۆڕ و جێگیرەکانی تێڕوانینی گەردوونی و بەهاو بنەما ڕاست و دروستەکانی پەی پێ ببەین، چونکە لە ئێستادا زیاتر لە هەموو کاتێکی تر ئەم ئوممەتە زۆر پێویستی بەوانە هەیە تاکو هزر و پەیوەندییەکانی خۆی لێ دروست بکاتەوە و درێژە بە کاروانی واقعی ژیانی و گەردەلوولی ڕووبەڕووبوونەوەی بدات.

حیکمەتی هێنانەوە سەر کاری ئەو تێڕوانین و جێبەجێکردنەی (پێغەمبەر)و (چوار یاران)ی لەبەر ڕۆشنایی بارودۆخە کاتی و شوێنییەکەی خۆیاندا گەنجینەیە و کارامەیی و پەند و وانە و مەعریفەی زۆر گەورەن و زۆر لە دەستکەوت و بایەخی زانستیش مەزنترن، ئەمە سەرەڕای لایەنە کەلتوورییەکەی کە لە ئێستادا پەراوێز خراوە، ئەمانە بکرێت بۆ خستنەوە سەر کاری توانا و هەوڵی زانستییانەی سەردەم و بەرهەمهێنانەوەی هزرو ڕێکخستنەوەی سەردەمییانەی ئەوتۆ کە وەڵامی داخوازییەکانی ئەم ئوممەتە دەدەنەوە و بونیادی پەیوەندی و دامەزراوەکانی لەسەر دروست

دەکرێتەوە بە شێوەیەکی کاراو کاریگەر، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جیهان و چاخەکەی خۆی لەژێر تیشکی تواناو چەترە مەعریفیەکەیدا.

بەڵام زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییە هاوچەرخەکان و پەیوەندیەکانیان بەدۆزی ئیسلامییەتی مەعریفەوە، کە ئەمەش دۆزی زانستە کۆمەڵایەتیە ئیسلامییەکانە، دۆزێکە پەیوەستە بە ناوەڕۆکەوە، وە بە پرۆگرامەوە، وە ئەگەر ئەو دۆزەمان لە یەکتری جیاکردەوە (ناوەڕۆك و پرۆگرام) ئەوا تێڕوانینەکە ڕوونتر دەبێت و مامەڵەکردنیش لەگەڵیدا ئاسان و بەرهەمدار دەبێ.

وە بۆ ڕوونکردنەوەی کارەکەو بەر لەوەی باس لە هیچکام لەوانە بکەین، ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ڕۆڵی زانستە کۆمەڵایەتییەکان چەندە گرنگە لە مەیدانی مەعریفە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

بۆ ئەوەش کە بزانین گرنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکان چیە، پێویستە بڕیار بدەین، وە لەڕووی سەرەتاییەوە بزانین کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان گرنگی و ڕۆڵی مەعریفییان و کۆمەڵایەتییان زۆر جیاوازترە لە ڕۆڵی یاساو فیقھ و حوکم و فەتوادان، چونکە ئەرکی ئەم زانستانە زۆر لە ئەوان فراوانترە، چونکە ناوەڕۆکی ئەم زانستە کۆمەڵایەتییانە توێژینەوەی کۆمەڵگەیە لەبەر ڕۆشنایی تێڕوانینی شارستانییانەدا جا ڕۆحی بن یان ماددی، وە لەسەر بنەمای سروشتی ماکییانەی مرۆڤ لە سنووری توانا مرۆییەکەیدا، وەك مرۆڤ و مادە و ڕووبەڕووبوونەوەی چاخە شارستانییەکەی.

ئەمەش واتا ئەرکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، بریتیە لە دروست کردنی هزری کۆمەڵایەتی لە سەرجەم بوارە جیاجیاکانی

ژیاندا به سیاسی و ئابوری و كۆمەڵایەتییەوە، لەسەر ئاستی تاك و كۆ و دامەزراوەییدا.

ئەمە مانای ئەركی زانستە كۆمەڵایەتییە ئیسلامییەكانە كە كرداری دروستكردنی هزری كۆمەڵایەتییە لە كۆمەڵگەدا، بەمەش ئەو مادە هزرییە ئیسلامییە دروست دەبێ كە فیهقی ئیسلامی و یاساو توێژینەوە یاسایی و فیقهی و خوێندنەكان پوختە دەكرێنەوە بۆ پاكژكردنەوەی ئەو یاساو ڕێنماییانەی پەیوەندییە یاساییەكانی لەسەر دادەمەزرێ، لەگەڵ بونیادنانی دامەزراوەیی لە كۆمەڵگەدا، واتە ئەركی فیقھ و یاسا بە پلەی یەكەم ئەركێكی شێوەییە و ئەركی زانستە كۆمەڵایەتییەكانیش بە پلەی یەكەم ئەركێكی هزریە، بەمەش ئەم دووانە وەك تەواوكارییەكانی هەردوو باڵی یەك باڵندەیان لێ دێت بۆ فڕین و خزمەتكردنی كاروانی ئەم ئوممەتە و بونیادنانی قەوارەكەی و شارستانییەتەكەی.

پرسیارێك لێرەدا دێتە ئاراوە: لە كوێدا زانستە كۆمەڵایەتییە خۆرئاواییە هاوچەرخەكان بە یەك دەگەن لەگەڵ دۆزی ئیسلامییەتی مەعریفە و بنیاتنانی زانستە كۆمەڵایەتییە ئیسلامییەكان؟ وە چۆن؟

لێرەدا ڕۆڵی جیاكردنەوە دێتە پێشەوە لە نێوان هزری خۆرئاوایی كە لە توێژینەوە و خوێندنی وانە كۆمەڵایەتییەكانەوە دروست بووە، لەگەڵ پڕۆگرامگەرایی ئەم زانستە كۆمەڵایەتیانەدا، با ببینین كە بونیادنانی زانستە كۆمەڵایەتییەكان داهێنانێك نییە لە خۆیدا و ڕێگەكەیشی ئاسانە و دۆزەكەیشی پەیوەستە بە كات و كەڵەكەبوونی توێژینەوەی زانستی كە سوودی لە كارامەیی كولتوور وەرگرتووە لەگەڵ دەستكەوتە كولتوورییەكان،

ئەم سوود وەرگرتنەش بە هێندی ئەوە نیە کە سوودی وەرگرتبێ لە پڕۆگرامی زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییەکان و دەستکەوتەکانی و کۆششکردن بۆ بونیادنانی ئاسانترو خێراترە لەوەی کە بۆی دەچین ئەگەر کارەکە لە ڕوانگەی باوەڕ و متمانە بەخۆبوونی تەواو و خۆڕاگری پێویست ئەنجام بدەین.

ئێمە دەشزانین کە ناوەڕۆکی هزری خۆرئاوایی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییەکان دەکەوێتە ژێر دوو کاریگەرییەوە: لایەنی یەکەم، لایەنی خودیانەی ئایدۆلۆژیانەیەو لە تێڕوانینە گەردوونیە خۆرئاواییەکەدا خۆی دەنوێنێ، کە ئەمیش لە جەوهەر و خەسڵەتیدا بە زۆری کەوتووەتە ژێر کاریگەرییە تێڕوانینە ئایدۆلۆژییە مادییەکەوە بە جۆرێك کە گەلانی خۆرئاوایی وا لێکردووە کە ئایینەکانیان هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر دروست نەکردوون کە کێش و بەهایەکی هەبێت بۆ کاریگەری لەسەر واقعی تێڕوانینەکەی و مامەڵەکردنی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی، بەڵکو ئەمانە ئەوانەن کە پەیڕەوی نازانمگەرایی دەکەن(Agnostic ).

بەڵام لایەنە بابەتییەکە لەم زانستە کۆمەڵایەتییە خۆرئاواییانەدا دەردەکەوێ لە پڕۆگرامگەرایی توێژینەوەی ماك (فطرة) و سروشتی مرۆڤ وە چۆنیەتی کارلێککردنی لەگەڵ واقیعەکەی و چۆنیەتی ئازادکردنی ئەم ماکە و وزە دەروونییەکەی بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی تێڕوانین و هەر شتێ کە دەربڕینی ئەو ئامانجانەی تێدا بێ وەك بەهاو چەمك و بنەماکان و سوود وەرگرتنی لە تواناکانی داهێنانی هۆکارەکان و چارەسەرکردنیان و دامەزراوەکان و دژوەستانەوە بەرانبەر بە ڕووبەڕووبوونەوەکان.

لێرەوە سوودوەرگرتن لە لایەنە بابەتییە داهێنراوە دروستکراوەکە و زۆربەی هۆکارە داهێنراوەکان و سیستم و دامودەزگاکان دەکرێت سوودیان لێ وەربگیرێ، وە هیچ پێویستمان بە دووبارە داهێنان و دۆزینەوەی کارەبا نییە لە زۆربەی کاروبارەکانماندا –وەك خۆیان وا دەڵێن.

پرسیارەکە ئەمەییە: ئایا ئێمە لە سوود وەردەگرین لە چەمکی توێژینەوە ماکی و یاسایی و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان، بگرە مادییەکاندا بارین بەسەر خۆرئاواوە؟ وە شتێکی نامۆ هاوردە دەکەین لە تێڕوانینە گەردوونییە شارستانییەتەکەمان؟

ئێستا ئێمە دەزانین کە ئەوە ڕاست نییە، ئیسلامیش بۆ ئەوە هاتووە کە ئەو شارستانییەتە مرۆڤایەتییانە نوێ بکاتەوە کە لە سەردەم و چاخی هاتنی ئیسلامدا بوون، جا یان ئەو شارستانیەتانە ئەرکی خۆیان جێبەجێ کردووە و گەیشتووەتە تەمەنی لاوازی و پیربوون و گەندەڵی و توانای بەخشینیان نەماوە، وەکو شارستانییەتی فارسی، یان هەر بە ڕاستی کۆتایی پێ هاتووە و مایەپووچ بووە و هیچی پێ نەماوە بۆ مرۆڤایەتی، وەکو شارستانێتی گریك.

ئیسلام بە بەربەیانێکی سەردەمێکی نوێوە هاتە ئاراوە، ئاسۆی زانستی و جیهانی واڵا کرد و کەوتە هاندانی فێربوونی زانست و هزر و توێژینەوە و خوێندن و پەند وەرگرتن و تێڕامان و وردبوونەوە.

بە هاتنی شارستانێتی ئیسلامی بەرەبەیانی توێژینەوەی زانستی تەقییەوە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لە یاساو ڕێسا گەردوونیەکان کە لەو کاتەدا وڵاتانی خۆرئاوا لە دواکەوتوویی و هەڕەمەکەیەدا دەژیان و هیچ مانایەکی زانستییان نەدەزانی سەبارەت بە یاسا گەردوونییەکان، مەگەر ئەوەی کە لە ئیسلامەوە فێری ببوون، یان لە قوتابخانە ئیسلامییەکان و تێکەڵبوونیان بە ئوممەتی ئیسلامی و

خوێندن له قوتابخانه و زانکۆکانی ئیسلام و مەعریفه وەرگێڕدراوەکان و زانسته وەرگێڕدراوەکان له زانایانی موسوڵمانەوه بۆ سەر زمانی خۆیان.

زانسته کۆمەڵایەتییه خۆرئاواییەکان تەنها درێژکراوەیەکی ژێری توێژینەوەی یاساو ڕێسا گەردونییەکانن له جیهانی ماددەدا تا دواتر درێژ بێتەوه بۆ توێژینەوەی ماکی (فطري) کۆمەڵایەتییانه به هۆیەوه له سەرجەم بوارەکانی پەیوەندییەکانی داو بونیاتنانی دامودەزگاو دروستکردنی هزری یاسایی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگەکانی بەپێی تێڕوانینی شارستانه و چەمکی تێڕوانینی مادییانەی خۆیان، که تا ئێستاش جیهان به دەستییەوه دەناڵێنێ بەهۆی دوو بەهاییەکەیەوه (جووتبەها)و ئەو پێوەرانەی ستەم و ئازاری داگیرکەرانی لێ کەوتەوه و بوون به مایەی دوژمنایەتی و ئاژاوەگێڕی له داهێنانی ئامێر و دەزگاکانی جەنگ و وێرانکاری. موسوڵمانان زۆر له پێش کەسانی ترەوەن بۆ پێشەنگی زانستی زانستی بۆ ماکه مرۆییەکان و یاسا و ڕێسا گەردوونییەکان و خوداییەکان له داهێنان و دروستکردنی بەدیهێنراوەکاندا، بەڵام بەهۆی ئەو کۆسپ و تەگەره و دەردانەی ئەم کاروانەیان گرتەوه وای کرد که ڕەوتی کاروانەکه خاو بکاتەوه و مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی زۆر بێبەش بوو له ڕێنماییەکانی وەحی و ئیسلام له ڕووی زانست و جیهانی بوون، که بووبێته مایەی بەکارخستنی تێڕوانینی دادپەروەری و برایەتی و لێبوردەیی و ئازادی و گرتنەخۆی ئاشتی و تەبایی و ئاسایش.

تێڕوانینی ئیسلامییانەی گەردوونی و وەحی ئیسلامی تێڕوانینێکن دەربڕی نەژادی ڕاستەقینەی مرۆڤن وه ڕێنماکاریانن، وه به وانەوه (خود)

دێته دی لەگەڵ ماکی ڕاستەقینەی مرۆڤ بەو شێوەیەی کە خودا بەدی هێناوە، وە هیچ بوارێك نەماوە بۆ بوونی ناکۆکی و نەگونجان لە نێوان وەحی و ماکدا، وە هیچ شتێکیش لە ئیسلام سوورتر نییە بۆ تێگەیشتن لەم ماکەوە و چالاککردن و کاراکردنی و ڕاگیرکردنی.

– لە هەموو ئەوانەی پێشووترەوە، تێدەگەین کە پێویستە خوێندکار و توێژەر و فێرخواز زۆر بە سادەیی ئەم چوار خاڵە جێبەجێ بکات:

١– خۆی دەرباز بکات لە دەردی لاساییکردنەوە و پاشکۆیی و خۆی باربۆبکات بە ژیرییەکی گشتگیرانەی شیکارییانەی زانستییانەی ڕەخنەگرانەی داهێنەرانە.

٢– خۆی پێبگەیەنێ لە بواری مەعریفەی تێڕوانینە قورئانییە گەردوونییە شارستانییەکە و بەهاو چەمك و بنەما و نەگۆڕ و چەسپاوەکانی.

٣– خۆی پێبگەبەنێ بە مەعریفەی پرۆگرامی زانستی بۆ توێژینەوەی نەژادە مرۆییە گەردوونییەکە و توێژینەوەی واقیع و وزە و تواناکانی لە کات و شوێنی شیاویاندا.

٤– سوود وەربگرێ لە کەلتوری ئیسلامی و دەستکەوتە زانستییە هاوچەرخە بابەتیەکان، تا بە هۆیانەوە تێبگات لە ئاسۆی نهێنیەکانی ناخی مرۆڤ و گەردوون و داهێنانی هۆکارو ڕێگەکانی، تا وا لە مرۆڤ بکرێ بگاتە ئاستی گەشەکردنە جیهانیەکەی و بەدەستهێنانی (ژیانێکی پاك و ئاسودە) لە هەردوو دنیادا.

بەم شێوەیە دەبینین کە (ئیسلامییەتی مەعریفە)و بونیادنانی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان و دروستبوونی هزری کۆمەڵایەتی ئیسلامی و

داهێنانی هۆکارو دەزگاکان و دروستکردنی هزری کۆمەڵایەتی ئیسلامییانەی هاوچەرخ و داهێنانی ئەو هۆکارو دەزگایانەی کە ژیان و کۆمەڵگە و پەیوەندییەکانی لەسەر دادەمەزرێت، لەسەر بنەمای تێڕوانینی گەردونییانەی قورئانی شارستانییەتانە، کارێکە جیاوازتر نیە لەوەی کە زاناو توێژەران بە گشتی دەیکەن لە سەرجەم بوارە زانستییە جیاوازەکاندا، وە هەموو ئەو شتەی کە پێویستمانە بریتیە لە دەرخستنی تێڕوانینی گەردوونی قورئانییانەی شارستانییەتانەیە، لەگەڵ دووبارە چاو خشاندنەوەدا بە چەمك و شێوازە پەروەردەیی و فێرکارییەکانماندا و دووبارە بونیادنانەوەی دامەزراوە فێرکاری و کۆمەڵایەتییەکان و چەمکە پەروەردەییەکان و خۆپێگەیاندنمان لە بواری پێویستییەکانی توێژینەوەی زانستی ئیسلامی کۆمەڵایەتی و گەردونی تا بتوانین ببینە کەسانی بەخشندەو داهێنەر و پێشبڕکێکار و پێشەنگی شارستانییەت.

لەم دەرچەیەوە زۆربەی بەرهەمە زانستی و هەنگاوە زانستییەکان لەلایەن پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامییەوە ئەنجام دراون، پێویستە کەسە ئەکادیمییەکانی بوارەکانی توێژینەوەی زانستی ئیسلامی و کۆمەڵایەتی و پرۆگرامی و بنکەکانی توێژینەوە زانستییەکان و زانکۆکان کار بکەن بە ئەنجامدانی توێژینەوەو چەسپاندن و پەرەپێدانی، بە مەبەستی پاڵپێوەنانی زیاتری ڕەوڕەوەی کاری باشتر و بەروبوومە کۆکراوەکانی لە بواری هزری ئیسلامیدا، تا بتوانرێت بگەینە خزمەتکردنی جەوهەرەکەی تێڕوانینەکەی، نەگۆڕەکانی، بەهاکانی، چەمکەکانی، نەك هەر ڕووکار بینی و جارنامەی بونیاتنان و بینا و تەلاری ڕووکەشانە. داخوازی کراوە بۆ

چاپکردنی کتێب و سەرچاوە لە بواری پرۆگرامگەرایی ئیسلامی و سەرچاوە زانستییەکانیدا و چاودێریکردنی بە بەرنامەیەکی ڕاهێنەرانە بۆ کەسە ئەکادیمی و ڕۆشنبیرەکانی ئەم بوارە.

گرتنەخۆ و پشتیوانی کردنی جووتپسپۆڕی (توێژینەوەی ئیسلامی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان) هەنگاوێکی سەرەتاییانەی گرنگە بۆ پێکهێنانی ژیری موسڵمانی هاوچەرخ و پێگەیاندنی کەسی ئەکادیمی و ڕۆشنبیری موسڵمانی هاوچەرخ ئەمەش ئەو هەنگاوە گرنگەیە کە پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی گرتیە خۆی لە پرۆگرامی خوێندن و توێژینەوەی ئیسلامی و کۆمەڵایەتیدا لە زانکۆی جیهانی ئیسلامی مالیزی، کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، کە شایانی گشتاندن و پەرەپێدان بێت.

پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی لە پرۆگرامی خۆیدا بۆ ساڵانی داهاتووە بە نیازە هەوڵێکی زیاتر بدات لە بواری دانانی کتێب و ڕاهێنانی ئەکادیمی لە پرۆگرامی خوێندنی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکانداو چاکتر ڕوونکردنەوەی دۆزی تێڕوانینی ئیسلامی بە ناوەڕۆکێکی پوخت و کورتکراوە و بەسوود و کارا لەگەڵ واقعی ژیاندا بەپێی کات و شوێن، ئەم پەیمانگەیە ئومێدەوارە کە پشتیوانی و هاوکاری زانستی بکرێت لەم بوارانەدا لەلایەن بیرمەندان و ئەکادیمی و چاکسازانەوە، هەروەها لەلایەن دامەزراوەکانی فێرکارییە زانکۆییەکان و بنکەکانی توێژینەوەی زانستییەوە.

## پلانی پەیمانگەی جیهانی بۆ پەرەپێدانی پرۆگرامەکانی خوێندنی باڵا:

یەکێك لەو بەشدارییە گرنگانەی ئەم پەیمانگەیە –پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی– ئەنجامیدا لە چاکسازی خوێندنی باڵادا، لە زانکۆیەکی نمونەیی –زانکۆی ئیسلامی مالیزیا– بریتی بوو لە پشتبەستن بە سستمی پسپۆڕێتی سەرەکی و پاشان پسپۆڕێتی لاوەکی –بەشەکی– لە کۆلیژی مەعریفەکانی وەحی ئیسلامی و زانستە مرۆڤایەتیەکان، کە کاتەکانی توێژینەوەی ئیسلامی یەکێك لە دوو پسپۆڕیەکە بوو بە جۆرێك کە دەرچووی زانکۆکە هەر کە خوێندنی پسپۆڕی لاوەکی تەواو کرد، ئەمەش بە زیادکردنی ساڵێکی تری خوێندن (٣٠–٤٠) کاتژمێر دوو نمرە و بڕوانامەی بە کالۆریۆس وەردەگرێت، یەکەمیان لە توێژینەوەی ئیسلامیداو دووەم لە یەکێك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان یان مرۆڤایەتییەکاندا.

ئەم سستمە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو بەشدار بوو لە بەرهەمهێنان و پێگەیاندنی دەرچووانێکی پابەندتر و پێگەیشتووتر و تێگەیشتوو تر لە پەیبردن بە تێڕوانینی ئیسلامی شارستانییەتانە و ڕۆڵی شارستانییانەی ئوممەت بۆ کاروانی شارستانییانەی مرۆڤایەتی، هەروەها ڕێژی زانستییانەی زیاتریشیان وەرگرت لە بواری پسپۆڕییەکانیاندا.

وەك تەواوکاریەك بۆ ئەم کارەو چاکتر کامڵکردنی دەستکرا بە داڕشتنی نەخشەیەکی چاکسازی گشتیانەترو دواڕۆژییانە بۆ پرۆگرامی خوێندنی زانکۆیی و دواتر ڕاسپاردنی مامۆستا دەگمەن و بەتواناکانی زانکۆ لە

توێژینەوە و خوێندنی پسپۆڕییانەی ئیسلامی بۆ داڕشتنی درێژەی ئەم پلانە و دیاریکردنی مادده زانستییەکانی خوێندن.

**بڕبڕەی پشتی ئەم پلانە بریتییە لە (پڕۆگرام)و هەماهەنگی گشتی لە توێژینەوەی ئیسلامی، کە پێکهاتووە لە دوو بەش:**

– بەشی یەکەم: نزیکەی سی کاتژمێری ئەکادیمییە و تایبەتە بەو شارەزاییەی کە دەبێ هەموو موسڵمانێك دەربارەی ئایینەکەی بیزانێت، لە عەقیدە و بنەما و بەها و چەمك و مەبەست و ئەرکە شەرعییەکانی سەرشانی موسوڵمان بە تێڕوانینێکی گەردوونییانە و جەوهەری پێکهاتەی بەها و ڕەوشت و مەبەستەکانیەوە. ئەم بەشە هەر دەبێ وەك پسپۆڕیەکی لاوەکی –فرعی– هەموو خوێندکارێك بیخوێنێت جا لە هەر بوارێکی توێژینەوەی ئایینی یان کۆمەڵایەتی یان مرۆڤایەتیدا بێت.

–بەشی دووەم: لەم پڕۆگرامەشدا، کە هەر نزیکەی سی کاتژمێری ئەکادیمیە، مەبەست لێی زانیاری گشتییە دەربارەی مێژووی ئەم ئوممەتە و ژیاننامە و شارستانێتی و زانستە ئاینییەکان. لە پاڵ ئەم پڕۆگرامەشدا، دوو جۆرە پڕۆگرامی تر هەیە، کە یەکەمیان ماوەی پرگۆرامیانەی خوێندنی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەکانە لە لایەکەوە و پڕۆگرامەکەی تریش پسپۆڕی تایبەتە لە زانستە ئاینییەکاندا لەلایەکی ترەوە کە بریتیە لە پسپۆڕی فیقه و یاسا (شەریعەت)و پسپۆڕی عەقیدە و فەلسەفەی (زانستی بنەماکانی ئایین)و پسپۆڕی زانستی نوێ، پسپۆڕی زانستی تەفسیر، پسپۆڕی زانستی ژیاننامە و پسپۆڕی زانستی فەرموودەزانی، پسپۆڕی زانستی ڕەوانبێژی.

وە گرنگە لێرەدا ئاماژە بەو بابەتانە بکەین کە بڕیاریان لەسەر دراوە بۆ خوێندن لە بواری توێژینەوەی چەمکییە شیکارییانەی ڕەخنەگرانە بۆ هزرو تێڕوانینی گەردوونی و شارستانییەتی ماددییانەی خۆرئاوایی هاوچەرخ و ڕەهەندەکانی پەیوەندیەکانی و کاریگەریەکانی لەسەر ئوممەتی ئیسلامی، کە بڕیاری لەسەر دراوە وەك بڕیاری بەشەکی لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیا بەناوی (توێژینەوەی خۆرئاوایی ناسی)، دەکرێت پێشی بگوترێ: (توێژینەوەی هزرو شارستانێتی خۆرئاوا) و ئامانجیشی لەم بەشە پێگەیاندنی کەسانی شارەزایە کە تێگەیشتبن لە شارستانێتی خۆرئاوا و پەیوەندی بەردەوام و کارا لەگەڵ لایەنە چاکەکەی و سڕینەوەی لایەنە خراپەکەی، هەروەها چەند بەشە وانەیەکیش دانراوە کە لەپاڵ ئەمانەدا یارمەتی بوارە پسپۆڕییەکانی تر دەدات و ئومێدەوارین ئەم بابەتەیان لە بەشەکییەوە بکرێت بە پسپۆڕییەکی سەربەخۆ، کە کادرەکانمان زۆر پێویستیان پێیان هەیە. بەمەش پڕۆگرامی خوێندن بۆ هەر خوێندکارێك پێکدێ لە دوو بواری پسپۆڕی بە جۆرێك کە بەشی یەکەمی هەریەکەیان لقی یەکەمی پڕۆگرامی توێژینەوە ئیسلامیەکەیە (بڕبڕە پشت) کە پێویستە بەشێك بێ و جیانەکرێتەوە لە پڕۆگرامی هەر خوێندکارێك جا هەر پسپۆڕییەکی هەبێت لە پسپۆڕییەکەی تر، و لە هەر زانستێك لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان یان مرۆڤایەتیەکان یان یاساییەکان، یان ئابورییەکان، یان ئاینییەکان، جا سەرەکی بێت یان لاوەکی، ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەبێ پڕۆگرامی خوێندکار بۆ بەدەستهێنانی بەکالۆریۆس بەم جۆرە بێت:

(٣٠ كاتژمێر بەشی یەکەمی توێژینەوەی ئیسلامی+ ٦٠ كاتژمێر پسپۆڕێتی سەرەکی+ ٣٠ كاتژمێر بابەتی یاریدەدەر= ١٢٠–١٣٠ كاتژمێر نمرەی بەکالۆریۆس لە یەکێك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان یان مرۆڤایەتییەکان یان ئایینییەکان)

(٦٠ کاتژمێر توێژینەوەی ئیسلامی+ ٣٠ كاتژمێر پسپۆڕێتی لاوەکی+ ٣٠ کاتژمێر بابەتی یاریدەدەر= ١٢٠–١٣٠ نمرە بەکالۆریۆس لە توێژینەوەی ئیسلامی دا)

(٦٠ کاتژمێر توێژینەوەی ئیسلامی+ ٣٠ كاتژمێر پسپۆڕێتی پەروەردە+ ٣٠ کاتژمێر بابەتی یاریدەدەر= ١٢٠–١٣٠ نمرە بەکالۆریۆس لە توێژینەوەی ئیسلامی دا، واتا وانەوتنەوەی فێرکردنی ئایینی ئیسلام بۆ گشتی و بنەڕەتی و ئامادەیی).

بەم جۆرە ئەگەر خوێندکار پسپۆڕی لاوەکی –لقی– تەواو کرد بۆ ئەوەی ببێ بە خاوەنی پسپۆڕێتی سەرەکی ئەوا دەرچووەکە دوو نمرەی بەکالۆریۆسی دەبێت، یەکەمیان لە توێژینەوەی ئیسلامیدا و ئەوی تریان لە پسپۆڕییەکی تردا.

هەروەها پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە نزیکەی (٣٠) کاتژمێر بابەتی یاریدەدەرە بۆ ئەو پسپۆڕییە سەرەکییەی کە ماوەی کاتژمێرەکانی (٦٠) کاتژمێرە، بۆ ئەوەی کۆی کاتژمێرەکانی دەرچووە کە لە نمرەی بەکالۆریۆسدا، لە هەر پسپۆڕییەکدا بریتی بێ لە (١٢٠–١٣٠) کاتژمێری ئەکادیمی و بۆ هەردوو نمرەی بەکالۆریۆسەکە کە یەکەمیان پسپۆڕی توێژینەوەی ئیسلامییە و لە (١٥٠–١٧٠) کاتژمێر پێکهاتووە–٦٠ (پسپۆڕێتی

سەرەکی)+ ٣٠ (پسپۆڕێتی سەرەکی)+ ٣٠ (بابەتی یاریدەدەر)= ١٢٠–١٣٠ کاتژمێر (بۆ نمرەی بەکالۆریۆس)–١٢٠ (بەکالۆریۆس)+ ٣٠ (تەواوکردنی پسپۆڕێتی لاوەکی)= ١٥٠–١٧٠ کاتژمێر (بۆ هەردوو نمرەکەی بەکالۆریۆس).

زۆریش گرنگە تێبینی ئەوە بکەین کە زۆربەی بابەتەکانی خوێندن بەسن بۆ تاکە یەك وەرزی خوێندن (٢) کاتژمێری ئەکادیمییانە، نەك (٣) کاتژمێر تاکو بتوانرێت ڕووماڵی ناوەڕۆکی هەندێ لە بابەتەکان بکات، بە تایبەتیش لە بەشی دووەمی خوێندنی توێژینەوەی ئیسلامی.

گرنگە کە مادە یاریدەدەرەکان ڕووماڵی پسپۆڕییەکانی توێژینەوە ئاینییەکان بکەن لەلایەن کۆمەڵایەتیە فراوانەکە دا کە دەبێتە یاریدەدەر بۆ فراوانکردنی ئاسۆی بیری خوێندکار و تێگەیشتن لەلایەنە دەروونییە کۆمەڵایەتییە ماکییە پەیوەندیدارەکەوە بە بواری خوێندنەکەیەوە، وە بە تێڕوانینێکی واقیعییانەی کردارییانە، وە گرنگە کە لەمادە یاریدەدەرەکان بێت کە سێ دەروازەی گشتی بۆ سێ بواری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و دەروونی و سەرەڕای ئەمەش خوێندنی (خێزانپەروەری)و (بیرکردنەوەی داهێنەرانە و چارەسەرکردنی کێشەکان) لە داخوازییەکانی زانکۆ بێت بۆ خوێندکارەکان بە گشتی بە کوڕان و کچانەوە.

وە ئەگەر توانرا بابەتی (دروستکردنی شارستانیەتەکان و داڕمانیان) لە چوارچێوەی داخوازییەکانی زانکۆ بێت بۆ خوێندکارانی زانستە ئاینی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان ئەمەش کارێکی باشە، چونکە ئیسلام ئایینی شوێنێکە کە لانکەی شارستانیەتە زۆرەکانەو بەوە جیا دەکرێتەوە کە هۆکارو کاریگەری هەموارو ناهەمواری وای هەیە و کە لە ڕابوردوودا تێیدا

بووەو تا ئێستاش تێیدایە و سێبەری دیارە بەسەر کەسێتی شارستانیەتی گەلانی ئەم ئوممەتەدا، لەبەرئەوە پێویستە ئەم مێژووە و ئەم میراتە شارستانییەتە بە شێوەیەکی زانستی و گشتی بمێنێتەوە لە هۆشیاری کادرە هزری و سەرکردەییەکانی ڕۆڵەکانی ئوممەتی ئیسلامی. ئومێدەوارین دەستکەوتی درێژەی ئەم پلانەی پرۆگرامەکان و مادەکانی خوێندن کە لەم ساڵەدا بۆی دانراون (٢٠٠٨)و بەرنامەی خوێندنی باڵای زانکۆیی لە وڵاتی ئیسلامیدا سوودی لێ وەربگرێ بۆ خستنە ناو بەرنامەی خۆیەوە بە پشتیوانی خودا.

بەڵام چۆن زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییە هاوچەرخەکان شی دەکەیتەوە و چۆن ڕاستییە زانستییەکان و توانا واقیعییەکان بەکاردەهێنیت بۆ خزمەتکردنی تێڕوانینی قورئانی گەردوونی شارستانییانە لە بوارەکانی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆیی و فیزیایی و تەکنۆلۆژییەکاندا لە تێڕوانینی ئیسلامییەوە، هەروەها بۆ خزمەتی دیدگای ڕۆحیی ئیسلامی شارستانیانە؟ چونکە ئەمە بەرهەمی کەڵەکەبوونی توێژینەوە زانستییەکان و مامۆستاکانی و بنکەکانیەتی، کە دەستیکردووە بە بەرهەمدان لە زۆربەی بوارەکاندا و دیسانەوە خەریکە ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر لە دەستکەوتنی کارە پرۆگرامییە ئەکادیمیەکاندا لەلایەن تیمە زانستیەکانەوە لە چوارچێوەی پرۆگرامی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی بۆ هێنانەدی یەکگرتنی مەعریفە و (ئیسلامییەتی مەعریفە).

بەڵام زانستە فیزیاییەکان و تەکنۆلۆژیەکان وا باشە بەهۆی دووروردرێژی داواکاریەکانی لەسەری و قورساییەکەی، بۆ نموونە وەکو پزیشکی، دەبێ

پرۆگرامێکی وای هەبێ کە پێکهاتبێ لە زۆربەی بەشی یەکەمی پرۆگرامی توێژینەوە ئیسلامییەکان و شارەزابونێکیش لە شارستانێتی ئەم ئوممەتەو پەیامەکەی بە تایبەتیش ئەوەی پەیوەندە بە بواری خوێندنی هەر خوێندکارێك بە شێوەی بابەتی یاریدەدەر، وە بۆ خوێندکاری ئارەزوومەندیش بۆ مەعریفەی ئیسلامی وەك ئاینێك یان شارستانییەك دەتوانێت پتر بخوازێت، یەکێکی تریش لەو شتانەی کە جێگەی بایەخە لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیادا بریتین لە پلەی ماستەر و پلەی دکتۆرا، لە توێژینەوە ئیسلامیەکاندا بۆ هەر دەرچوویەکی زانکۆ، لە هەر بوارێکی زانستیدا بێت، وە لە هەر بەش و لقێکی مەعریفە بێ، دوای پێگەیاندن و شارەزاکردنی بەو بابەتانەی کە پێویستە بۆی لە بابەتەکانی خوێندن وەك یەکێ لە داخوازیە پێشینەکانی خۆی لە ڕووی زانستییە پرۆگرامییەکەوە، بە هەرحاڵ خوێندکار دەتوانێ زانستە فیزیایی و تەکنۆلۆژییەکان بخوێنێت و هاوکات توێژینەوە ئیسلامییەکانیش پسپۆڕێتی دووەمی بێت.

## نەخشەیەکی نەرم:

لە کۆتاییدا زۆر گرنگە تێبینی ئەوە بکەین کە لەناخی ئەم نەخشەیەدا نەرمیەکی زۆر و فراوان هەیە بۆ وەڵامدانەوەی پلانی زانکۆجۆراوجۆرەکانی ترو پێویستییە پسپۆڕییە جیاوازەکانی تر، لەبەرئەوە ئەم (٦٠) کاتژمێر)ە لانی کەمە بۆ هەر پسپۆڕییەکی سەرەکی، لەبەرئەوە (٣٠-٤٠) کاتژمێری تر دابینکراوە بۆ یارمەتیدانی پرۆگرامی خوێندن، بەمەش دەکرێ تا سنوری (٢٠) کاتژمێری یارمەتیدەر زیاد بکرێت بۆ زیادکردنی ماوەی کاتژمێرەکانی هەر

پسپۆڕییەکی سەرەکی تاکو ماوەی کاتژمێرەکانی ببێتە (٦٠-٨٠) کاتژمێر ئەمەش ئەوپەڕی سنووره بۆ هەر پسپۆڕییەك، ئەوەی کە ماویشەتەوە (١٠-٣٠) کاتژمێر تەرخان دەکرێ بۆ داواکارییەکانی زانکۆ و بابەتە یارمەتیدەرەکانی تر. بەم جۆرە ئەم پلانە دەکرێت بگونجێنرێت و لاستیکییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت بە جۆرێك کە بەس بێت بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی پرۆگرامە جیاوازەکانی خوێندن، بۆ ئەوەی دەرچووی زانکۆیی وا بەرهەم بهێنێت کە کادرێکی تێرو تەواو بێ لە پێکهاتەی زانستییانە و ویژدانییانە و شارستانییانەی وادا کە پێویستە بۆ گەشەکردنی جۆرایەتی لە بەجێهێنانەکانی ژیاندا بۆ ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە و کادرە زانستی و سەرکردەییەکانی، تاکو ئوممەت بتوانێت پەیامی ئەم ئیسلامە شارستانییە چاکسازیە ئاوەدانکاریە بگەیەنێت، بە پشتیوانی خودا. هەروەکو دەبینین ئەرکەکە بەم ئەندازەیە ڕوون و ئاسانەو هیچ بوارێکی تێدا نامێنێتەوە بۆ واقوڕمان و سەرسوڕمان و ئاڵۆزی، وە ئەگەر نیازی هەستانەوە و چاکسازیمان هەبێت ئەوا ئاواتەکانیش دێنە دی بە پشتیوانی خودا.

# دۆزی پێنجەم

## عەقیدەی خاچ لەنێوان گاورێتی و ئیسلامدا

## بەرەو گفتوگۆیەکی بنیاتنەرانە و وشەی هاوبەش

## پێشەکی:

یەکێك لەو کاروبارانەی جێگەی سەرنج و ئاوڕلێدانەوەیە —بەتایبەتیش لەبەر ڕۆشنایی زۆربەی خستنەڕوو باسکردنە سادە و ڕووکەشەکان— ئەو توندی جیاوازیەیە کە کەوتووەتە نێوان گاور و موسڵمانانەوە، سەبارەت بە بیروباوەڕ و عەقیدەی خاچ لە ئاینی مەسیحیدا، بۆیە بە هێندەی ئەوەندەی کە گاورێتی وابەستەیە بە عەقیدەی خاچەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە سونبول و هێمای خۆشەویستی و قوربانیدان و بەرخۆدانە، ئەوەندەش موسوڵمانان ئینکارن لەسەر ئەوەی کە ئەو جۆرە عەقیدەیە گومڕاییە و هەڵبەستراوە، وە بینەری سەرپێی لەم دوو بۆچوونە دژە و لەم خستنە ڕووە شێواوە سادەیە سەر دەرناکات، وە تێناگات لە واتایەکی قەناعەتییانەی ئەوتۆ کە ئەم دوژمنایەتییە سەر سەختەی بۆ ڕوون بکاتەوە، سەبارەت بە ڕاستی و ناڕاستی ڕووداوی خاچ، جا ڕوونکردنەوەکە بەلای هەموار یان ناهەمواردا بێ.

ئەگەر ئەم جیاوازییە درێژکراوەی پەیوەندی مێژینەی نێوان ئیسلام و گاورێتی بێ و ڕوکارەکەشی وەك ڕووکارێکی دوژمنایەتییانەی هەڵگیرساوی نێوانیان بێت، ئەوا نابێ بەو سادەییە سەیری بکرێ کە زۆربەی خەڵکی وا بۆی دەڕوانن، کە زۆر بە شێوەیەکی هەرەمەکی وابەستەی بوون، جا یان بەوەی کە لایەنگری ڕاستێتی هەڵوێستە کەن بەوەی کە مەسیح لە خاچ دراوە، یان بە پێچەوانەوە، بەبێ توێژینەوەیەکی پڕ لە وردبوونەوە و گشتگیرانە، بە تایبەتیش کە هەڵوێستی قورئان ڕوون و دیارە بەرانبەر بە نکووڵیکردن لەوەی کە لەخاچ نەدراوە و هاوکات هاو هەڵوێستیشە لەوەی کە ئاینی گاورێتی ڕاست و دروستە و لە خوداوە هاتووە، هەروەها هاوڕایە لە

بەرز ڕاگرتنی شکۆی عیسای کوڕی مەریەم و دایکی، کە کچی عیمرانە(دروودی خوای لەسەر) و وەك پێغەمبەرێك ڕەوانە کراوە لەلایەن خوداوە.

ئەگەر بشمانەوێ لەم بابەت و دۆزە تێبگەین ئەوا دەبێ توێژینەوەی وردی لەسەر بکەین، بەتایبەتی ئەگەر خوازیاری ئەوە بین کە لە بواری تێگەیشتنی گشتگیرانەی تێڕوانینی گەردوونیی و شارستانێتی قورئانیەوە لێی بڕوانین، وە هەڵوێستە بکەین لە پەیوەندییە مرۆیی و شارستانییەتەکانی موسوڵمان بە کەسانی ترەوە و قسەمان هەبێ لەسەر ئەم بوونی جیاوازییە توندەی کە بووەتە خەسڵەتێکی بنچینەیی لە عەقیدەی مەسیحییەکاندا، ئەوەش لە پێناوی لێکتێگەیشتن و گفتوگۆیەکی بنیاتنەرانەی باشتردا، لەنێوان مەسیحی و موسوڵماناندا، وە لەنێوان مەسیحیەت و ئیسلامدا، کە ئەمانە دوو ئاینی جیهانی گەورەن و تاکە دوو ئاینی هاوچەرخی ئەم دنیایەن، وە هەردووکیان بنچینەی زۆر گەورەن –بە شێوازی جیاوازەوە– لە داڕشتن و بنیاتنانی دوو شارستانێتی مرۆڤایەتییانەی وا گەورە کە تاکو ئێستا مێژووی مرۆڤایەتی شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە، بۆیە دەبێ قسەو وتوویژی قوڵ و ورد لەسەر ئەم بابەتە بکرێ و لە پێگە گشتییە گونجاوەکەی خۆیدا دابنرێن، لەناوجەرگەی پەیوەندی و گفتوگۆی ئەرێنی نێوان هەردوو ئاینەکەدا، بە تایبەتیش لەکاتێکدا هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم بەربەرەکانێ کردنەی نێوانیان لە رووی ئایینی و عەقیدەییەوە، لە ڕاستیدا هەڵەی زۆربەی کەسەکانە لە هەردوو لایەنەکە، سەبارەت بە تێگەیشتنی دروست لە جەوهەری بابەتەکە و گوێنەگرتن بۆ ئامانجی قسەو بەڵگەکانی لایەنەکەی

بەرانبەری، دواجار هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کاری لێکنزیك بوونەوە و پێکەوە گفتوگۆکردنیان بە ئامانجی گەیشتنە ڕاستی قورس و گرانتر بێت. ئەویش ئەوەیە کە (کەنیسە) خەریکە دان بە ڕەوایی لایەنەکەی تردا نانێت کە ئیسلامە و هەر لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە پەیوەندیەکی دژو ڕووبەڕووبوونەوەی عەقیدەیی لەگەڵدا بردۆتە سەر.

هاوکات پێویستە لەسەرمان، کە هەست بەو سەختیە گەورەیە و ئەو قورساییە گرانە بکەین کە لەبەڕێوەچوونی گفتوگۆکاندایە سەبارەت بەم دۆزە، کە لە ڕاستیدا ئەم ئەرکە دەکەوێتە سەر شانی موسوڵمانان، هەڵگرانی پەیامی خودایی، کە گشتی و گشتگیرو جیهانی و کۆتا پەیامی ئاسمانیە، تا بەیەکتری بگەن و دەرگای وتووێژ بکەنەوە لەگەڵ هەڵگرانی ئاینی مەسیحیدا، کە دەبنە لایەنی دووەم، بەتایبەتیش کە ئیسلام پێشدەستی کردووە لە پووچەڵکردنەوەی ئەو عەقیدە هەڵەو باوەی خاچ هەیەتی و نکۆڵی لێ دەکات و ڕەتی دەکاتەوە.

## چۆن وتووێژ بەڕێوەببەین؟

یەکەمین هەنگاو بۆ ڕاستکردنەوەی بنەماو یاساکانی وتووێژ سەبارەت بەم دۆزە گرنگە، ئەوەیە کە جەوهەری گفتوگۆکان لەسەر بنەمای دەقە قورئانییەکان بن، کە سەرەتا قورئان خۆی ئەم دۆزەی وروژاندووە، وە وتووێژەکان بە شێوەیەکی تێروتەسەل و هەمە لایەنە بن لەم گفتوگۆ قورئانییەدا لەگەڵ مەسیحییەکاندا، وە تێگەیشتنی تەواو لەم خستنەڕوویەدا و تێگەیشتن لە ئامانجەکانی بەڕەچاوکردنی ئەم دۆخە کات و شوێنەی کە

بووەتە هۆی بەرپاکردنی ئەو وتووێژەی وتاری قورئانی، سەبارەت بە عەقیدەی خاچ لە قورئاندا، کە دۆزەکە لەوێوە دەستی پێکردووە.

وە لەو ناکۆکیەی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت، کە لە چاخی حەوتی زاینییەوە دەستی پێکردووە و تا ئێستاش بەردەوامە، گەرچی ولاَتانی خۆرئاوا بە گشتی عەلمانین و ئەوروپاش بەتایبەتی و هەموویان بە گشتی بڕوایان بە مەسیحیەت نیە وەکو عەقیدە، بەڵکو پێیان دەگوترێ (Agnostic) –کە مانای (نازانمگەرا) دەگەیەنێ– گەرچی ئایینی مەسیحییان بەکارهێناوە لە هێرشە داگیرکارییەکانیاندا و بینیومانە و ئێستاش دەیبینین لە هەوڵەکانیاندا بۆ ڕۆژهەلاَتگیری و بە مەسیحیکردنی خەڵکی و بچووککردنەوە و ناشیرینکردنی ئیسلام و تۆمەتبارکردنی و ناکۆککردنی وێنەی ئیسلام و ناوبانگەکەی، لەبەرانبەر ئەوەشدا زۆرێك لە موسوڵمانان کەوتوونەتە بەرپەرچدانەوە و هێرشکردنە سەر ئایینی کەنیسە و پەستاوتنەوەی و شکۆشکاندنی، لێرەدا بێگومان پێویستە بپرسین ئایا هۆکاری دروستبوونی ئەم بەربەرەکانێکردنەی نێوان ئەم دوو ئاینیە دەگەڕێتەوە –بەڕاستی– بۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز ڕەخنەی لەو جۆرە مەسیحیەت و عەقیدەیە گرتووە و بۆی ڕاستکردووەتەوە و ڕوون و پاکی کردووەتەوە لەو لادان و دەستکاری کردنەی تێیدا کراوە و بناغەکەی وێران کردووە کە عەقیدەکەیە، بەتایبەتیش لەوەدا کە باسی لەخاچنەدانی حەزرەتی مەسیح دەکات (درووی خوای لەسەر)و دواتر ئەو بیروباوەڕانەی لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، لە هێماو چەمکەکاندا؟ هەروەها بۆمان هەیە بپرسین ئایا ئەم بەربەرەکانێکردنەی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت

ئامانجەکەی ئەوەیە کە سونبول و هێماکانی مەسیحییەت ڕیسوا بکات؟ وە ئایا ئیسلام و هەڵوێستی موسوڵمانان لە ناوەڕۆکدا تەنها بۆ ئەوەیە کە تیروتوانج لە ڕاستێتی ئەم هێما و سونبولانەی مەسیحیەت بدات و لە شان و شکۆیان کەم بکاتەوە؟ یان لە ڕاستیدا کارەکە لەوە گەورەترە؟ وە ئایا کرۆکی ئەو ململانێیە ئەوەیە کە لە جەوهەری دۆزەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە و ململانێکارەکانی بە گشتی گرتووەتەوە و کەوتوونەتە ناو تاریکاییەکانی ناکۆکی و جیاوازیخوازییە سەر کوێرانەکانەوە؟

وە ئەگەر ئێمە زانیاریمان پێ بێ و متمانەمان بە قوڵایی واتا قورئانییەکان و بڵندیی مەبەستەکانی هەبێت، هەروەها گشتگیری و خستنەڕووی دەقەکانی و لێبوردنی لە کەسانی ترو سوربوونی لەسەر ئازادی عەقیدەیی و ئاینی، ئەوا ئەوسا پێویستە هەموو لایەنەکان بە خۆیاندا بچنەوە لە چۆنیەتی لێتێگەیشتنیان لە خستنەڕووی دەقە قورئانیەکان و هەڵەی لێتێنەگەیشتنی لایەنەکان لە قورئان ڕاست بکەینەوە، ئەوەش بەوە دەکرێ کە شۆڕ بینەوە بە قوڵایی هەموو لایەنەکانیدا، تا دەگەینە دۆزینەوەی هەڵوێستە یەکلاکەرەوەکەی قورئان، کە هیچ خواری و ئەملاولایەکی تێدا نییە، سەبارەت بە سووربوون لەسەر ناڕەوایی عەقیدەی خاچ و ئەو عەقیدە و شوێنەوارانەی لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە.

وە یەکەمین شتێك کە جێی سەرنجە، ئەو قورئانەی بە ئینکارییەوە سوورە لەسەر پوچەڵکردنەوەی عەقیدەی خاچ لە دڵێکی دوژمنکارانەوە بەرامبەر بە مەسیحیەت هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو لە خودایەکەوەیە کە زۆر قەدرو ڕێزی بەخشیوە بە ئایینی مەسیحی و مەسیح و دایکی و بەرگریشی لێ

دەكات بۆ پاراستنی لەو هەموو هەوڵانەی کە لەکاردا بوون بۆ ناشیرینکردنی ئەم ئایینە و سووککردنی، جا ئەو کەسانە لە ڕابوردوودا بووبن یان لە ئێستا و ئایندەدا.

سەرسامییەکەشی لەوەدایە کە ئیسلام، ئەو دینەیە کە بۆ یەکەمجار دابەزییە ناو ئەو بتپەرستە عەرەبانەی کە هەست و ژیری و هۆشیاریەکی ئەوتۆیان نەبووە سەبارەت بە مەسیحیەت، ئەوەش فرسەتێکی ڕەخساو بوو بۆ ئیسلام ئەگەر بیویستایە توانج و تەشەر لە مەسیحیەت بدات کەچی لێرەدا بە پێچەوانەوە —ئیسلام دان بە پێغەمبەری مەسیحییەتدا دەنێ، وە باسی پەرچووە گەورەکانی دەکات، بەوەی کە حەزرەتی مەسیح منداڵی کچێکی بێمێردە و خودا توانای زیندووکردنەوەی مردوشی پێبەخشیوە — ئەمانەش لەو سەردەم و بارودۆخەدا ـ بۆ کەسێك کە دوژمن بێت ـ گەر ئیسلام دوژمنی عیسا بووایە ـ لەوە ئاسانتر نییە کە نکوڵی لێ بکات و تانەی قەناعەتدارانەش بدات لەو کەسانەی کە لاف ئەو جۆرە موعجیزانە لێ دەدەن و هەمووی بە درۆ و تەزویر و بوختان دابنێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزانەش بە چەندین شێوە باسی گەورەیی و سەروەری حەزرەتی مەسیح و دایکی و ئایینی پیرۆزی ڕاستەقینەی مەسیحییەت دەکەن، خودا دەفەرموێت: [وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ] (آل عمران: ٤٢)، [إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَالاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ( ٤٥ )وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ( ٤٦ )قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ

ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ( ٤٧ )وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ( ٤٨ )وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٤٩)] (آل عمران: ٤٥-٤٩)، [مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ] (مريم: ٣٥)، [يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا( ١٧١ )لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا(١٧٢)] (النساء: ١٧١-١٧٢)، بەڵكو قورئانی پیرۆز دوودڵ نیە لەوەی کە کەسە چاکەکان بەشکۆدار و دیار ناوبەرێت، جا لە هەر کام لە ئاینەکاندا بن، وەك دەفەرموێت: [لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ( ١١٣ )يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ( ١١٤ )وَمَا يَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ( ١١٥ )] (آل عمران: ١١٣-١١٥)، [لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ( ١١٣ )يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ

وَأُولَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ( ١١٤ )وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ( ١١٥ )] (الحديد:٢٧)، [لَيْسُوا۟ سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ( ١١٣ )يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ(١١٤)وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ(١١٥)] (العنكبوت: ٤٦) خۆ ئەگەر کارەکە ڕاوەدوونان و تانەو تەشەر لێدان بوایە، ئەوا قورئان یەکەمین دەبوو لەو ڕووەوە، چونکە بە زمانی عەرەبی دابەزیوە و لەگەڵ عەرەبە نەخوێندەوارە بتپەرستەکاندا دەدوێ، دەیتوانی زۆر بە باشی ئینکاری و نکۆڵی لە مەسیحییەت و ئەوانەشیان بکات کە باسی ئەو پەرچووە گرنگانەیان دەکرد، کە ئاسان نییە بۆ کەسێك باوەڕیان پێ بکات کە بە چاوی خۆی هیچ کام لەوانەی نەدیوە، تا ببێتە هۆکار بۆ بە ڕاستزانین و باوەڕ پێهێنانیان، بەڵکو زۆربەی ئەوانەی هاوسەردەمی ئەو پەرچووانەی مەسیحییەت بوون و بە چاوی خۆیان بینیویانن حێل و وەچەی (ئیسرائیل) بوون و ئەوەش کۆتایی هاتبوو کە بەهۆی چەندین هۆکارەوە باوەڕیان پێ نەهێنا و باوەڕیان بە (مەسیح)یش نەکرد وەك پێغەمبەرێکی خوداو بگرە کەوتنە بە خوریکردنەوەی ڕیسەکە و پیلانگێڕان و تۆمەتبارکردنی پێغەمبەری مەسیحییەت (عیسی دروودی خوای لەسەر)و شوێنکەوتووەکانیشی.

لەبەرئەوە بەڕاستی زۆر سەیرە کە قورئان بەو جوانییە باسی پاکی ئاینەکەی مەسیح و پەرچووە گەورەکانی دەکات، وەك ڕاستییەك، پاشان زۆر بە توندیش ئینکاری لەوە دەکات کە عیسا پێغەمبەر (دروودی خوای

لەسەر) لە خاچ درابێت، هەروەها ئینکاری لەو شتانەش دەکات کە بەهۆی ئەم عەقیدە هەڵەیەوە لەناو گەورەکاندا شتی تری لێکەوتەووەتەوە، بۆ نموونە ئەو عەقیدەیەی کە گوایە حەزرەتی مەسیح کراوەتە قۆچی قوربانی بۆ ئەوەی خودا ببورێ لە هەموو هەڵەکانی مرۆڤایەتی، لەبەرانبەر ئەو هەڵەو گوناهە گەورەیەی کە (ئادەم)ی بابی یەکەم کردی و ئەوان دەڵێن کە ئیتر لەو ڕۆژەوە هەموو بەرەی مرۆڤایەتی هەڵگری ئەو تاوانەیە کە بابە ئادەم کردی، لە کاتێکدا لە تەرازووی خوادا گوناهی هیچ کەسێك نادرێ بەسەر شانی کەسێکی تردا.

هەر کەسێك لە عەرەبەکان ئەگەر ویستبێتی کە مەسیحییەت لەناوبەرێت و دوژمنایەتی لەگەڵ بکات، ئەوا ئەو یەکەم کەس دەبوو کە دەیتوانی ئەوە بکات و بکەوێتە تانەو تەشەر لێدان لە و لاڤی سەراسا(خوارق) و پەرچووانە، بەتایبەتیش لەو وەچە ئیسرائیلییانەی کە باوەڕیان بەو پەرچووانە هەبوو، واتا ئەوانەی لە هۆز و گەلی حەزرەتی (مەسیح) بوون، لەبەرئەوە ئیسلام — کە دەشیتوانی— یەکەم دەستپێشخەر نەبوو بۆ هێرشکردنە سەر پەرچووەکان، یان خودی حەزرەتی مەسیح و پەیامەکەی، ژیری و لۆژیك دەڵێت هەرکەسێك بیەوێ کارێکی تێکدەرانە و سووکایەتیپێکردن بکات و شتێك بشێوێنێ بەهۆی ئەو ستەم و ئیرەیی و دوژمنایەتیکردنەی لەناخیدایە، هیچ حیکمەتێك نابینێ لەوەدا کە تەشەر و توانج لە بانگەوازێك بدات کە بانگەوازی خێر و چاکەیە و ئامانجی لێخۆشبوون و لێبوردنە، پاشان هەر هەمان کات خۆی دەدات بە دەستەوە و باوەڕ دەکات بەشتێك کە بەلای

عەقڵی مرۆڤەوە ئەستەمە لەدۆخی ئاساییدا کە باوەڕی پێ بکات و وەریبگرێت.

پێغەمبەری ئیسلام محمد (دروودی خوای لەسەر) و ئەو ژیاننامەیەی کە بە ئێمە گەیشتووە، وە ئەو ئایەتە قورئانییانەی کە دابەزیوە و دەیخوێنینەوە سەبارەت بە پەرچووی گەورەی ئەو قورئانە، گەمژەییە ئەگەر پێمان وابێت کەوتووەتە هەڵەی کوشندەوە لە شتێکدا کە شیاوی ژیری و لۆژیك نییە، بە تایبەتیش لەو بونیاتنانە گەورەیەی کە دەیکات بۆ بەها ڕاستەقینەکان و سۆز و میهرەبانی و دادپەروەری، ئەمەش لە ڕێی دانپیانانی بە پەرچوو سەراساکان، بەڵام پێشمان وابێ هەر ئەم قورئانە لە خۆیەوە و بەبێ بەڵگەو سەلماندن ئینکاری لە عەقیدەی خاچ دەکات!!

خودا لەو بارەیەوە دەفەرموێ: [هُوَ ٱلَّذِیٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِینِ ٱلۡحَقِّ لِیُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّینِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ] (التوبة: ٣٣)، [قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن یَهۡدِیٓ إِلَى ٱلۡحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ یَهۡدِی لِلۡحَقِّۗ أَفَمَن یَهۡدِیٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ أَحَقُّ أَن یُتَّبَعَ أَمَّن لَّا یَهِدِّیٓ إِلَّآ أَن یُهۡدَىٰۖ فَمَا لَكُمۡ كَیۡفَ تَحۡكُمُونَ] (یونس: ٣٥)، [إِنَّ ٱللَّهَ یَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَیۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُوا۟ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا یَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِیعَۢا بَصِیرًا] (النساء: ٥٨)، [ٱللَّهُ ٱلَّذِیٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِیزَانَۗ وَمَا یُدۡرِیكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِیبٌ] (الشورى: ١٧)، [وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِینَ یُؤۡمِنُونَ بِـَٔایَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَیۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِیمٌ ] (الأنعام: ٥٤)، [وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِینَ] (الأنبیاء: ١٠٧).

بێگومان دەبێ دەلالەتی ئەو شتەی کە قورئان ڕەخنەی لێگرتووە گەورەتر بێ لەمەش، وە بێگومان دەبێ ئەو دۆزەی کە ئیسلام دەیخاتەڕوو، لەو شێوەیە نەبێ، کەبەرەو کێشمەکێشمی گفتوگۆمان ببات، بە جۆرێکی وا کە ئاکامەکەی بریتیبێ لە دژایەتی و ڕاوەدوونان لەنێوان باوەڕدارانی هەردوو ئاینەکەدا و سەرەنجام لەمەیشەوە ناکۆکی و دوژمنایەتی و خانەگومانی لێ بکەوێتەوە.

دۆزەکە —وەك دیارە— لە خستنەڕووی ڕووکەشیانەدایە، وەك گاورەکانیش بە توندی گرتوویانە، ئەوەیە کە دژی ئیسلام ڕاوەستاونەوە، چونکە ئیسلام ئەوەی ڕەت کردووەتەوە کە پێچەوانەی عەقیدەی خاچی ئەوانە، کە ئەوان لەو باوەڕەدان ئەوە قوربانی بەخۆدانی عیسای کوڕی خودایە، تاکو ببێتە قوربانیە گەورەکە و هۆکارێك بێ بۆ ئەوەی کە خودا ببورێ لە یەکەمین هەڵەی مرۆڤ کە (ئادەم) کردی و هەموو مرۆڤەکانیشی گرتەوە و بووە هۆی تووڕەبوونی خودا لە هەموو مرۆڤەکان. ئیسلام بەم کارەی کە بەرپەرچی ئەو عەقیدەی خاچەی داوەتەوە —بەلای مەسیحیەکانەوە— بەرپەرچی ناوەڕۆکی عەقیدەکەی ئەوانی داوەتەوە وە ئەمەش بووەتە چەمکێك لە عەقیدەی کەنیسەو شوێنکەوتوانی، بەوەی کە گوایە ئیسلام لەگەڵ ڕۆحی خۆشەویستی و قوربانیدان و لێبوردندا نیە.

بەبێ گوێدانە هیچ ڕایەکی تر، هەرکەسێك لە هەر ئاستێکی تێگەیشتنی ئەم قورئانە پیرۆزەدا بێ، باوەڕ بەوە ناکات کە قورئان گیانی قوربانیدان و لێبوردن و خۆشەویستی ڕەت بکاتەوە، یان ئینکاری لێ بکات و بیڕوخێنێ.

کەواتە بۆ هەستکردنی قووڵ بەم دۆزە، پێویستە بە تێڕوانینێکی گشتی و ورد و گشتگیرانە تەماشای قورئان بکەین، تا بزانین قورئان چۆن دەڕوانێتە ئایینی مەسیحی و خودی (عیسا مەسیح دروودی خوای لەسەر) و عەقیدەی خاچ، وە ئیسلام چی تێدا دەبینێ و وە چۆن وتاری خۆی ئاڕاستە دەکات، لەسەر بنەماکانی چۆنیەتی خستنەڕووی بابەتەکەو ڕەوتی ئایەتەکان و تەواوکارێتی دەقەکانی و هەرگیز بەو دڵ و گومانەوە بۆی نەڕوانین کە پێشتر وێنایەکی خراپی لای خۆمانەوە بۆ دروست بکەین و پێمان وابێ کە ئەدەبی چوونە ناو ئەم باسانەوە لە گیانی ڕق لێبوونەوە لە ئەدەبیاتی گاور و جولەکەوە سەریهەڵداوە و دەبێ بکەوینە تەشەر و توانج لێی، نەخێر، وا نابێت.

ئەوە ڕوونە کە ئیسلام دان بە ئاینی گاورێتیدا دەنێ، وە ئاینەکەی و پێغەمبەرەکەیشی بەرز ناودەبات، خۆی و دایکیشی و شوێنکەوتوانیشی زۆر ڕێز لێ دەگرێ، بەوەی کە عیسی (دروودی خوای لەسەر) یەکێکە لە پێغەمبەرە ڕەوانەکراوەکانی خودا و پەیامی بۆ ڕەوانە کراوە، پشتڕاستی دەکاتەوە و بەشکۆوە ناوی دەبات، بەتایبەتیش لە ڕووی ئەوەوە کە ناردراوە بۆ بەرپاکردنی سۆز و میهر و خۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکاندا.

ئەی کەواتە کامەیە کە جێی گفتوگۆیە و بە هەڵە تێگەیشتن و گومانی تێدا بەدی دەکرێ؟ گرنگ ئەوە بزانین کە ئینکاریکردنی ئیسلام لە عەقیدەی خاچ لەوەدایە، کە عیسی (دروودی خوای لەسەر) بە لەخاچدان نەمردووە، ئیتر ئینکاری لەوە ناکات ئاخۆ کرداری لەخاچدانی کراوە، بۆ ئازاردانی یان بە مەبەستی کوشتنی، ئەمەیان بە پێویست نازانێ بۆ باسکردن، بەڵام ئەوەی ئیسلام دانی پێدادەنێ و ڕاستی کردووەتەوە لەو عەقیدەیەدا ئەوەیە کە عیسی

(دروودی خوای لەسەر) بە لەخاچدان نەکوژراوە، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئیتر نەخراوەتە سەر خاچ، بەڵکو بەوە نەکوژراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو قوربانیيەی وا باسی دەکەن ڕووینەداوە، هاوکات ڕووداوە گرنگەکە لێرەدا ئەوە نیە کە لەخاچ دراوە یان نا، بەڵکو ئەوەیە وا باوەڕ بکرێ کە کوشتنی کەسێکی وەکو مەسیح و کردنی بە قوربانی، ئەوەیانە بووەتە هۆی ئەوەی کە توڕەیی خودا لە ئادەم هێور دەکاتەوە، وە لە مرۆڤایەتی بە گشتی بەرانبەر بەو هەڵە گەورەیەی کە لەجیاتی هەموو مرۆڤایەتی کردی، وە مەترسييەکە لەوەدایە کە لەو باوەڕەدا بێن کوشتنی مەسیح بووەتە هۆی لێخۆش بوونی خودا لە مرۆڤەکان بە گشتی، ئەمەیە ئەوەی کە ڕووی نەداوەو شتی وا نەبووە، هاوکات عەقیدەی خاچ، عەقیدەیەکی خەیاڵی و ئەفسانەییەو بەندە لەسەر تێکەڵەیەك لە دوودڵی و گومان.

باوەڕهێنان بەوەی کە دووەمین تاوان و ناشیرینترین و گەورەترین کاوان کە کوشتنی مەسیح پێغەمبەرە(دروودی خوای لەسەر) بە ئەنقەست لەلایەن مرۆڤەوە کە (کەنیسە) لەو باوەڕەدایە کە بەڕاستی لە خاچ دراوە و ئەم لە خاچدانەیشی بووەتە هۆکاری لێخۆشبوونی خودا لە یەکەمین تاوانی یەکەمین مرۆڤ و سەرجەم مرۆڤەکان. بەمەش نییەتی کوشتنی(خودای کوڕی خودا) (مەسیح پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە تاوان نازانن (یان خۆیان لەگێلی دەدەن!) ئەم کارەشیان ستەم و دەسدرێژییە بۆ سەر ڕاستی و نیکووڵێکردنە لە بانگەوازی حەق. هەر زۆر جێگەی سەرسامیشە کە ئەم کارە بە مایەی ڕەزامەندی خودا و لێخۆشبوون دادەنێن..!

## بۆچی قورئان بەرهەڵستی بیروباوەڕی خاچ دەکات؟

هۆکاری بەرپەرچدانەوەی ئیسلام بۆ ئەم دۆزە و ئەو ئەنجامانەی لەوەوە کەوتوونەتەوە، بە ئاسانی تێدەگەین، ئەگەر پەی بەوە بەرین، کە چەقی دادپەروەری لە کوێدایە، لەناو چوارچێوەی پەیامە ئاسمانیەکاندا، بە تایبەتیش لە تەرازووی ئیسلامدا، وە لە تەرازووی داڕشتەی قورئانی دا، ئەم تەرازووە بە ئاسانی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە پەی بەرین بەو بیرۆکە وردە، کە بیرۆکەی بەخشیشدانە بەرانبەر بە تاوانێکی دزێوی گەورە، کە ئەمەش ناوەڕۆکی عەقیدەی خاچە، ئەمەش پێچەوانەی سروشتی شایەتیدانی قورئانە، لە تەرازووە قورئانیەکەدا، چونکە پێچەوانەی سادەترین یاساکانی دادپەروەری خوداییە، وە دژی ئامانجەکانی پەیامە ئاسمانیەکانە، وە نایەتەوە لەگەڵ شێوازی تەرازووی ئاینە ئاسمانیەکاندا بۆ ڕێنماییکردنی مرۆڤ و هێنانیان بۆ سەر ڕێگای ڕاست.

لێخۆشبوون و لێبوردن لە تەرازووی دادپەروەریدا بەرانبەر بە بەخشیش نییە، بۆ کەسێك کە تاوانبارە، واتا تاوانبارەکە شتێ ببەخشێ و لە بەرانبەردا خوداش لە تاوانەکەی ببورێ، بەڵکو هەر لە بنەڕەتدا بۆچی خودا تووڕە بوو لە بەرانبەر یەکەمین تاوان کە یەکەمین مرۆڤ کردی و دواتر ئەو توڕەبوونەش هەموو بەرەو نەوەی ئەو کەسەی بە گشتی گرتەوە.

لێبوردن لە تاوان، یان دادپەروەری لە لێبوردن و لێخۆشبوون نابێتە چەمکێکی مرۆیی بە یەکێك لەم چوار ڕێگایە نەبێت: یەکەم لێخۆش بوون بەهۆی سزادانەوە، دووەم کەسە یاخییە تاوانبارەکە دەستبەرداری تاوانەکەی ببێ و تەوبە بکات و لە خودا نزیك بێتەوە و ئیتر گوێڕایەڵی

فەرمانەکانی بکات، سێهەم: داوای لێخۆشبوون بکات، چوارەم لێخۆشبوونەکە وەك دیاری و بەخششێکی گەورە بدرێ بە کەسە تاوانبارەکە، ئەمەش بەوە دەبێ کە خاوەن مافەکە لە هەمانکاتدا کە لە پێگەی هێزدایە خۆی دەستپێشخەری بکات و لە تاوانبارەکە ببورێ، بەبێ ئەوەی کە تاوانبار خۆی داوای کردبێ یان چاوەڕوانی کردبێ یان بە تەما بێ چاکەی بداتەوە و بەرژەوەندییەکی پێشکەش بکات. بەڵام ئەگەر بەخشینەکە ببێتە هۆی ئەوەی کەسەکە زیاتر بەردەوام بێ لە سەر تاوانکردن، ئەمەش سروشتی دادپەروەری نییە و هۆکارێکی شیاویش نییە لە هۆکارەکانی پەند و تەمێ کردن و بنبڕکردنی خراپەکاری بە مەبەستی ڕێنماییکردنی مرۆڤایەتی.

وە کاتێك قورئانی پیرۆز جەخت لەوە دەکاتەوە کە حەزرەتی مەسیح نەمردووە و بە خاچ نەکوژراوە، بەڵکو لای خەڵکی ئەو گومانە دروست بووە و بە ڕووکەش وا هاتووەتە بەرچاویان، کەچی لە ڕاستیدا وا نیە، ئیتر دوای ئەمە هیچ دەرفەتێك نامێنێ بۆ قسەی بێناوەڕۆك و نەشیاوی ئەوتۆ کە پێچەوانەی گیانی بەرپرسیارێتی و دادپەروەری بێت.

ئەگەر وابێ، ئیتر پێویست ناکات باسی لێبوردن و دادپەروەری بکرێ، خودا لە قورئاندا چیرۆکەکە باس دەکات و بەرپەرچی بەرەو نەوەی ئیسرائیل دەداتەوە کە لەخاچ نەدراوە، دەفەرموێ: [إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ

وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِي وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِي وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ] (المائدة: ١١٠)، [وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا( ١٥٧ )بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا(١٥٨)] (النساء: ١٥٧-١٥٨).

لەو باسانەی پێشووەوە، بۆمان دەرکەوت کە هەبوونی جیاوازی و ململانێ و ناکۆکی لەنێوان گاورێتی (کەنیسە)و ئیسلامی (قورئانی) سەبارەت بە عەقیدەی خاچ، پەیوەندی نیە بە ناوەڕۆکی واتای خێرو لێبوردن و ئاشتییەوە، بگرە هەر جیاوازیەکیش نیە لەوەدا کە هەردوو ئاینەکە بۆ خێرو خۆشی مرۆڤەکانن، بەڵکو جیاوازییەکە تەنها لە دیاری کردنی ڕووداوە مادیەکان و دەلالەتەکانیاندایە، وە لە شێوازی وتار و ئاڕاستەکردنی وتارەکەیاندایە سەبارەت بەو ڕووداوانە و چۆنیەتی پەندلێوەرگرتنیان.

لە ناوەڕۆکدا هیچ ناکۆکیەك نییە لەوەدا کە ئیسلام دان بە گاورێتی دا دەنێت وەکو ئاینێکی ئاسمانی و ڕێزو شکۆی پێویستیشی لێ دەگرێ، وە بە ئاینێکی پڕ لە خۆشەویستی و ئاشتی و لێبوردن ناوی دەبات، وەکو خودای گەورە لە باسی پاکی و گەورەیی ئەم ئاینەو پێشەواکانیدا دەفەرموێ: [قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا] (مريم: ٢١)، [وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ] (الأنعام: ٥٤)، [وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ]

(الأنبياء: ١٠٧)، **[ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ]** (الحديد: ٢٧)، **[لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ]** (البلد:١٧)، **[وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا]** (النساء:١٥٧)[١] .

---

[١] به پێویستی دەزانم ڕوونکردنەوەیەك بخەمە ڕوو دەربارەی چەمکی تێگەیشتنم لە تەفسیری ئەم ئایەتە، کە تێگەیشتنی خۆمە بۆی ــ جیاوازتر لە ڕای هەموو ڕاڤەکارانی قورئان ــ، ئەویش پەیوەندی بە (دەربڕینی ئایەت)ەکەوە هەیەو هەر شتێ کە پەیوەندی بە دۆزەکەوە هەیە، کە مەبەست لە ڕووداوی کوشتنی حەزرەتی عیسایە دروودی خوای لەسەر لەگەڵ باسی خاچ و هەر شتێ لەو بارەیەوە لە قورئاندا هاتبێ لەگەڵ پابەندبوونم بە یاساکانی ڕێزمانی عەرەبییەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە هەموو بێژەیەك (**لفظ**) واتایەکی ڕاستەوخۆی هەیە، سا مەگەر بۆ مەبەستێکی واتایی خوازرا بێ، یەکێك لە یاساکانی زمانی عەرەبی کە پەیوەندی بەم ئایەتەوە هەیە بریتییە لە ڕاناو (جێناو) **الضمیر**، کە هەمیشە ڕاناو دەگەڕێتەوە بۆ نزیکترین بێژەی هاوپەیوەند، ئەگەر دەقەکە بۆ مەبەستێکی تر نەخوازرا بێ، لێرەدا ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە دوژمنانی مەسیح نەیانکوشتووە و لەخاچیشیان نەداوە [وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا(١٥٧)] (**النساء: ١٥٧**)، پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە ئایەتەکە سەرەتا نەفی کوشتنی دەکات و ڕاستەوخۆ دوای ئەوەش باسی لەخاچدانی دەکات، ڕوونە کە دوژمنانی دەیانویست بیکوژن بەهۆی لەچاخدانیەوە، کە ڕێگەیەکی تیرۆر و ئەشکەنجەدانی بێبەزەییانەیە، ڕاستەوخۆ ئایەتی دواتر جەخت لەوە دەکاتەوە کە بە ڕاستی نەیانکوشتووە [وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ]، ئەگەر سەرنج بدەین ئایەتەکان باسی نەفی کوشتنەکەی دەکەن، بەڵام نەفی خاچی

نەکردووە و بۆ دڵنیایی لەوەی کە نەیانکوشتووە بێژەی ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا﴾ هاتووە، واتا بە کردار نەیانکردووە، بەڵکو وا گومان دەبەن، وە دوژمنەکانی لە کوشتن و نەکوشتنی دڵنیانەبوون وەکو ئایەتەکە دەفەرموێ: [يَقِينَۢا] (**النساء**: ١٥٧)، وە تا ئێستاش ئەو گومانە وەکو خۆی ماوە، کەواتە کوشتنەکەی زیاتر لە هەڵبەستن و خورافیات دەچێ، پرسیارەکەمان ئەوەیە ئایا مانای ئەم ئایەتە و سیاقەکەی چییە [وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ] (**النساء**: ١٥٧) لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد لە ڕێزمانی عەرەبیدا، کە بەپێی جێناوەکە هیچ بوارێك بۆ گومان نەماوە بەپێی ناوەڕۆکی ئایەتەکە دەردەکەوێ کە ئەو کەسانەی کە وایانزانی حەزرەتی مەسیح لەخاچ دراوە، ئەوانە بوون کە دەیانویست حەزرەتی مەسیح بکوژن و دوژمنی بوون، وە هەر ئەوانیش بوون کە هەڵیانواسی بە خاچەوە بە نیازی کوشتنی، ئەمە مانای وایە بە خاچ نەکوژراوە، بۆیە بە گومانن، ئەمە لە ڕووداوێکی ئاڵۆزدا، لەو سەردەمە دوور لە شارستانییەتەدا کە تەنانەت لەم سەردەمەشدا ڕووداوی ئاوا ئاڵۆز ڕوودەدات و کەس نازانێ بکوژ و کوژراو کێن و چۆن بووە.

لە هیچ شوێنێکی دنیاو لە هیچ ئایەت و فەرموودەیەکدا باسی ئەوە نەکراوە ئاخۆ بکوژەکە کێیەو ناوی چیە؟ ئایا (یەهوزا)یە یان کێ، هەروەکو لە حیکایەتە ئیسرائیلییەکاندا ناوی ئەم و ئەو هاتووە کە بکوژی هاوشێوەکەی مەسیح بووە.

بەداخەوە کە هەندێ لە گەورە ڕاڤەکارانی قورئانیش کەوتوونەتە هەڵەوە، لە ئێستاو ڕابوردوودا، وەکو قورتوبی و ئیبنول کەسیر و نوسەری تەفسیری (المنار)و هەندێکی تر لەوەدا کە ورد نەبوون لە گەڕانەوەیان بۆ تێگەیشتن لە چیرۆکە قورئانیەکان کە باسی پێغەمبەرانی گەلە دێرینەکان دەکەن و کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی یەهودی و مەسیحی، لەگەڵ ئەوەشدا کە قورئان و پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر جەخت لەوە دەکەنەوە کە مرۆڤی موسوڵمان بەسە پشت بەو دوو سەرچاوەیە ببەستن بۆ دڵنیابوون لە ڕەوتی ئەو چیرۆکانە و پەند لێوەرگرتنیان و لادانیان لەوەی پەنابەرن بۆ گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانە لە سەرچاوە ئیسرائیلییەکانەوە، بە تایبەتیش ئەوانەی کە سووکایەتی تێدایە بەرانبەران بە پێغەمبەران و حەزرەتی مەسیح و داوێن پاکی مەریەم، خۆ لە قورئان دا هیچ زێدەڕەوی و ناڕوونییەکی تێدا نیە، هەروەکو خودا دەفەرموێ: [مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ] (**الأنعام**:٣٨) وة [أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ] (هود:١) وە [وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ

وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ] (النحل: ٨٩) و [لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ] (فصلت: ٤٢)، لەسەروو هەمو ئەمانەیشەوە خودای گەورە باسی چۆنیەتی دەقەکانی قورئان دەکات و دەفەرموێت: [هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِۦ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُولُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ] (آل عمران:٧)، لەم ئایەتەدا وشەی (متشابە) ئەگەر واتای (ناڕونی) ببەخشێ، ئەوا بە هۆشیاری و ناهۆشیاری دەتوانین بڵێین کە قورئان بۆ خۆی بەشێکی تری خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە و پێچەوانەی یەکترییە، لە کاتێکدا دڵنیاین لەوەی کە ئەم قورئانە (**اُحكمت آياته**)، پاشان دەفەرموێ کە هەندێ ئایەت کاری پێ ناکرێ، کە ئەمەش دەلالەتەکەیان دیار نیە (مُتشابهات)، هەرگیز موسوڵمان یان مرۆڤی ژیر شتی وا ناڵێ کە **هاوکات** وەڵامە ڕاستەکەشی بزانێ، واتا مرۆڤی ژیر دوای زانینی ڕاستی شتێك ئیتر خۆی ناخاتە گومانەوە، ئەی کەواتە واتا ڕاستەقینەکەی ئایەتەکە چیە؟

پێم وایە هەندێ ئایەت (محكّمات)ن و ئەوانەن کە پەیوەستن بە دیاری کردنی (بەهاکان) و (بنەماکان)و (مەبەستەکان)و ئەو تەشریعاتەی کە شەریعەتی پایان هێناویەتی بۆ مرۆڤایەتی وەکو حەرامکردنی تاوانە گەورەکان و فێڵ و درۆکردن، ئەمانەش شتێکی پەسەند نین و هەر شتێ دژیان بێ لای مرۆڤ پەسەندە و ملی بۆ دەدات، بەڵام ئایەتە (متشابهات)ەکان ئەوانەن کە باسی چیرۆکی گەلانی پێشوو شارستانیەتەکانن لەگەڵ پەندەکانیان بەم جۆرە ئایەتانە موتەشابیهن لەلای ئوممەت و نەتەوەکانی تر و گاور و جوولەکەکان، بەتایبەتیش کە دواتر ناسران بە دەست هەڵبەستە ئیسرائیلیەکان (**الإسرائليات**).

(**التشابه**) لێرەدا (ناوەڕۆك)ی چیرۆکە قورئانییەکانە کە (محكم)ن لەلای نەتەوەکانی تر، بەپێی گێڕانەوەی باوی لای خۆیان و درۆ و ئەفسانە شێواندوونی و ڕوونی و ڕاستییان دیار نییە و قورئانیش (نەرێ)ی ئەوەی کردووە کە بگەڕێتەوە بۆ باسکردنیان.

لەبەرئەوە ئایەتە قورئانیەکە خۆی لەوە پاراستووە کە لە دەقی سروشتی ئایەتە قورئانییەکان لابدات بە تایبەتی بۆ شتێك کە مەبەست لە گێڕانەوەکەی تەنها پەندوەرگرتن بێت، قورئان ناچار

کەسیش لاری لەوە نییە کە گاورێتی ئاینێکی ڕاستەقینەی خودایە و پەیامی خودا بووە لە سەردەمی خۆیدا بۆ کەسە دڵڕەقەکانی نەوەی ئیسرائیل —ئەمەش قورئان دانی پێدادەنێ— وە بە ئاینێکی ئاسمانی

---

نییە پەنا بۆ شتی گوماناوی و هەڵبەستراو دەستکاری کراو بەرێت و دواتر بشبێتە دەروازەیەك بۆ شەڕخواز و ئاژاوەچییەکان، ئەوانە چیرۆکی مێژوییەکی ڕابوردوون و مەعریفەو زانیاری ڕاست و دروست لەباریانەوە سەنتەری سەرەکی نیە، ئاخۆ چۆن ژیاون و پاشاکانیان کێ بوون و چۆن و بۆچی دەستکاری کولتووریان کراوە، کە ئەمە لە ئاینە دەستکاری کراوەکانی گاورو جوولەکەدا زۆر بەرچاو دەکەوێ و بووەتە سەنتەری جیاوازی و ناتەبایی و دورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئایینەکانیان —لەم سەردەمەدا— و تێڕوانین و بیردۆزە مادی و لیبڕاڵیەکان شوێنی ئەو ئاینانەیان گرتووەتەوە و دواجار بووەتە هۆی بەرپابوونی نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان و بڵاوبوونەوەی ناکۆکی و دوژمنایەتی لە جیهاندا.

بەداخەوە هەندێ لە ڕاڤەکارانی قورئان پەنایان بۆ ئەو کتێب و سەرچاوە و ئەدەبییاتە ئەفسانەییە ئیسرائیلیاتانە بردووە کە بەپێی دەقی قورئان ئەوانە کۆتاییان پێ هاتووە و وەلا نراون و پڕن لە ناڕاستی، کەچی هاتوونەتە ناو عەقیدەی هەندێ لە موسوڵمانانیشەوە و هزر و بیریانی لێڵ کردووە شارستانییەتی ئوممەتی ئیسلامییان و بەرەو تیاچوون و دواکەوتوویی بردووە. لەبەر ئەم هەموو هۆکارانەی باسمان کردن، پێویستە پابەند بین بە پڕۆگرامە هزرییە ئیسلامییە ڕاستەقینەکەوە کە سەرچاوەی گرتووە لە پابەند بوون بە دەقی ئایەتە قورئانییەکانەوە و دوورکەوتنەوە لەو شتانەی کە قورئان باسی نەکردووە و ئاماژەی پێ نەداوە.

پێم وایە ئەمە ڕێ ڕاستەکەیە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی عەقیدەی خاچ و واتاکانی و هاوکات یاسایەکی گرنگی دادپەروەری و هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی مرۆیی، چونکە ئەوسا کەس بێتاوان سزا نادرێ و کەسیش کە تاوانبارە پاداشت و بەرتیل وەرناگرێ، هیوادارم لە مەبەستی گۆشە نیگای من لەم ئایەتە تێگەیشتبن و ئەمەش نەك هەر سەبارەت بە عەقیدەی خاچ، بەڵکو سەبارەت بە چەمکی ڕاستەقینەی تێگەیشتنی هاوچەرخانەی قورئان بە جۆرێك کە شیاوی واقیعە و دەبێتە مایەی بووژانەوەی ئەم ئوممەتە و خزمەتی مرۆڤایەتی.

دادەنێ، لەبەرئەوە نابێ مەبەست لێی ئینکاری دادپەروەری و بەرپرسیارێتی و برەودان بێ بە تاوان، یان پێدانی دەستخۆشانە بێ بە بکەرانی تاوان، یان پەت خستنە ملی مرۆڤ بێ، تا بەرەو تاوانکردن و یاخی بوون ڕایکێشێ و لە خودا دووری بخاتەوە و هانی زێدەڕەوی بدات لە ئازاردانی خەڵکی و دژایەتی کردنی هەق و ڕاستی و کوشتنی پێغەمبەران و کەسە پاکەکان.

جیاوازی نێوان موسوڵمانان و گاوران، بە شێوە باوەکەی، ڕەنگدانەوەی دەربڕینە قورئانییەکان نیە، نە لە ڕووی دەقەکان و نە لە ڕووی واتاکانیانەوە، وە لەسەر ئەو دۆزە بنەڕەتیانەش نیە کە ئامانجی قورئانن، سەبارەت بە ڕاستکردنەوەی ڕوداوی خاچ و ئەو شتانەی لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، دەربارەی بەرپەرچدانەوەی عەقیدەی خاچ، کە لەناو ئەم عەقیدەیەدا دەلالەتی نادیار و نەخوازراو و بزر هەیە، لە ناخی شوێنکەوتوانی کەنیسەدا و وای لێکردوون نابینا و سەرکوێرانە بڕواننە ڕاستییەکان.

هەردوولا (موسوڵمانان و گاورەکان) هاودەنگن لە یەکانگیری ئامانج و واتاکان، خۆ ئەگەر جیاوازیەکیش هەبێ، ئەوا پەیوەندی بە هەڵەکردن لە شێوازی وتارەکانیاندا هەیە، لەبەرئەوە گرنگە کە ئەم گفتوگۆ دووقۆڵیە بە جۆرێ بێ کە هەریەکەیان لەلایەن خۆیانەوە بە باشی تێبگەن لە مەبەست و ئامانجەکان و شێوازی خستنەڕووی بابەتەکان لەلایەن هەریەکەیانەوە و ئەو پرۆگرامەی دەیخەنەکار و ڕاستکردنەوەی ڕەوتی پەیوەندییەکانیان و ئەو هاوسۆزییەی لە ئەنجامی نیازپاکی هەردوولایانەوە بەرپا دەبێ و ئەو مەبەستانەی لە بنەمای باوەڕی هاوبەشیاندا هەیە، ئەمەش بە مەبەستی

بەرژەوەندی گفتوگۆکەو ڕاستکردنەوەی ئەو شتانەی کە دەبێ ڕاست بکرێنەوە، هەر لە پڕۆگرامەوە تادەگات بە شێواز و چۆنیەتی دەربڕین، ئامانج لەم کارە ئاڕاستەکردن بێت بۆ گەیشتنی هەردوولا بە بەهرە بەخشی ئەم پڕۆگرامە و هەوڵدانی هەردوولا بۆ گەیشتن بە هەق و ڕاستی و دەروازەکانی فەڕ و چاکەخوازی، بە ڕاستی ئەوە کارێکی ژیرانە و دادپەروەرانە و حیکمەت و ڕاستخوازانە نیە کە لە ڕاستییەکان لابدەین و سووربین لەسەر هەڵەکان.

سا بەڵکو ئەو ڕوونکردنەوەی کە باسمان کرد سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ئامانجی ئەو ڕەخنانەی قورئان گرتوویەتی لە مەبەستە قورئانیەکان و لێتێگەیشتنیان سەبارەت بە چەمکی عەقیدەی خاچ، ببێتە هۆکارێك بۆ لابردنی کۆسپەکانی تێنەگەیشتن و دەروازەیەك بکاتەوە بە ڕووی ئەنجامدانی وتوێژێکی بنیاتنەرانەدا و تێگەیشتنی هەریەکە لەلایەنەکان لە شێوازی وتاری لایەنەکەی تر و نیازە پاکە پڕ لە خێروبێرە شاراوەکەی ناخیان و هاوکات دەرفەت و بوارێکی لەباربێ بۆ خستنەڕوویەکی کامڵتری وە نەرمتری عەقیدەکان و پڕۆگرامەکان و شێوازەکانی خستنەڕووی هەردوو عەقیدەکە لەنێوان ئیسلام و گاورێتیدا.

ئەوەتا عەقیدەی خاچ، کە عەقیدەیەکی گاورانەیە، بەخۆی و ئەو بیروباوەڕانەی لەسەر ئەوە بنیات نراون، لە لۆژیکی ئیسلامدا کێشەیەکی گەورەی دروست کردووە، بەتایبەتیش لە بە (**هاوبەشدانان بۆ خودا**) کۆتایی هاتووە و بە کورتی بە سێکوچکە (**تثلیث**) بە پایان هاتووە، لەجیاتی ئەوەی کە عەقیدەیەکی تەواوی خودایی بێ و جەخت لە تەنهایی خودا

بکاتەوە، ئەوەتا (سێکوچکە) وای کردووە کە حەزرەتی مەسیحی کوڕی مەریەم —کە شێوەی مرۆڤەو سیفەتەکانیشی هەر مرۆڤانەن— وە خودا دەراسایەکی پێداوە، هەروەکو داویەتی بە هاوتا پێغەمبەرەکانی پێشووش، کراوە بە خودا، وە خودایان دابەشکردووە بە سەر شێوەیەکی مرۆڤاسئادا لە خودی عیسا مەسیحدا و شێوەی رەهایی و نامادديدا کە ناوی (باوك)یان پێداوە ( وە پەیوەندی ئەم دووانەش بەهۆی رۆحی پیرۆزەوە پێکەوە بەسراون) کە سێکوچکەیەکی سەیرە لە ئامانج و دەلالەتەکانیدا.

هەر عەقیدەی خاچ، دیسانەوە لە لۆژیکی ئیسلامدا بووەتە هۆکاری کێشەیەکی تریش، —لەپاڵ وێرانکردنی بنەمای دادپەروەریدا— بنەمایەکی تریشی وێران کردووە لە بنەما ماکیەکانی مرۆڤ، ئەویش بنەمای بەرپرسیارێتییە، کە بە یەکێك لە گرنگترین بنەما و یاسا سەرەکییە هاوپەیوەندەکان بە دادپەروەرییەوە لەقەڵەم دەدرێ، لە لۆژیکی ئیسلامدا هەموو کەسێك بەرپرسە لە کاروکرداری خۆی و نرخی مرۆڤێکیش لەناو کردار و ویستی خۆیدایە. نەك لە ڕەنگ و تیرە و هۆز و بنەچەکەیدا، بەڵام عەقیدەی خاچ بۆ ئەوەی پاکانە بۆ تاوانی خاچ بکات، هاتووە بنەمای بەرپرسیارێتی هەڵوەشاندوەتەوە ـ لەسەرو ئەمەشەوە تاوانی باوکانی داوە بەسەر منداڵەکانیاندا ـ بەمەش پەیوەندی ڕاستەقینەی مرۆڤەکانی تێکداوە لەنێوان (تاوان و سزا)دا، هاوکات چەمکی قوربانیدان و بەرخودانیشی هەڵگێڕاوەتەوە. لەو ڕوانگەیەوە کە دەربڕینێکی مەزنە و هەڵقوڵاوی خۆشەویستییەکی هەموارانەی پڕ لە خێرە بۆ گەیشتن بە (خۆشەویست)ەکە، ئەمەی کردووەتە هۆکارێك بۆ پاکانە کردنی کارە خراپ

و تاوان و ئازاردان و تاسەكان و جۆرێك لە ڕەوایی پێداوە لەڕێی لۆژیكێكی نامرۆییانە و ناڕوون.

بەچاو هەڵگواستن و بێ گوێدانە ئەوەی كە چی لە دەقی عەقیدەی خاچدا هەیە بەوجۆرەی لە ئێستادا دەیبینین، لە بنەڕەتی عەقیدە پاكەكەدا ئیسلام لە وتاری خۆیدا بۆ ڕاستكردنەوەی ئەم عەقیدەیە هیچ جیاوازیەكی نیە لەگەڵ مەسیحیەكاندا لە مانا و ناوەڕۆك و بەهای خۆشەویستی و لێبوردندا، چونكە لە بنەڕەتدا جیاوازی ئیسلام لە عەقیدەی خاچەكەیاندایە كە پێچەوانەی نەژادی مرۆڤە و شیاو نیە لەگەڵ سروشت و لۆژیكی مرۆڤی تەواودا، ئەمە لە كاتێكدا كە چاو نەخەینە سەر ئەوەی كە ئاخۆ ئایا ئەو عەقیدە مەسحییەتە بە مەبەست وای لێ كراوە، یان بێ مەبەست، لەبری ئەوەی لەو شتانە پاكژ بكرایەتەوە و نزیك بوایە لەو لۆژیكەی كە لە چەمكی مرۆڤدا وەك ماكی مرۆیی ڕاستەقینە پەسەند و وەرگیراو بووایە.

## جیاوازی لە ناوەڕۆكدا نییە:

ئیسلام لە هێڵە گشتیەكاندا لەگەڵ گاورێتیدا هاوڕایە، وە لەگەڵ سەرجەم ئاینیە ئاسمانییەكانی تریشدا، كە دان بە تاك و تەنهایی خودا دادەنێن، وەكو خودا و پەروەردگار، ئیسلام دان بەو پەرچوو و سەراسایانەشدا دەنێ كە خودا بەخشیویەتی بە پێغەمبەرانی پێشین، وە بە هەڵەكانی مرۆڤ وە بە بەخشین و لێبوردەیی، بگرە هانی مرۆڤەكانیشی داوە بۆ ئەوە، بەڵام ئیسلام پشتڕاستی ئەو عەقیدەی خاچە ناكات بەو چەمك و تێگەیشتنەی كە پێچەوانەی یەكتاپەرستی خودای تاك و تەنهایە، بەڵكو ئیسلام ئایینی

واقیعی ژیانە و وەڵامی ماك (فطرة)ی مرۆڤایەتی دەداتەوە و بەکاری دێنێ بۆ گەیشتن بەو ئامانجە گەورە و مەزنەی کە ئامانجی سەرجەم ئاینیە ئاسمانییەکانە، ئەو ئاینە پاکانەی کە دەستکارییان نەکراوە، کار دەکات بۆ چەسپاندنی یاساکانی دادپەروەری و بەرپرسیارێتی، لەپاڵ بەهاکانی خۆشەویستی و لێبوردەییدا.

بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەم وێنایە، وا باشە ئەو دەقی ئایەتانە بخەینە ڕوو کە باس لە چۆنیەتی چارەسەری ئەم دۆزە دەکەن، بە ڕوانگەیەکی قورئانی، وە پەیوەندیەکان چۆن دەخاتە ڕوو، چۆن ئەم کێشە بچکۆلانەی سادە کردووەتەوە –لەوپەڕی وردیدا– کە شیاوی یەکتاپەرستی و ماکی مرۆییە، ئیسلام دان دەنێ بە یەکتاپەرستی خوادا، هەروەکو بنەڕەتی ڕەسەندی مەسیحیەتیش هەر وایە و تاکپەرستییە، وە دورکەوتووەتەوە لەوەی کە خودا وەکو مرۆڤی پەتی نیشان بدات و دورکەوتووەتەوە لە (مادده)ەو هاوشێوەکردنی خودا بە شتی ماددی و خوداش پاك و بێگەردە و دوورە لەو جۆرە شێوە و وێچوواندنانە.

خودا دەفەرموێ: **[قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ( ١ )ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ( ٢ )لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣)وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌۢ( ٤ )]** (الأخلاص: ١-٤)، **[فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ]** (الشورى: ١١)، هەروەها دەفەرموآ: **[إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ]** (آل عمران: ٦٤)، **[يَأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ**

فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَا تَقُولُوا۟ ثَلَٰثَةٌ ٱنتَهُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ سُبْحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا] (النساء: ١٧١).

ئیسلام توانای داهێنانی خودا دەگەڕێنێتەوە بۆ تاك و تەنهایی خۆی و هەموو شتەکانیش هێزو توانا تەنها لەو خودایەوە وەردەگرن، وە دەراسا و پەرچووەکانیش جۆرێکن لە نیشاندانەکانی ئەو توانایەی خۆی لە بەدیهێنانی ئەم گەردوونەدا، هەموو شتەکان و ڕووداوەکان لە بەرانبەر هێزی خوادا یەکسانن و هیچ کەس و شتێ نییە توانای لە سەرووی توانای خوداوە بێ، هەر ئەویش ئەم سەراساو بەرچووانەی بە پێغەمبەران بەخشیوە، هەر بۆیە کارە سەراسەکانی پێغەمبەرێکی وەکو مەسیحیش هەر لە سنووری توانای خودادایە لەم گەردوونەدا و هەندێکن لە نیشانەکانی توانای خودا و لەڕێی (روح القدس)ەوە بۆی ناردووە، ئەمانە بە فرمانی ئەو خودایە پێی دراون، بەبێ ئەوەی کە ئەو خودایە خۆی ماددەبێ یان سیفەتی ماددەکانی تێدا بێ، سەرجەمیان بەدیهێنراوی دەستی پەروەردگاری تاك و تەنهان و لە بێدەسەڵاتیدا لای خودا یەکسانن.

**خودا دەفەرموێ:** [إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ] (آل عمران: ٥٩)، [إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ] (النساء: ١٧١)، [وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ] (البقرة:٨٧)، [وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ] (آل عمران: ٤٩)، [وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ] (المؤمنون: ٥٠)، [لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟

إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ] (المائدة: ١٧)، [لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ] (المائدة: ٧٣)، [ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ] (غافر: ٦٢)

ئیسلام له ڕوانگەی مەبەستی بەدیهێنانەوە دەڕوانێتە ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوانەی کە بەرپرسیارێتی دەسپێرێت بە مرۆڤ، بە جۆرێك کە هەریەکە لە مرۆڤەکان بۆ خۆی بەکار و کردەوەی خۆیەوە بەرپرسە لە خۆی و چارەنووسی خۆی و تاوانی کەس بەسەر کەسدا نادرێ و کەسیش لە جیاتی کەسێکی تر پاداشت و سزا وەرناگرێ، هەروەکو خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ (الآنعام:١٦٤)، [وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ( ٣٠ )وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ( ٣١)قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ( ٣٢ )قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ( ٣٣ )وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ( ٣٤ )وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ(٣٥) فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ( ٣٦ )فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن

رَّبِّهِ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيۡهِ إِنَّهُ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ( ٣٧ )قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ( ٣٨ )وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ( ٣٩ )] (البقرة: ٣٠-٣٩)، [وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّىٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ( ٣٠ )وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ( ٣١ )قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ( ٣٢ )قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّىٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ( ٣٣ )وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ( ٣٤ )وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ( ٣٥ )فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمۡ فِى ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ( ٣٦ )فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيۡهِ إِنَّهُ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ( ٣٧ )قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ( ٣٨ )وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ( ٣٩ )] (الأعراف: ٢٢-٢٣)، [فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ( ١١٧ )إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ(١١٨) ] (طه:١١٧-١١٨)، [فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ (١٢١)ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ(١٢٢)قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعا بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا

يَشْقَىٰ(١٢٣)وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ( ١٢٤)] (طه:١٢١-١٢٤)، [فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ(٧)وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ( ٨ )] (الزلزلة: ٧-٨)، [كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ] (المدثر: ٣٨)، [وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ] (البقرة: ٤٨)، [وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ] (البقرة: ٢٨١)، [قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ] (الأنعام: ١٦٤)، [مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا] (الأسراء: ١٥).

دادپەروەری و بەرپرسیارێتی دژی واتای بەزەیی و لێخۆشبوون و لێبوردن نییە، هەموویان لە بنەماو بنەچەی ڕەسەنی سروشتی مرۆڤن، وە هۆکاری پاکیزەکردن و پوختەکردنی کانزای پێکهاتەی جەوهەری مرۆڤن، هەڵەو تاوانکردنیش، وە هەر شتێ لەوانەوە پەیدا دەبێ، هەموویان لە هەستکردن بە بەرپرسیارێتییەوە سەرچاوە دەگرن و پاڵنەرن بۆ ئەوەی مرۆڤ یادی خودا بکات و پەشیمان بێتەوە و خۆی بە کەم بزانێ لە ئاستی خوادا و بپاڕێتەوە تاکو لێی ببورێ و لێی خۆش بێت، وە ڕوو بکاتەوە کارو کردەوەی چاك.

خودا دەفەرموێ: [مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا] (الأنعام: ٥٤)، [قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا] (مريم: ٢١)، [ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ

وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ] (الحديد: ٢٧)، [إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ( ١٠٦ )وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ( ١٠٧ )] (الأنبياء: ١٠٦-١٠٧) [ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ] (البلد:١٧)، [وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ( ١٣٥ )أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ( ١٣٦ ) ] (آل عمران: ١٣٥-١٣٦) [وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ( ١٣٥ )أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ( ١٣٦ )] (الزمر: ٥٣).

له ڕەوتی ناوەڕۆکی ئەو ئایەتانەی پێشتر باسمان کردن، دەردەکەوێ کە ئەم دوو ئایینە هەردووکیان لە بنەڕەتدا، یەك سەرچاوەیان هەیە، کۆڵەکە و ڕاگرەکانیان یەکانگیر دەبێتەوە و ئامانج و مەبەستەکان یەك دەگرنەوە، ئەو ئیسلامەی کە پەیامەکەی دەستی دەستکاریکردنی نەگەیوەتێ، وەك دوایین پەیامی ئاسمانی، لە کاتێکدا پەیامە ئاسمانییەکانی تری پێش خۆی دەستکاریکراون و گۆڕانکاری لە دەقەکانیاندا کراوە لەلایەن مرۆڤەکانەوە، بەڵام قورئان هەروەکو خۆی پارێزراوە لە ڕووی پێکهاتە و گونجاویی بەشەکانی بەوپەڕی تۆکمەییەوە، لە وردەکاریەکانی و پاکژییە ڕوونەکەی تێڕوانینی بۆ مرۆڤ و ژیان و گەردون، ئەمەش تایبەتمەندییەکی گرنگەو

پێویستە هیچ کەسێ بە خراپی نەزانێ و بە خراپیش لێی تێنەگات، بەڵکو پێویستە ئەمانە بکرێنە پاڵنەری هەموار و پەیوەندی باشی نێوان ئیسلام و گاورێتی و ئایینە ئاسمانییە هاوشێوەکانیان و پاشماوە ئایینییە ئاسمانییەکان، کە ببنە هۆی کەمەندکێش کردنی هەستی ڕێزگرتن لە یەکئامانجی و زانینی قەدری گۆڕەپانە هاوبەشەکەی نێوانیان و پەرەپێدانی هەستی لێبوردەیی و وتووێژی باش و تۆکمە کردنی هەستی بوێرانە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لێکخوێندن و دوژمنایەتیکردن، وە هەوڵی بەردەوام و هاوبەش بۆ بەیەکگەیشتنی یەکتری لەسەر ڕێی کاروانی خێر و خۆشی و ڕاستی و پوختەی مەبەست و نیازە پاکەکان.